# چۆن چێژ

## لە ژیان و کارەکەت دەبینیت



**نووسینی: دەیل کارنگی**

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئەبوبەکر شیوەڕەزی

ADIBAN

**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان نزیك ناوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوڕان.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

**ناونیشان:** چۆن چێژ لە ژیان و کارەکەت دەبینیت.

**نووسەر:** دەیل کارنگی.

**وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:** ئەبوبەکر شێوەڕەزی.

**بابەت:** گەشەپێدانی مرۆیی.

**هەڵەبڕی:** موحەممەد قارەمان.

**دیزاین:** ئەدیبان.

**پەخشانگە:** ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

**ساڵی چاپ:** 2019 میلادی.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی ( 2607 ) ساڵی ( 2019 ) پێی دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە، 

## ناوەڕۆک


**بەشی یەکەم حەوت ڕێگا بۆ بەختەوەری و تەبایی**

ڕێگای یەکەم: خۆت بدۆزەوە و خۆت بە، لە بیرت بێت لە سەرتاپای گۆی زەویدا هیچ کەسێکی دیکە هاوشێوەی تۆ نییە.

ڕێگای دووەم: چوار نەریتی باشی کارکردن کە یارمەتیت دەدەن بۆ دوورکەوتنەوە لە نیگەرانی و هیلاکی.

ڕێگای سێیەم: چ شتێک شەکەتت دەکات و، دەتوانیت چ شتێک دەربارەی بکەی.

ڕێگای چوارەم: چۆن هەستی بێزاری بەلاوە بنێین کە دەبێتە هۆی نانەوەی شەکەتی، نیگەرانی و جارسبوون.

ڕێگای پێنجەم: ئایا ئەوەی هەتە، بە یەک ملیۆن دۆلار دەیگۆڕییەوە.

ڕێگای شەشەم: لە بیرت بێت، هیچ کەسێک شەق لە سەگی تۆپیو هەڵنادات.

ڕێگای حەوتەم: ئەمە بکە و، ڕەخنە ئازارت پێ ناگەیەنێت.

**بەشی دووەم تەکنیکە سەرەکییەکانی لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتکردن**

تەکنیکی یەکەم: ئەگەر دەتەوێت هەنگوین کۆ بکەیەوە، شانەی هەنگەکە تێک مەدە

تەکنیکی دووەم: نهێنی گەورەی هەڵسوکەوتکردن دەگەڵ خەڵکیدا

تەکنیکی سێیەم: "هەر کەسێ بتوانێت ئەمە بکات هەموو جیهان لەگەڵ ئەوە ئەوەی ناتوانێت ئەمەیش بکات بە تەنیا ملی ڕێگا دەگرێتەبەر"

تەکنیکی چوارەم: ئەمە بکە و، لە هەموو لایەکەوە پێشوازیت لێ دەکرێت

تەکنیکی پێنجەم: چۆن وا دەکەی خەڵک دەستبەجێ تۆیان خۆش بوێت

**بەشی سێیەم ڕێگاکانی ڕاکێشانی خەڵک بەرەو ئەدای بیرکردنەوەی خۆت**

ڕێگای یەکەم: ڕێگایەکی دڵنیایی بۆ دروستکردنی نەیار و، چۆنیش خۆت لەو ڕێگایە بەدوور دەگریت

ڕێگای دووەم: ڕێگایەکی باش بەرەو تێفکرین

ڕێگای سێیەم: نهێنی سوکرات

ڕێگای چوارەم: چۆن گیانی هاوکاری بە دەست دەخەیت

ڕێگای پێنجەم: داوایەک کە هەموو لایەک حەزی لێیەتی

**بەشی چوارەم ڕێگاکانی گۆڕینی خەڵک، بەبێ ئەوەی سووکایەتیان پێ بکەی یاخود بەبێ ئەوەی هەستی بێزاریان لا گەڵاڵە بێت**

ڕێگای یەکەم: چۆن ڕەخنە دەگری، بەبێ ئەوەی بەرانبەرەکەت هەست بە ڕقوقین بکات

ڕێگای دووەم: سەرەتا، دەربارەی هەڵەکانی خۆت بدوێت

ڕێگای سێیەم: هیچ کەسێک، حەز ناکات فەرمانی بەسەردا بکرێت

ڕێگای چوارەم: لێی گەڕێ، شکۆی خۆی بپارێزێت

## پێشەکیی وەرگێڕ:

بە ناوی بەدیهێنەر، سوپاس بۆ خودا گیان، کە هێزی پێ بەخشیم بۆ بە کوردیکردنی ئەم کتێبە خنجیلانەیە، لەسەر داوای زۆر بەڕێز "ئارامی مەلا موحەممەد." لەم کتێبەدا، نووسەر باس لە چۆنیەتی چێژ بینین لە ژیان و کار دەکات. ئێمەی مرۆڤ، بۆ ئەوەی چێژ لەو کەشەدا وەربگرین کە زیندەگی تێدا دەکەین، دەبێت هەردەم هەر خۆمان بین و، خۆمان بدۆزینەوە لەم گەردوونە ڕەنگینەدا، چون هیچ تاکە مرۆڤێک لەسەر ئەم زەمینەدا بوونی نییە وەکوو ئێمە بێت و تەواو لە دیدگاو تێڕوانیندا لە شێوەی ئێمە بکات، هەر تاکێک لە ئێمە بوونێکە و هاوشێوەی نییە.

هەر یەکێکمان، بەدەم کارێکەوە سەرقاڵین، گرنگ نییە، کارەکە چییە و چ جۆرە ئیشێکە، ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە، کە ئێمە تا چەند هەوڵ دەدەین چێژ لەو کارە وەربگرین و جوانی و شۆخیی و شەنگی بەبەردا بکەین و خۆشمان بوویت. وەلێ، ئەگەر کارەکەمان زۆر تاڵ و تفت و مایەی نیگەرانی بێت بۆ ئێمە، نابێت بێهیوا بین و دەستی لێ بشۆین، بەڵکو بەو پەڕی دلێرییەوە دەبێت خۆشمان بوێت و باوەشی بەڕوودا بکەینەوە و، پۆشاکی جوانی و بەختەوەری و چێژبینینی بە بەردا بکەین و خۆمان لە نیگەرانی و هیلاکی بەدوربگرین.

ئەگەر هەر ڕۆژێک، هەستمان بە هیلاکی و شەکەتی کرد، دەبێت بەدوای چارەسەردا بۆ تیمارکردنی ئەم زامە وێڵ بین. ئێ، خۆ ژیانیش هەر پاڵدانەوە و شادی نییە، ئەگەر ئێمەی مرۆڤ ڕووبەڕووی کۆسپ و تەگەرە نەبینەوە نە فێری ئەزموون دەبین، نەفێری ژیانکردن. خودا، زۆر نیعمەتی بەسەر ئێمەدا باراندووە، کە

هەردەم دەبێت بۆیان سوپاسگوزار بین و دەستمان لە نزا بێت. زۆر جاریش ڕەخنە و لۆمەی بێبەری نەزۆکی خەڵک هاوشێوەی باران بەسەرماندا دەبارێت، دەبێت هەمیشە خۆمان ڕابهێنین کە چۆن خۆمان لە لێشاوی نەگریسی ئەو ڕەخنە بێشومارانە لا بدەین کە لەلایەن خەڵکی چاوتێبڕ ئیرەیی بەرەو ئاراستەمان دەکرێن. دەبێت تەواو بڕوامان بە ئەوە هەبێت، کە هەتا زیاتر لە لووتکەی سەرکەوتن نزیک بینەوە زیاتر بەردمان تێ دەگیرێت و ئازارمان دەدرێت.

لەلایەکی دیکەوە، خۆشڕووی، گفتجوانی و ئەفکاربەرزی، وا لە مرۆڤ دەکات بە قووڵایی ناخی هەموو مۆڤێکدا شۆڕ بێتەوە و لە دیوەخانی دڵتدا پێشوازییەکی گەرمی لێ بکرێت. هەمیشە دەبێت لە سوپاس و پێزانیندا ئەو پەڕی ڕاستگۆیی بنوێنین و، دڵسۆزانە بە کردنی ئەم کارە هەڵبستین. وا لە کەسی بەرانبەر بکەین، کە خۆی ویست و ئارەزووی کردنی کار و ئەرکەکانی هەبێت. زۆر ئارەزوومەندی خەڵک بین و، گرنگی و بایەخیان پێ بدەین. بە جۆرێک ڕەفتاریان لەگەڵدا بنوێنین کە هەست بە گرنگیی و بوونی خۆیان بکەن.

ئێمەی مرۆڤ، هەموو کاتێک دەبێت، ڕێز لە دیدگا و تێڕوانینی کەسانی دیکە بگرین و، بە هەند وەریانبگرین، لە هەر بارودۆخ و حاڵەتێکدا، ئەگەر هەر هەڵە و کەموکوڕییەکمان لە کەسی بەرانبەردا بەدی کرد، دەبێت بە شێوەیەکی هاوڕێیانە و دۆستانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەین و، سەرەتا دەبێت دەربارەی کەموکوڕی و ناتەواوییەکانی خۆمان بدوێین پاشان بە هێوری و دۆستانە پێی بخەینە بەر هی ئەو و، ڕاستی بکەینەوە. بە جۆرێک ڕەفتار بنوێنین کە هەردەم بەرەو وشەی "بەڵێ" پەلێکشی بکەین.

دەبێت، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئاماژە بە کەموکوڕییەکانی دەوروبەرمان بکەین و، هەرگیز قسەڕەق و دڵبەرد و بیربۆگەن نەبین، هەموو کات، لە ڕێگەی پرسیارەوە بچینە ناو باس و خواسەوە، نەک

سەرەتا دەستمان بۆ برینەکان درێژ بکەین و دواتر نەزانین بە چ دەرمانێک سارێژی بکەین. هەروەها، هەرگیز کەسانێک فەرماندەر و ئەمرکەر نەبین و، لە ڕێگەی پرسیارەوە داخوازیەکانمان بە دەوربەر بگەیەنین، چونکە ئەگەر بمانەوێت هەموو کەسێک لەگەڵمان بێت و بچینە ناخی هەموو کەسێکەوە، دەبێت لە دڵی ئەو کەسەدا لە دیدگا و، قسە و، بیر و بۆچوونەکانی خۆمان بنوارین.

## پێشەکی:

ئایا هەرگیز تا ئێستا بیت لەوە کردووەتەوە، کە ئێمە زۆربەی کاتمان لە کارکردندا بەسەر دەبەین، جا ئەو کارە هەر چییەک بێت؟

ئەمەیش بە مانای ئەوە دێت، دید و تێڕوانینی ئێمە بۆ کارەکەمان، ئەوەمان بۆ دیاری دەکات کە ئاخۆ ڕۆژەکانی کارکردنمان پڕبوون لە خۆشی و شادی یان بە پێچەوانەوە، هەست بەبێ ئومێدی و، بێزاری و هیلاکی دەکەین.

ڕاهێنانەکانی ***دەیل کارنگی***، بە جۆرێک بەرنامە ڕێژکراون، کە یارمەتیت دەدەن بۆ ئەوەی زۆرترین سوود لە ڕۆژانی کارکردنت فەراهەم بکەی بەوەی کە بە درێژایی ڕۆژگار تۆی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە.

هەر کە ئەم پەڕانە دەخوێنییەوە، دیدگا و شێوازێکت لە تێگەشتین بەرانبەر بە ژیان و خەڵک بۆ دروست دەبێت. لەدوای ئەمە، دەست بکە بە پێکەوەنانی هێز و توانای خۆت و، بزانە ئاخۆ بەهرە و توانات تێدایە، کە سەردەمانێکە هەر درکیشت پێیان نەکردووە، دەبێت چەندێک خۆشحاڵ بیت، لە بەرانبەر بەکارهێنانی ئەو توانا و بەهرە شاردراوانەتەوە.

ئەم کتێبە، بریتییە لە کۆکراوەی چەند بەشێکی هەر دوو کتێبی پاکنووسکراوی پڕفرۆشی، ***دەیل کارنگی*** لەژێر ناوەکانی "چۆن هاوڕێ پەیدا دەکەیت و کاریگەری لەسەر خەڵک دادەنێیت،" "واز لە دوودڵی بهێنە و دەست بە ژیان بکە." لەم دوو کتێبەدا ئەو بابەتانەمان هەڵبژاردوون کە پەیوەندیدارن بە خەڵکی وەکوو تۆ.

دەتەوێت، ئارەزووەکانت لە ژیاندا بێنەدی، هەست بە سازان و مەبەست بکەی، هەستێک کە تێیدا زۆرترین سوود لە هێز و توانا

شـاراوەکانت وەربگـری – ئەم کتێـبە، یارمەتیـدەرت دەبێـت لەپێنـاو بەدەستخستنی ئەو ئامانجانەدا.

خوێنـدنەوەی ئەم کتێـبە، وەکـوو سەرکەشـییەک وایە، لە بەرانـبەر دۆزینەوەی خوددا، دەکرێت ئەمە خـاڵێکی وەچەرخـان بێت لە ژیانتدا، تـۆ توانـا و هێـزی شـاراوەت تێـدا هەیە، کە دەتوانێـت ژیانـت سەرسـوورهێنەر و خـۆش بکـات. ئەوەی ئێسـتا لەسـەر شـانی تـۆیە ئەوەیە، پەردە لەسـەر ئەو هێـز و وزە شـاردراوانە هەڵبـدەیەوە و بەکاریان بهێنیت.

***دۆرۆسی کارنگی***

**سەرۆکی، پەیمانگای دەیل کارنگی و هاوڕێکانی**

# بەشی یەکەم

## حەوت ڕێگا بۆ بەختەوەری و تەبایی

***دەیل کارنگی*** کتێبی "واز لە دوودڵی بهێنە و دەست بە ژیان بکە"ی نووسیووە، تا نیشانمان بدات، کە ژیان ئەوەیە خۆمان دروستی دەکەین. ئەگەر سەرەتا فێری ئەوە بووین، کە چۆن خۆمان قبول بێت و، شتە ئەرێنییەکان بە ئەندازەی شتە نەرێنییەکان ببنین، ئینجا خۆمان سەرقاڵی کردنی ئەو شتانە بکەین، کە بە ئامانجەکانمان دەگەیەنن، ئەوا ئارەزوو و پێویستیمان، بۆ کات کوشتن و وزە بە فیرۆدان لە کەناری نیگەرانیدا خامۆش دەبێت.

## ڕێگای یەکەم:

## خۆت بدۆزەوە و خۆت بە، لە بیرت بێت لەسەرتاپای گۆی زەوی، هیچ کەسێکی دیکە هاوشێوەی تۆ نییە

نامەیەکم لەلایەن خاتوو *ئێدیس ئۆلرید*، لە ماونت ئاری، باکوری کارۆلینا پێگەیشت، کە لە نامەکەییدا دەڵێت: "لە تەمەنەی منداڵیمدا، کەسێکی زۆر هەستیار و شەرمن بووم، کێشم زۆر بوو، کوڵمەکانیشم وایان لێ کردبووم، کە قەڵەوتر لە ئاستی خۆم بەدیار بکەوم، دایکیشم ئافرەتێکی کۆنەپەرست بوو، لەو باوەڕەدا بوو، کە گەمژەییە ئەگەر کارێک بکەی جلوبەرگەکانت بە شێوەیەکی جوان بەدیار بکەون. هەمیشە دەیگوت: "پۆشاکی فراوان مایەی لەبەرکردنە و دەمێنێتەوە، کەچی جلوبەرگی تەسک و تروسک دەدڕێت،" لەبەر ئەوە بەپێی ئەو تێڕوانینە منی پۆشتە دەکرد.

هەرگیز نەدەچوومە هیچ ئاهەنگێک، هیچ کاتم بە خۆشی و شادی بەسەر نەدەبرد، کاتێکیش چوومە قوتابخانە، هەرگیز پەیوەندییم بە منداڵەکانی دیکەوە نەدەکرد، لە چالاکییەکانی دەرەوەی قوتابخانە یان تەنانەت لە وەرزشیشدا هەر وا بووم، کەسێکی لە ڕادەبەدەر شەرمن بووم، بەجۆرێک هەستم دەکرد کە لە هەموو کەسێکی دیکە، جیاوازم و ئەوان حەز بەبوونی من ناکەن.

"کاتێک گەورەبووم، شووم بە پیاوێک کرد، کە بە چەندین ساڵ لە خۆم گەورەتر بوو، کەچی ئەو کاتەیش هەر لەو بەرگە شەرمنییەی خۆمدا نەهاتمە دەرەوە. ماڵە خەزوورانم، خانەوادەیەکی بەهێز و باوەڕ بە خۆ بوون، زۆر هەوڵمدا منیش هاوشێوەی ئەوان بم، بەڵام لە مەشیاندا هەر شکستم خوارد. هەر هەوڵێک، کە ئەوان دەیاندا، بۆ

ئەوەی من لەو قاڵبەی خۆم دەربکێشن، دەبوویە هۆی ئەوەی، من زیاتر لەو چوارچێوەیەدا بخولێمەوە.

ئیتر هەر بەجارێک بووم بە کەسێکی نیگەران و بێزار. خۆم لە هەموو هاورێکانم بە دوور دەگرت، بە جۆرێک حاڵم پەرێشان ببوو، کە تەنانەت بە زەنگی دەرگای ماڵیش تێک دەچووم! کەسێکی شکستخواردوو بووم. خۆم درکم بەم دۆخە کردبوو، لەوەیش زراوم چوو بوو، کە مێردەکەم بەمە بزانێت. لەبەر ئەوە، هەر کاتێک لەدەرەوە و لەناو خەڵکدا بووواین، هەوڵم دەدا بە کەسێکی شادمان بەدیار بکەوم و ڕۆڵی خۆم ببینم، خۆشم دەمزانی کە زیادەڕۆیی لە ڕەفتارەکانمدا دەکەم؛ لەدوای ئەمە، بۆ چەند ڕۆژێک دەکەوتمە جیهانی کلۆڵی و نیگەرانییەوە. دواجار، بە جۆرێک دڵتەنگ و خەفەتبار بووم، کە هیچ شتێکی باشم، لە درێژەدان بە بوونی خۆم، بە باش نەدەزانی، بە جۆرێک هەر بیرم لە خۆ کوشتن کردەوە.

چ شتێک ڕووی دا و، بوویە هۆی گۆڕینی ژیانی ئەم ئافرەتە چارەڕەشە؟

تەنیا لێدوانێک بوو!

خاتوو *ئۆلرید*، درێژەی بە قسەکانیدا؛ تەنیا لێدوانێک بوو! کە بوویە هۆی گۆڕینی تەواوی ژیانم. ڕۆژێکیان، خەسووم دەربارەی ئەوە قسەی دەکرد، کە چۆن منداڵەکانی پەروەردە کردووە، گوتی: "گرنگ نییە ئاخۆ چ شتێک دێتەبوون، هەردەم لەسەر ئەوە سوور بووم، کە منداڵەکانم خۆیان بن، هەروایش نیشان بدەن کە خۆیانن."

ئەو لێدوانە، کاری خۆی لە ناخی مندا کرد! لە ماوەیەکی کەمدا، درکم کرد و تێگەیشتم، کە من خۆم خستۆتە چاڵی نەگبەتی و نەهامەتییەوە بەوەی، کە هەوڵمداوە خۆم بخەمە قاڵبێکەوە کە لە ڕاستیدا پڕ بە پێستی من نییە.

"له شـەو و، ڕۆژێکدا گۆڕام! دەستم بە بوون بە خـودی خـۆم کـرد، هەوڵـم دا لە کەسـایەتی خـودی خـۆم ورد بـبمەوە، هەوڵـم دا خـۆم بـدۆزمەوە. لە خـاڵە بەهێزەکـانم ورد بـوومەوە. هەمـوو شـتێک دەربارەی ڕەنگەکان و ستایل و شێوازەکان فێر بووم و بە جۆرێک خـۆمم پۆشـتە دەکـرد کە وا هەسـتم دەکـرد بـۆنی بـوون بە خـودی خۆمی لێ دێت.

ئیتر، سـەرم وەدەرنـا بـۆ ئەوەی هـاوڕێ پەیـدا بکەم، پەیوەنـدییم بە دامەزراوێکەوە کرد -لە سەرەتادا دانەیەکی بچووک بوو- هەستم بە تـرس و لەرز کـرد کاتێـک منیـان خسـتە نـاو بەرنـامەوە، بەڵام هەر جارێـک قسـەم دەکـرد، پەیتـا پەیتـا دلێـری و بـوێری دایـدەگرتم. مـاوەیەکی زۆری بـرد، بەڵام ئێسـتا زۆر لەوە بە ختەوەرتـرم کە ڕۆژگارێ خەونم پێیەوە دەبینی.

لە میـانەی پەروەردەکردنـی منـداڵەکانی خۆمـدا، هەمیشـە ئەو وانەیەم فێردەکردن، کە خۆم لە ئەزموونێکی تاڵەوە فێری ببووم، "گرنگ نییە چ شتێک ڕوو دەدات و دێتەبوون، تۆ هەر خۆت بە!"

مەلەسـەی ئـارەزووکردن، بـۆ ئەوەی هەر خـۆت بیـت هەر وەکـوو، دکتۆر ***جەیمز گۆردن گیلکی*** دەڵێت: "بە ئەندازەی کۆنی مێژوو ژیانی مرۆڤ، کۆنە." مەسـەلەی بوون بە خۆت هۆکاری شـارەوەی هەمـوو پەشێوییە دەماریی و نەخۆشییە دەروونی و ئاڵۆزییەکانە.

***ئەنجیلـۆ پـاتری***، سـیانزە کتێـب و هەزاران گوتـاری ڕۆژنـامەوانی نووسیووە، لەژێر ناونیشـانی "پەروەردەکردنـی منداڵ" دەڵێت: "هـیچ چارە ڕەشـی بـوونی نییە، لەو کەسـە بەدبەختر بێت، کە هەوڵ بـدات ببێت بە کەسێک یان شتێک کە جیاواز تربێت لە خودی خۆی جا چ لە ڕووی جەستە یاخود لە ڕووی ئەقڵەوە بێت."

حەزی بـوون بە کەسـێکی دیـکە، بە تـایبەتی لە هۆلیـوودا شـتێکی ئاسـاییە، *سـام وود*، یەکـێکە لە باشـترین دەرهێنەرەکـانی هۆلیـوود، گەورەترین سەر ئێشەیەک، کە لە ئیلهام بەخشین بە ئەکتەرە لاوەکان دووچـاری دەبـوومەوە بە دیـاریکراوی ئەم کێشـەیە بـوو: "کە ئەوانە خـودی خۆیـان بـن و، هەر بەو شـێوەیە نوانـدن بـکەن، کە هەن." هەموویان دەیانویست ببن بە *لانە تێرنەرزی* پلەدوو یاخود *کلارک گـابلی* پلەسـێ. هەروەهـا دەیگـوت: "جەمـاوەر تـامی ئەو جـۆرە نواندنانەی کردووە و، ئێستا چاوەڕێی شتی جیاواز دەکەن."

بەرلەوەی *سـام*، دەسـت بە دەرهێنـانی فیلمەکـانی، "مالئـاوا، بەڕێـز چیپس" و "بۆکێ زەنگەکە لێدرا" چەندین سـالی تەمەنی کاری لەسـەر بەرەو پێشبردنی کەسـایەتییەکان بەسـەر برد، ئەوەیشـمان بۆ بەیـان دەکات، کە هەمان ئەو بنەمایەی، کە لە جیهانی بازرگانیدا ڕوو دەدات ئەوا لە جیهـانی فیلمەکانیشـدا بەدی دەکرێـت، لەبەر ئەوە تـۆ نـاتوانی ڕۆلی مەیموون بگێڕی یاخود ببی بە تووتی.

*سام وود* دەلێت: "ئەزموون ئەمەی فێری مـن کردووە، دەستبەرداری هەمـوو ئەو کەسـانە بـم، کە هەول دەدەن بە شـێوەیەکی جیـاواز لە خودی خۆیان نمایش بکەن و هەلسوکەوت بنوێنن."

لە *پـۆل بۆینتـۆن*، بەڕێـوەبەری دامەزرانـدن لە کۆمپانیاکـانی نەوتـدا، پرسیارم کرد: "گەورەترین هەلە چییە، کە خەلک دەیکات لەبەرانبەر داواکردنیـان بـۆ کـار." *پـۆل*، دەبێـت وەلامـی ئەم پرسـیارە بزانێـت، چـاوپێکەوتنی لەگەل زیـاتر لە شـەش هەزار کەس کـردووە، بگـرە کتێبێکیشـی نووسـیووە لەژێر ناونیشـانی "شـەش ڕێگـا بـۆ بەدەسـت خستنی کار."

لە وەلامـی پرسـیارەکەی منـدا گـوتی: "گەورەتـرین هەلە، کە خەلـک دەیکات لەبەرانبەر داواکردنیان بۆ کار، ئەوەیە کە، ئەو کەسانە خۆیان نین، لە جیاتی ئەوەی دەربارەی خـودی خۆیـان بدوێن و بەڕاشـکاوانە

قسە بکەن، زۆربەی جار پەنا دەبەنە بەر ئەو وەڵامانەی، کە پێیان وایە تۆ لێیانت دەوێن، بەڵام ئەمە هیچ سوودێکی نییە، چوون کەس مرۆڤی قەڵبی ناوێت، هیچ کەسێک دراوی ساختەی ناوێت."

کچە شۆفێرێک، لەدوای چەشتنی ئەزموونێکی تاڵ وانەیەک فێر بوو. ئەم کیژە، حەزی دەکرد ببێت بە گۆرانی بێژ، بەڵام ڕووخساری ببویە مایەی بەدبەختی بۆی، دەمێکی گەورەی هەبوو و ددانەکانی پێشەوەی بەرزبـووون و دەرکەوتبـووون. کاتێـک بـۆ یەکەم جـار لەبەردەم جەماوەردا گۆرانی گوت -لە یانەی شەوانەی شاری نیو جێرسی- هەوڵـی دا بـۆ ئەوەی لێـوی سـەرەوەی بەسـەر ددانەکانیـدا بهێنێتە خـوارەوە بـۆ ئەوەی ددانەکـانی بەدەرنەکەون، هەوڵـی دەدا بە شێوەیەکی جوان بەدەربکەوێت، ئێ ئەنجامی ئەمە چی بوو؟ خۆی وەکوو کەسێکی هیچوپووچ بەرجەستە کرد و، هەر خەریـک بـوو بەرەو شکست ملی ڕێگا بگرێتەبەر.

لەگەڵ ئەوەیشدا، لەو شەوەدا پیاوێک لە یانەکە بوو، کە گوێ بیستی ئەو کچە بوو، وا گۆرانی دەڵێت، پێی وا بوو کە بەهرەیەک لە کچەدا هەیە. پیاوەکە بە ڕاشکاوانە گـوتی: "سـەیری نوانـدنەکەتم دەکـرد، دەزانـم تـۆ هەوڵـی چیـت دەدا، بـۆ ئەوەی بیشـاریەوە، تـۆ شـەرم لە دەرکەوتنی ددانەکانت دەکەی!"

کچەکە شـەرم گرتی، بەڵام پیاوەکە درێژەی بە قسەکانیدا، "ئێ چی لەمەدا هەیە؟ ئایا هیچ تاوانێک لە هەبوونی ئەو ددانانەدا بوونی هەیە؟ هەوڵی شاردنەوەی ددانەکانت مەدە! دەمت بکەوە، بەمەیش جەماوەر، تـۆی خـۆش دەوێـت بەوەی هەسـت بە شـەرمنی ناکەیـت." پیـاوەکە زیرەکـانە گـوتی: "سـەرباری ئەمەیـش، ئەو ددانـانەی کە تـۆ هەوڵـی شاردنەوەیان دەدەی دەکرێت بە ختت بە ڕوودا وەڵا بکەن!"

***کاس دەیلی***، ئامۆژگارییەکەی لە گوێ گرت و، ئیتر ددانەکانی لە بیر کرد، لەو کاتەوە، ئەو کـچە تەنیـا بیـری لە جەمـاوەرەکەی دەکـردەوە،

دەمـی کـردەوە و بە هەسـتێکی پـڕ لە چـالاکی و جـۆش‌وخرۆشـەوە گۆرانی دەگوت، هەر بەجۆرێک بوو بە ئەسـتێرە لە فیلمەکان و ڕادیۆ، بگرە ئەکتەرە کۆمیدییەکان هەوڵی لاساییی کردنەوەیان دەدا.

***ولیەم جەیمسی*** بەناوبانـگ، دەربـارەی ئەو کەسـانە دەدوا، کە هەرگیـز نەیان توانیووە خۆیان بدۆزنەوە، کاتێک ڕایگەیاند کە، کەسی ئاسـایی تەنیا پەرە بە سـەدا دەی توانـا شـاردراوەکانی دەدات، دەربـارەی ئەمە دەنووسـێت: "بە بەراورد بەوەی کە پێویسـتە ئێمە وا بین، ئێمە تەنیـا سوود لە بەشێکی بچووکی توانا و وزەکانی جەستەی و دەروونیمـان دەبینین،" ئەم پیاوە ئەوەمان بە ڕاشکاوانە بۆ بەیـان دەکـات، بەمەیـش تـاکە کەسـەکان لە کەشـێکی سـنووردار‌دا زینـدەگی دەکەن، خـاوەنی جۆرە هێزێکی هەمەچەشنن، کە عادەتەن شکسـت دەخۆن لە بەرانبەر بەکارهێنانیان.

ئەو جـۆرە توانایـانە، لە تـۆیش و منیشـدا بوونیـان هەیە، بەمەیـش بـا چرکەیەکی تەمەنمـان بە دوودڵـی و نیگەرانـی بەسـەر نەبەیـن بەوەی، کە ئێمە وەکـوو خەڵکـی دیکە نـین. تـۆ کەسـێکی نـوێی لەم جیهـانەدا، کەسـێکی هاوشـێوەی تـۆ هەرگیـز پێشـتر بـوونی نەبـووە، بگـرە لە سەرەتای ژیانەوە، هـیچ کەسێک هاوشێوەی تۆ بوونی نەبووە و، بە درێژایی چەرخەکانیش کەسێکی هاوشێوەی تۆ بوونی نابێت.

زانستی بۆماوەیی، ئاگادارمان دەکاتەوە، کە تۆ لە ئەنجـامی یەکگرتنی بیسـت‌وسـێ کرۆمۆسـۆنی باوکـت دەگەڵ بیسـت‌وسـێ کرۆمۆسـۆنی دایکـت پێـک هاتوویـت. ئەم بیسـت‌وسـێیەیش کرۆمۆسـۆنە هەمـوو تایبەتمەنـدییەکانی بۆماوەییـت بـۆ دیـاری دەکەن. ***ئەمـرام شـاینفیلد*** دەڵێت: "لەنێوان سەدان جیندا تەنیا یەک جین دەتوانێت ژیانی مرۆڤ بگۆڕێت"بە ڕاستی ئێمە "بوونێکی ترسناک و جوانیین."

تەنـانەت لەدوای ئەوەی، دایـک و باوکـت بەیەک گەیشـتن و یەکتریـان بینی، لەنێوان سێ‌سەدبلیۆن هەلدا، تەنیا یەک هەل هەبوو، بۆ ئەوەی

تۆ لە دایک بیت! بە شێوەیەکی دیکە، ئەگەر تۆ سێبلیۆن خوشک و برات هەبووایە ئەوا هەموویان لە تۆ جیاواز دەبوون، ئایا ئەمە تەنیا گریمانەیەکە؟ نەخێـــر، بەڵکو ڕاستییەکی زانستییە. ئەگەر دەتەوێت زیـاتر دەربـارەی ئەمە بخـوێنیەوە ئەوا کتێبـی "تـۆ و بۆمـاوەزانی" ***ئەمران شاینفیلد*** بخوێنەوە.

بە بەباوەڕەوە، دەتـوانم دەربـارەی ئەم بـابەتە بدوێم، کە تـۆ دەبێـت خودی خۆت بیت، چونکە لە قووڵایی دڵمەوە هەستی پێ دەکەم، خۆم دەزانم دەربارەی چی دەدوێم، ئەمەیش لە ئەنجامی ئەزموونێکی پڕ تاڵ و ناخۆشەوە فێر بووم. بۆ ئەوەی قسەکانم زیاتر ڕوون بکەمەوە، کاتێک بۆ یەکەم جار، لە کێڵگەکانی گەنمەشامی لە میسۆری هاتمە نیو یۆرک، نـاوی خـۆم لە ناوەندێکی ئەکادیمی ئەمریکی بۆ هونەرەکانی شانۆ تۆمار کرد، حەزێکی زۆرم هەبوو، بۆ ئەوەی ببم بە ئەکتەر. لە دیـدگای خـۆمەوە پـێم وا بـوو، کە بیرۆکەیەکـی نـایەبە. لەو بـاوەڕەدا بووم، کە ئەوە ڕێگایەکی کورتە، بۆ گەشیتن بە مەنزڵگەی سەرکەوتن. بیرۆکەیەک زۆر سادە و ئاسـان بـوو، بە جۆرێک نەمدەتوانی تێبگەم، کە بۆچی سەدان کەسانی ناودار پێشتر درکیان بەوە نەکردووە.

ئیتر ئەمەبوو، کەوتمە لێکۆڵینەوە لە ئەکتەرە بەناوبانگەکانی سـەردەم، ***جۆن دریو، واڵتەر هامپدێن*** و ***ئۆتز سکینەر*** کە ئامـانجی خۆیـان پێ کاوە. دوایی منیش لاسای باشـترین خـاڵ و تایبەتمەندییەکانی ئەوانـم دەکردەوە و خۆم دەکرد بە ئەستێرەیەکی گەشاوە، بـوون بە کەسێکی سەرکەوتوو، کە هەموو خەسڵەتە باشەکانی ئەوانی لە خۆ گرتبێت.

چەنـدێک گەمژەبـووم! بیـرۆکەکەم چەنـدێک پڕوپـووچ بـوو! دەبـووایە چەنـدین سـاڵی ژیـانم بە لاسـایی کـردنەوەی خەڵکـانی دیـکە بەسـەر بەرم، لە کاتێکدا دەبێت خـۆم بدۆزمەوە و هەر خـۆم بـم، خـۆ ناکرێت ببم بە کەسێکی دیکە.

ئەم ئەزمـوونە ناخۆشـە، دەبـووایە وانەیەکـی ئەوتـۆم فێـر بکـات، کە هەرگیـز لە بیـرم نە چێتەوە، بەڵام بەم شـێوەیەیش نەبـوو، ئەوە مـن نەبـووم، بگـرە کەسـێکی گەمـژە بـووم، پێویسـتی بە وانەیەکـی دیـکە دەکرد بۆ ئەوەی لێیەوە فێر بم.

لەدوای چەند ساڵێکی دیکە، خۆم تەرخان کرد، بۆ ئەوەی دەست بکەم بە نووسینی کتێبێک، کە تا ئێستا نەنووسرا بێت لەبارەی وتاردان بۆ بازرگانەکـان. هەمـان بیـرۆکە پڕوپـووچەکەم هەبـوو دەربـارەی نووسـینی ئەم کتێبە، کە پێشـتر دەربارەی نواندن هەم بوو. نیازم وا بـوو کە کۆمەڵێـک بیـرۆکەی نووسـەری دیـکە کـۆ بـکەمەوە و، لە چوارچێوەی کتێبێکدا کۆیـان بـکەمەوە، کتێبێـک کە هەمـوو شـتێک لە خۆی دەگرێت.

دەستم کـرد، بە کـۆکردنەوەی کتێبگەلێکی زۆر دەربـارەی وتـاردان و سـاڵێکی ڕەبەقـم بەسـەر بـرد لەبەرانـبەر داتاشـینی ئەو بیرۆکـانە و، دووبارە بە قسە و تێڕوانینی خۆم دایان بڕێژمەوە. کەچی دواتر، بۆم دەرکەوت، کە زۆر گەمـژانە ڕەفتـار دەنـوێنم. چـونکە ئەو تـێکەڵ و پێکەڵی نووسەرەکانی دیکە، کە من لای خـۆم نووسـیبوونم زۆر ئـاڵۆز بـوون، بە جۆرێـک دەبەنـگ بـوون کە هەریەک تـاکە بازرگـان ئەو کتێبەی منی نەدەخوێندەوە، بەمەیش کاری سـاڵێکم فڕێدایە ناو زبڵدانی مێژووەوە و، دووبارە لە سەرەتاوە دەستم پێ کردەوە.

ئەم جارەیان بە خۆمم گوت: "تۆ دەبێت ***دەیل کارنگی*** بیت، بە تەواوی هەڵە و کەموکـوڕی و توانـا سـنووردارییەکانییەوە، خـۆ هەر وا بە شێوەیەکی ئاسایی نـاتوانی ببی بە کەسـێکی دیکە." بەمەیش دەسـتم هەڵگـرت لەوەی تـێکەڵە و پـێکەڵەیەک بـم، لە تێـڕوانین و دیـدگەی کەسـانی دیـکە و، قـۆڵم هەڵمـاڵی و ئەوەم کـرد، کە هەر دەبـووایە لە سـەرەتاوە کردبـام، بەپێـی ئەزموون و تێبینییەکـان و بـاوەڕی خـۆم، کتێبێکم لەسەر وتاردان نووسی وەکوو قسەکەر و مامۆستایەک.

فێری ئەوە بووم -بۆ هەموو کاتێک، خوازیارم- کە بەڕێز *والتەر ڕالی* فێری بوو "من لێرەدا دەربارەی بەڕێز *والتەر ڕالی* نادوێم کە چاکەتەکەی خۆی فڕێدایە ناو قوڕ بۆ شاژن بۆ ئەوەی هەنگاوی بەسەردا بنێت، بەڵکو من دەربارەی ئەو بەڕێز *والتەر ڕالی*یە دەدوێم کە پرۆفیسۆری ئەدەبی ئینگلزی بوو، لە زانکۆی ئۆکسفۆر لە ساڵی ١٩٠٤،" ئەم پرۆفیسۆرە دەڵێت: "ناتوانم کتێبێک بنووسم کە شان لە شانی کتێبەکانی *ولیەم شیکسپیر* بدات، بەڵام دەتوانم کتێبێک بنووسم کە پڕ بە پێنوس و پەنجەی خۆم بێت."

خۆت بە، کار لەسەر ئەو ئامۆژگارییە بکە، کە *ئیرڤینگ بێرلین* دای بە *جۆرج گێرشوین*ـی کۆچ کردوو، کاتێک *بێرلین* و *گێرشوین* بۆ یەکەمین جار، یەکتریان بینی، *بێرلین* کەسێکی بەناوبانگ بوو، بەڵام *گێرشوین*ـیش جگە لە ئاواز دانەرێکی لاو هیچی دیکە نەبوو کە هەفتانە بڕی سیوپێنج دۆلای لە "تن پان ئاڵی" بەدەست دەکەوت. *بێرلین*، تواناکانی *گێرشوین*ـی چووە دڵەوە، بەمەیش کاری بوون بە سکتێری مۆسیقای پێدا، کە موچەکەی سێ ئەوەندە زیاتر بوو لە ئەوەی خۆی، *بێرلین* ئامۆژگاری کرد، "ئەو کارە مەکە، خۆ ئەگەر دەیکەی، ئەوا تۆ دەبیت بە *بێرلین*ـی دووەم، خۆ ئەگەر سوور بیت لەسەر بوون بە خۆت، ئەوا ڕۆژێک دەبیت بە *گێرشوین*ـی پلەیەک."

*گێرشوین*، وەکوو گوارەیەک ئەم ئامۆژگارییەی لە گوێ کرد و، بە تێپەڕبوونی کات بوو بە یەکێک لە ئاوازدانەرەکانی ئەمریکا لە سەردەمی خۆیدا.

*چارلی چاپلن، ول ڕۆجەرز، ماری مارگاریت مکبرایدا* و *جین ئاسەری*، ملیۆنان کەسی دیکە، دەبووایە ئەم وانەیە فێر بووبان، دەبووایە ئەوانیش هاوشێوەی من بە ڕێگایەکی تاڵ و ناخۆش فێری ئەم وانەی ژیان بووبان.

کاتیک، ***چارلی چاپلن***، بۆ یەکەم جار دەستی بە دەرهێنانی فیلم کرد، دەرهێنەرەکەی سوور بوو لەسەر ئەوەی، کە ***چارلی*** دەبێت لاسای ئەکتەرێکی بەناوبانگی ئەوکاتەی ئەڵمانی بکاتەوە، بەڵام ***چارلی*** هیچ هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە نەنا هەتا خۆی بە شێوە و شێوازی خۆی نواندی نەکرد.

***بۆب هۆپ***، ئەویش ئەزموونێکی هەمان شێوەیەی هەبوو، چەندین ساڵی لە نواندن و گۆرانی گوتندا بەسەر برد و نەیتوانی بە هیچ شتێک بکات، تا ئەو کاتەی بڕیاریدا کە خۆی بێت. ***ویلەم ڕۆجەرز***، کاتێک بۆ ماوەی چەندین ساڵ پەتی دەخولاندەوە لە بەزمگە، بە هیچ شوێنێک نە گەیشت، هەتا درکی بە دیارییە بێهاوتاکەی گاڵتەکردن کرد و دەستی بە قسەکردن کرد لە کاتی خولاندنەوەی پەتکەدا.

کاتێک، ***ماری ماگارێت مکبرایدا***، بۆ یەکەم جار دەستی بە کاری نواندن کرد، هەوڵی دا بۆ ئەوەی ببێت بە ئەکتەرێکی کۆمیدی ئێرلەندی بەڵام تێیدا سەرکەوتوو نەبوو و، شکستی خوارد، وەلێ کاتێک هەوڵی دا خۆی بێت و، وەکوو خۆی نمایش بکات –کچێکی دەشتەکی میسۆری– بوو بە یەکێک لە ئەستێرە ناودارەکانی ڕادیۆ لە نیۆرک.

کاتێک ***جێنی ئاسەری***، ویستی خۆی لە شێوەزاری تەکساس ڕزگار بکات و، وەکوو کوڕێکی شاری خۆی پۆشتە کرد و، گوتی کە ئەو خەڵکی شاری نیو یۆرکە، خەڵک لە پاشەملە، تەنیا بە دەمیەوە پێ دەکەنین، بەڵام کاتێک دەستی بە ژەنینی بانجۆکەی کرد و، وەکوو گاوانێک دەستی بە گوتنی هەڵبەستی ئەفسانەی کرد، پێی نایە ناو پیشەیەکەوە، کە بوو بەناوبانگترین کەس چ لە ڕووی وێنە و چ لە ڕووی دەنگەوە.

تۆ، کەسێکی نوێیت لەم جیهانەدا، پێی خۆشحاڵ بە، زۆرترین سوود لەوە ببینە کە سروشت پێی داویت. بە کورتی، هەموو هونەرێک

شتێکی خودییە، تەنیا لە دیدگای خۆتەوە گۆرانی دەڵێیت و، ئەو وێنەیە بکێشە، کە خۆت دەتەوێت. تۆ دەبێت ئەوە بیت کە ئەزموونەکانت و، ژینگە و بۆماوەی لە تۆیان دەوێت، بۆ باشتر بوون یان خراپتربوون. تۆ، خۆت دەبێت باخە بچووکەکەت بەدەستی خۆت بچێنیت، بۆ ئەوەی باشتر یان خراپتر بێت، هەر خۆت دەبێت ئامێرە بچووکەکەت بژەنیت لە ئۆکسترای ژیاندا.

هەروەکوو *ئیمێرسن*، لە گوتارەکەیدا گوتوویەتی، "پشت بەخود بەستن،" "لە ژیانی رۆشن بینی مۆڤدا، ماوەیەک بوونی هەیە، کە تێیدا پێ دەنێتە ئەو باوەڕەی، کە چاوتێبڕین ئەوپەڕی نەزانی و گەمژەییە و، لاسایی کردنەوەیش خۆکوشتنە. دەبێت ئەو کەسە خۆی بێت کە خۆی بەرەو ئاراستەیەکی باشتر یان خراپتر بکات. بەجۆرێک، کە گەردوون پڕە لە شتی باش، ناتوانیت زیاتر لەو بەرهەمە بەدەست بهێنێت کە لەباغەکەی خۆیدا بە دەستی دەکەوێت. ئەو هێز و توانا شاراوەیەی، کە لە ئەودا بوونی هەیە، شتێکی نوێیە لە سروشتدا، هیچ کەسێک جگە لە ئەو نازانێت، کە چی دەکات و چی نازانێت، هەتا ئەو کاتەی هەوڵی تاقیکردنەوەی نەدات."

ئەمە ئەو شێوەیەیە، کە *ئیمێرسن* گوتوویەتی، بەڵام ئەم ڕێگایەیش بوونی هەیە کە شاعیری کۆچکردوو، *دۆگلاس مالۆچ*، ئەم هۆنراوەی خوارەوەی هۆنیوەتەوە:

ئەگەر ناتوانی ببی بە دارێک بەسەر لووتکەی گردێکەوە،

دەوەنێک بە لەناو شیوێکدا

باشترین دەوەنی نزیک سەرچاوەکە بە

دەوەنێک بە، ئەگەر نەیشت توانی دەوەنێک بیت،

گژوو گیا بە،

ڕێگا بڕازێنەوە.

هەمووومان بۆمان ڕێک ناوکەوێت کاپتن بین، دەبێت دەریاوان بین،

هەر کامێک لە ئێمە، کارێکی هەیە،

کارێکی گەورە و کارێکی بچووک بوونی هەیە،

ئەوکارانە دەبیت بکرێن.

ئەگەر ناتوانیت شارێیەک بیت، ئەوا تولە ڕێیەک بە.

ئەگەر ناتوانی ببیت بە خۆر، ببە بە ئەستێرە،

چونکە قەبارە یارمەتیدەر نابێت لە سەرکەوتن و شکستدا،

لەبەر ئەوە باشترین شت بکە، لەو کەشەی کە ئێستا تێیدا هەی.

بـــۆ پەرەدان بە دیـــدگا و تیڕوانینـــی دەروونـــی، کە ئاشـــتی و سەربەستیمان بۆ فەراهەم دەهێنن، لە بیرت بێت.

**"هەوڵ مەدە لاسای خەڵک بکەیەوە**

**بەڵکو خۆت بدۆزەوە و هەر خۆت بە"**

## ڕێگای دووەم

## چوار نەریتی باشی کارکردن، کە یارمەتیت دەدەن بۆ دورکەوتنەوە لە نیگەرانی و هیلاکی.

### نەریتی یەکەم:

### مێزەکەت لە هەموو ئەو کاغەزانە پاک بکەوە، تەنیا ئەوانە نەبێت کە ئێستا کارت پێیان هەیە

*ڕۆلاند ئێل. ولیەمز* سەرۆکی هێڵی ئاسنی شیکاگۆ و باکوری ڕۆژهەلات، جارێکیان گوتی: "ئەو کەسەی، کە مێزەکەی پڕە لە کاغەز دەربارەی بابەتی هەمەچەشن ئەوا کارەکەی زۆر ئاسانتر دەبێت ئەگەر مێزەکەی پاک بکاتەوە، لە هەموو کاغەزەکان تەنیا ئەوانە نەبێت کە پەیوەندیدارن بە کێشەی بەردەست، من ئەمە ناو دەنێم بە ڕێکوپێکی ماڵ، یەکەمین هەنگاوە بۆ ڕێکردن بەرەو چووست و چالاکی و کارامەیی."

ئەگەر سەردانی کتێبخانەی کۆنگرێس بکەی، لە واشنتۆن دی سی، ئەوا پێنج وشەت بەرچاو دەکەون لە لە بانی سەقفەکەوە نووسراون، لە لایەن هۆزانڤان پۆپ:

"ڕێکوپێکی یەکەمین یاسای ئاسمانە."

ڕێکوپێکی، دەبێت یەکەمین یاسای کارکردنیش بێت، بەلام وایە؟ نەخێر، مێزی هەر کەسێک ببینی پڕە، لە کاغەزی کەڵەکە کردوو، کە بۆ ماوەی چەندین هەفتە بەکار نەهاتوون. لە ڕاستیدا، جارێکیان سەر نووسەری ڕۆژنامەی "نیو ئۆرلینز" پێی گوتم، کە سکتێرەکەی یەکێک

له مێزەکانی پاک کردووەتەوە و ئامێرێکی چاپی دەستی دۆزیەوەتەوە کە بۆ ماوەی دوو ساڵە بزر ببوو!

تەنیا دیمەنی مێزێک، کە پڕە لە نامەی وەڵامنەدراوە و، ڕاپۆرت و، یادەوەری، بەسە بۆنانەوەی پەشێویی و گرژی و نیگەرانی. زۆر لەمەیش خراپتر ئەوەیە، ئەو شتانە، یادخەرەوەیەکی بەردەوامن کە ملیۆنان شت بوونیان هەیە، بۆ ئەوەی هەستی بە کردنیان کەچی کاتی تەواوت لەبەردەستدا نییە بۆ ئەوەی ڕایان پەڕێنی ئەمەش هەر تەنیا نیگەرانی و، دووڵی و گرژی لێ ناکەوێتەوە، بەڵکو دەبێتە پاڵنەرێک بۆ بەرزی پەستانی خوێن و کێشەکانی دڵ و برینەکانی گەدە.

*دکتور جۆن، ئەیچ. ستۆوکسی* پرۆفیسۆر، دەرچووی بەشی پزیشکی لە زانکۆی پێنسیلڤانیا، کاغەزێکی لەبەردەم کۆنگرەی پزیشکی ئەمریکی خوێندەوە، لەژێر ناونیشانی "گرژیی فرمانی دەمارەکان وەکوو نەخۆشییەکی جەستەیی" لەو ڕاپۆرتەدا، دکتۆر *ستۆوکس*، یانزە هەلومەرجی لەژێر ناونیشانی "لە حاڵەتی نەخۆشی دەروونییدا دەبێت بەدوای چییدا بگەڕێیت." ئەمە یەکەمین دەقی ئەو لیستەیە:

هەستکردن بە ناچاری یان ئەرک شتێکی بێبنی ئەو شتانەیە، کە دەبێت جێبەجێ بکرێن بەڵام چۆن کردارێکی سادە و سەرەتایی، وەکوو پاکردنەوەی مێزەکەت و، بڕیاردان، یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی خۆت لە بەرزی ئاستی فشار و، هەستی ناچاری و، ڕاپەڕاندنی کارانێکی زۆر بەدوور بگریت، چۆن ئەمانە، هەروا بە شێوەیەکی سادە دەتوانرێت بکرێن؟

دکتور *ولیەم ئێل. سادلەر*، پزیشکی دەروونناسی بەناوبانگ، تەنیا بەم ئامۆژگاریە سادەیە، بە نەخۆشێکی گوت کە خۆی لە داڕووخان و نیگەرانی بەدوور بگرێت، ئەو کابرایە بەڕێوەبەری یەکێک لە کۆمپانیا گەورەکانی شیکاگۆ بوو، کاتێک هاتە نووسینگەکەی دکتۆر *سادلەر*،

کەسێکی گرژ و، ڕاڕا و، دوودڵ و نیگەران بوو، دەیزانی، کە وا بەرەو داڕووخان دەڕوات بەڵام نەیدەویست دەستبەرداری کارەکەی بێت و، بەمەیش پێویستی بە ئامۆژگاری بوو.

دکتۆر *سادلەر* دەڵێت: "لە کاتێکدا نەخۆشەکە چیرۆکەکەی بۆ دەگێڕامەوە، زەنگی تەلەفۆن لێیدا، لە نەخۆشخانەوە بوو، لە جیاتی ئەوەی مەسەلە دوابخەم، کاتم قۆستەوە بۆ ئەوەی بگەمە بڕیارێک. ئەگەر بکرێت، من هەردەم پرسیار دەکەم، هێندەی نەبرد تەلەفۆنەکە بۆ جاری دووەم لێیدایەوە، دیسان مەسەلەیەکی خێرا بوو، کە پێویستی بە من بوو، بۆ ئەوەی تاووتوێی بکەم. سێیەمین ناوبڕ ئەوە بوو، کە هاوپیشەیەکم هاتە نووسینگەکەم بۆ ئەوەی ئامۆژگاری بکەم دەربارەی نەخۆشێک، کە زۆر حاڵی پەرێشان بوو، کاتێک قسەکانم دەگەڵ ئەو تەواو بوون، ڕووم لە نەخۆشەکەم کردەوە و پۆزشم هێنایەوە بەوەی، کە بۆ ماوەیەک وا چاوەڕوانی منی کردووە، کەچی ئەو زۆر دڵخۆش بوو، ڕووخسارێکی تەواو جیاوازی هەبوو."

ئەم پیاوە بە دکتۆر *سادلەری* گوت: "دکتۆر، داوای لێبوردن مەکە! لەم دە خولەکەی کۆتاییەدا، پێم وایە هۆکاری نەخۆشییەکەی خۆمم تەواو بۆ دەرکەوتووە، دەگەڕێمەوە نووسینگەکەی خۆم و، پێداچوونەوەی نەریتەکانی خۆم لەبەرانبەر کارکردندا دەکەم، بەس بەرلەوەی بڕۆم، بەلاتەوە ئاساییە سەیرێکی مێزەکەت بکەم؟"

دکتۆر *سادلەر*، چەکمەجەکانی مێزەکەی بۆ دەکاتەوە، هەموویان خاڵی بوون – جگە لە هەندێک پێداویستی نەبێت، نەخۆشەکە گوتی: "پێم بڵێ، ئەی کارە تەواو نەکراوەکانت لە کوێ هەڵگرتووە؟"

*سادلەر* گوتی: "هەموویان تەواو بوون!"

"ئەی نامە وەڵامنەدراوەکانت لە کوێدا هەڵگرتووە؟"

***سادلەر*** پێی گوت: "هەموو نامەکان وەڵامدراونەوە، یاسای من وایە، کە هیچ نامەیەکی وەڵام نەدراوە هەڵناگرم، ڕاستەوخۆ وەڵامەکەی بە سکتێرەکەم دەسپێرم."

لەدوای شەش مانگ، هەمان ئەو پیاوە، دکتۆر ***سادلەری*** بانگهێشتی نووسینگەکەی خۆی کرد، تەواو گۆڕدرا بوو، مێزەکەیشی بە هەمان شێوە بوو. چەکمەجەکانی مێزەکەی کردەوە، بۆ ئەوەی نیشانی دکتۆری بدات، کە هیچ کارێکی تەواو نەکراویان تێدا نییە، شەش مانگ لەمەوبەر، ئەو کابرایە گوتی: "سێ مێزی جیاوازم هەبوون لە دوو نوسینگەی جیاوازدا، ئەو مێزانە کەوتبوونە بەر لێشاوی کارەکانم، کارانێک کە هەرگیز دەستم پێیان ڕانەگەیشتبوو بۆ ئەوەی تەواویان بکەم، لەدوای ئەوەی قسەم دەگەڵ تۆ کرد دکتۆر، ئیتر گەڕامەوە نووسینگەکەم و، تەواوی ئەو پەڕاوە کۆن و ڕاپۆرتانەم پاک کردەوە. ئێستایش، وا تەنیا کار لەسەر مێزێک دەکەم، شتەکان بەپێی پێویستیان دەخەمە سەر مێزەکە و چیایەک لە کاری تەواونەکراو لای خۆم کەڵالە ناکەم، کە ببێتە مایەی دوودڵی و نیگەرانی و گرژی من. سەرسووڕهێنەرترین شتیش ئەوەیە، کە من هەر بە تەواوی لە نەخۆشییەکەم چاک بوومەوە، چی دیکە باری تەندروستیم هیچ کێشەیەکی نییە!"

***چارلز ئیڤانس هەگس***، سەرۆکی پێشووتری دادگای باڵای ئەمریکا، گوتوویەتی: "مرۆڤەکان لەژێر کاری زۆردا نامرن، بەڵکو بە هۆی پەرتەوازەیی و دوودڵی و نیگەرانی دەمرن." بەڵێ، بەهۆی بەفیڕۆدانی هێز و وزەکان و نیگەرانی، هەرگیز بە جۆرێک بەدەرناکەون کە کارەکانیان تەواو بکەن.

## نەریتی دووەم

## بەپێی گرنگییان کارەکان ڕاپەڕێنە

***هێنری ئیل. دۆهێرت***ـی دامەزرێنەری کۆمپانیای "سیتیس سێرڤیس" دەڵێت بە چاوپۆشیکردن لەو بڕە موچەیەی، کە پێی دەدرێت، دوو جۆر توانا بوونیان هەیە، کە ئەستەمە بەدی بکرێن:

ئەو دوو توانایە پڕ بەهایەیش بریتیین لە: یەکەمیان، توانای بیرکردنەوە. دووەمیان، ڕاپەڕاندنی کارەکان بە گوێرەی گرنگی و بایەخیان.

***چارلز لوکمان***، ئەو لاوەی کە لە دارووخانەوە دەستی پێ کرد و لەدوای دوانزە ساڵ بوو بە سەرۆکی کۆمپانیای پێپسۆدێنت، لە ساڵێکدا بڕی سەدهەزار دۆلاری دەست دەکەوت، لەپای ئەوەیش یەکملیۆن دۆلاری پەیدا دەکرد، ئەو گەنجە دەڵێت کە هۆکاری سەرکەوتنی دەگەڕێنێتەوە سەر ئەدای پەرەپێدانی ئەو دوو توانایەی، کە ***هێنری ئیل. دۆهێرت***ـی بە شتێکی سەختی هەژمار کردوون بۆ ئەوەی درکیان پێ بکرێت.

***چارلز لوکمان*** دەڵێت: "ئەوەندەی لە بیرم دێت، بەیانیان کاتژمێر پێنج لە خەو هەڵدەستام، چونکە لەو باوەڕەدام، کە لەم کاتەدا دەتوانم باشتر بیر بکەمەوە، لە هەر کاتێکی دیکە، دەتوانم باشتر بیر بکەمەوە و پلانی ڕۆژەکەم دابڕێژم، پلان دابنێم بۆ ئەوەی شتەکان بەپێی پێویستیان جێبەجێ بکەم."

***فرانک بێتگەر***، یەکێک لە سەرکەوتووترین کەسایەتییەکانی بواری بیمەدان، تاوەکوو کاتژمێر چواری بەیانی چاوەڕێی نەدەکرد، بۆ ئەوەی پلانی ڕۆژەکەی دابنێت، ئەو کابرایە هەر لە شەودا پلانی

دادەڕشت –ئامانجێکی بۆ خۆی بەرجەستە دەکرد– ئامانجێک بۆ ئەوەی لەو ڕۆژەدا بڕێکی دیاریکراوی ئەشیا بفرۆشێت، هەتادوای.

لە ئەنجامی ئەزموونێکی دوورودرێژدا، ئەوەم بۆ دەرکەوتووە کە، هیچ کەسێک ناتوانێت هەردەم کارەکانی بەپێی گرنگیان بکات، بەڵام ئەوەیش دەزانم هەبوونی پلانێک بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان بە گوێرەی گرنگیان باشترە، لەوەی کە بەبێ پلان و خۆئامادەکردن هەستی بە کردنیان.

ئەگەر *جۆرج بێرناشۆ*، سەرەتا شتە گرنگەکانی بەپێی گرنگییان نە کردبایە، ئەوا دەشێت وەکوو نووسەرێک، ڕووبەڕووی شکست ببووایەوە و، وەکوو کاشێری بانک بە تەواوی ژیانی مابایەوە. پلانەکەی ئەوە بوو، کە بە درێژایی نۆ ساڵ، ڕۆژی پێنج پەڕ بنووسێت، وەلێ بە درێژایی ئەو ماوەیە تەنیا سێ دۆلاری داهاتەکەی بوو، نزیکەی هەر ڕۆژە و دینارێک. تەنانەت *ڕۆبنسن کرۆزۆ*، پلان و نەخشەی خۆی داناوە و، هەر کاتژمێرێکی ڕۆژ چی کردبێت هەستاوە بە نووسینی.

## نەریتی سێیەم

**کاتێ ڕووبەڕووی کێشەیەک دەبیەوە، هەر ئەو کاتە چارەسەری بکە، خۆ ئەگەر هۆکار و ڕاستی پێویستت لەبەردەستدا بوو بۆ ئەوەی بڕیار بدەیت، ئەوا هەر ئەو کاتە بڕیار بدە و دوای مەخە.**

یەکێک لە قوتابیەکانی پێشووم *ئێچ. پی. هاوێل*، ئەوەی پێ گوتم کاتێک، ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیای پۆلای ئەمریکی بوو، زۆربەی جار کۆبوونەوەکان بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشە ئاڵۆز بوون، چەندین کێشە تاووتوێ دەکران لە کاتێکدا چەند بڕیارێکی کەم دەهاتنەبوون.

ئەی ئەنجامی ئەوە چی بوو؟ هەر ئەندامێکی ئەو ئەنجومەنە دەبووایە کۆمەڵێک ڕاپۆرت دەگەڵ خۆی بەرێتەوە ماڵەوە، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکات.

لە کۆتاییدا، بەڕێز *هاوێل* قەناعەتی بە ئەنجومەنی بەڕێوەبەران کرد، بۆ ئەوەی هەر جارە و کێشەیەک بخەنە ژێر باری تاووتوێکردن و، هەر ئەو کاتە بڕیاریشی لەسەر بدەن، بەمەیش هیچ پشێوی و ئاڵۆزی و دواخستنێک بوونی نابێت. ئەو بڕیارەیش، خۆی لە چوارچێوەی ڕاستیدا بەرجەستە دەکات، دەکرێت کردنی شتێک یاخود نەکردنی شتێک بێت، بەڵام دەبێت بڕیار لەسەر هەر کێشەیەک بدرێت، بەر لەوەی بخرێتە ئەولاوە و پێ بخەنە سەر کێشەیەکی دیکە.

بەڕێز *هاوێل* پێی گوتم کە، ئەنجامی ئەوە زۆر بەسوود و نایاب بووە، ئیتر تۆماری داوایی پاک بوویەوە، خشتەکان سفر بوونەوە، چی دیکە پێویستی بەوە نەبوو، کە ئەندامانی ئەنجومەن کۆمەڵێک ڕاپۆرت بەرنەوە ماڵەوە، چی دیکە، هەستی نیگەرانی کێشەی چارەسەرنەکراو بوونی نەما و، کۆتایی پێ هات.

یاســایەکی باشــە، ئەمەیــش تەنیــا هەر بــۆ ئەنــدامانی ئەنجــومەنی کۆمپانیای پۆڵای ئەمریکی نییە بەڵکو بۆ تۆ و منیشە.

## نەریتی چوارەم:

## بزانە چۆن کارەکەت ڕێک دەخەی، بەڕێوەی دەبەی و چاودێری دەکەی.

زۆرێـک لە بازرگانەکـان، خۆیـان بەرەو گـۆڕ دەبەن بەرلەوەی کـاتی مەرگیشیان بێت، لەبەر ئەوەی ئەوانە هەرگیز فێر نەبوون بۆ ئەوەی بەرپرسـیاریەتی ڕادەسـتی خەڵکی دیکە بکەن، پێداگری لەسـەر ئەوە دەکەن کە هەموو شتێک بە دەستی خۆیان بکەن.

ئـێ ئەنجـامی ئەوەیـش ئەمەیە: پشـێوی و نـاڕەحەتی بەسـەر ئەوانەدا زاڵ دەبێت. ئەوانە هەسـتی پەلەپەل و، دوودڵی و، شـەکەتی و گرژی ئەوانی ئەفراندووە، سەختە فێری ڕادەسـتکردنی بەرپرسـیاریەتی بێت. دەزانـم، ئەوە بـۆ منـیش سـەخت بـووە، هەر زۆر قـورس بـووە. هەروەهـا لە دیـدگای ئەزمـوونی خۆیشـمەوە ئەوە دەزانـم، کە ئەو ناخۆشی و کارەساتەی لە ڕادەستکردنی بەر پرسیاریەتی دەکەوێتەوە ئەگەر بدرێت بە کەسێکی هەڵە و نەشیاو. بەڵام سـەربارەی ئەمەیش، کەسی دەلاستبەدەست و بەڕێوەبەر دەبێت ئەو کارە هەر بکات ئەگەر بیەوێت خۆی لە دوودڵی و گرژی و شەکەتی دوور بخاتەوە.

ئەو کەسەی کە کارێکی گەورە پێکەوە دەنێت و، فێری ئەوە نابێت، کە چۆن کارەکەی ڕێک بخـات و نـوێنەری بکـات و چـاودێری بکـات، ئەوا عـادەتەن دووچـاری کێشـەی دڵ دەبێـتەوە لە پەنجاکـان یـاخود سـەرەتای شەسـتەکاندا، جەڵـتەی دڵـیش هەر بە هـۆی گرژیـی و، دوودڵـی و ڕاڕای سـەر هەڵـدەدات. چ نمـوونەیەکی تـایبەتە؟ بنـوارە نامەکانی ئەو کەسانەی کە مردوون لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکاندا.

## ڕێگای سێیەم

### چ شتێک شەکەتت دەکات و، دەتوانی چ شتێک دەربارەی بکەی.

لێرەدا، ڕاستییەکی سەرسووڕهێنەر و گرنگ بوونی هەیە، بە تەنیا کاری دەروونی نابێتە هۆی ماندووبوونی تۆ، دەکرێت ئەمە بە قسەیەکی پڕوپووچ بەدەربکەوێت، بەڵام چەند ساڵێک لەمەوبەر، زاناکان هەوڵیاندا بزانن، کە ئاخۆ چەندێک مێشکی مرۆڤ دەتوانێت کار بکات بەبێ ئەوەی بگاتە ئاستی "کەمبوونەوەی توانای کار" پێناسەی زانستی شەکەتی یەکسەر هەر ئەوەیە.

بۆ سەرسامی زاناکان، بۆیان دەکەوت، کە ئەو خوێنەی لە کاتی کارکردن و چالاکییدا بە مێشکدا دەڕوات، بە هیچ شێوەیەک نابێتە مایەی شەکەتی و هیلاکی! ئەگەر دڵۆپەیەک لە خوێن، لە دەماری کەسێکی کار کردوو لە کۆتایی ڕۆژدا بگریت، ئەوا درک بەوە دەکەی کە "پڕە لە میکرۆبی شەکەتی" بەڵام ئەگەر دڵۆپەیەک، لە خوێنی ***ئەلبێرت ئەنشتاین*** بگریت، ئەوا هیچ نیشانەیەکی هیلاکی و شەکەتی نیشان نادات جا لە کۆتایی ڕۆژدا بێت یان نا.

لەبەر ئەوە، ئەوەندەی پەیوەندیدار بێت بە مێشک، ئەوا دەتوانێت کار بکات "زۆر بە باشی و خێرایی لە کۆتایی هەشت یان تەنانەت دوانزە کاتژمێری کاکردن لە هەوڵ و ماندووبوون" هەرگیز مێشک هیلاک نابێت، ئێ کەوایە ئەوە چییە کە دەبێتە هۆی هیلاک بوونی تۆ؟

دەروونناسان پێیان وایە کە، زۆربەی هیلاکی و شەکەتی ئێمە، بە هۆی تێڕوانین و هەڵویستی دەروونی و هەست و سۆزەوە سەر دەگرێت. یەکێک، لە بەناوبانگترین دەروونناسەکانی ئینگلتەڕا، ***جەی. ئەی. هادفیلد*** لە کتێبەکەیدا بەناوی "دەروونناسی هێز" دەڵێت: "بەشێکی گەورەی ئەو هیلاکییەی، کە ئێمە ئازاری پێیەوە دەچێژین لە

دەروونەوە سەرچاوە دەگرێت لە ڕاستیدا، ئەو ماندووبوون و هیلاکییەی، کە بە هۆی جەستەوە سەر هەڵدەدات زۆر دەگمەنە."

یەکێک لە دەروونناسەکانی ئەمریکا، دکتۆر *ئەی. ئەی. بریل* زیاتر بەم بابەتەدا قووڵ دەبێتەوە، دەڵێت: "سەدا سەد، هۆکارەکانی شەکەتی کرێکارێکی کەمجووڵە دەگەڕێتەوە بۆ کارتێکەرە دەروونییەکان، کە مەبەستمان پێیان لە هۆکارە سۆزدارییەکانە."

کەوایە، ئەو هۆکارە سۆزدارییانە چیین، کە دەبنە مایەی شەکەتی و هیلاکی کرێکارێکی کەمجووڵە؟ خۆشییە؟ ئاسوودەییە؟ نەخێر، هەرگیز! بێزاری، شەکەتی، هەستێک کە بەرزنەنرخێندراوی و ڕێزت نەگراوە، هەستی بێسوودی، پەلەپەلی، شەکەتی، نیگەرانی و دوودڵی، ئەمانە هۆکارگەلێکی هەست و سۆزین، کە دەبنە مایەی شەکەتی کرێکارێکی کەمجووڵە، بەرگری کەم دەکاتەوە و، بە شەکەتی و ماندوویی و ژانەسەرەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوە. بەڵێ، ئێمە ماندوو و شەکەت دەبین، چونکە لە جەستەماندا هەست و سۆزەکانمان دەبنەمایەی گرژبوونی دەمارەکانمان.

کۆمپانیایی "میترۆپۆلین لایف ئنشورەرەنس" لە نامیلکەیەکدا لەسەر بابەتی شەکەتی نووسیوویەتی: "کاری سەختیش، بە دەگمەن دەبێتە مایەی هیلاکی، کە ناکرێت بە خەوتن و پشوودان چارەسەر بکرێت، نیگەرانی، گرژیی و پشێوی سۆزداری، سیَدانە هۆکاری سەرەکی هیلاکی و شەکەتین. ئەمانە دەبێت ئەو کاتە لۆمەیان بکرێت کاتێک، کە باری دەروونی و جەستەی بە جۆرێک دەربکەوێت، کە هۆکاری نانەوەی شەکەتی بن. لەبیرت نەچێ کە ماسوولکە ماندوو و گرژەکانت ماسوولکە کار کردووەکانت، هێز و وزەی خۆت بۆ کار و ئەرکە گرنگەکانت پاشکەوت بکە."

هەر ئێستا بوەستە، لە هەر کوێیەک هەیت، پێداچوونەوەیەک بە خۆتدا بکە، هەر کە ئەم چەند دێرە دەخوێنیتەوە، ئایا هەست بە ڕاڕایی و

دوودڵی دەکەی؟ هەست بە فشار دەکەی لەنێوان چاوەکانتدا؟ ئایا بە ئاسوودەیی لە سەر کورسییەکەتدا دانیشتووی؟ یاخود ئایا شانەکانت بەرز دەکەیەوە؟ ئایا ماسوولکەکانی ڕووخسارت گرژ دەبن؟ مەگەر تەواوی جەستەت وەکوو پارچە قوماشێکی بێ گرێ و گۆڵ بێت، ئەوا تۆ هەر لەم ساتەوە، گرژی ماسوولکە و دەمارییەکانت هەیە، تۆ خۆت نیگەران و شەکەت دەکەیت!

بۆچی ئەم جۆرە گرژیانە، بۆ خۆمان فەراهەم دەهێنین لە کردنی کاری هزریدا؟ ***دانیال دەبلیوو. جۆسلین*** دەڵێت: "پێم وایە بەربەستی سەرەکی بریتییە لەو بیر و باوەڕە جیهانییەی کە دەڵێت، کاری سەخت پێویستی بە هەستکردن بە کۆشش و شەکەتی هەیە، ئەگەر نا ئەو کارە بە باشی ناکرێت،" لەبەر ئەوە ماسوولکەکانمان گرژ دەبن، کاتێک تەرکیز دەکەین و لە کارداین. شانەکانمان بەرز دەکەینەوە، داوا لە ماسوولکەکانمان دەکەین بۆ ئەوەی جووڵەیەکی کۆشش بکەن، کە بە هیچ جۆرێک لە جۆرەکان یارمەتیدەری مێشکمان نابێت لە کاتی کارکردندا.

ڕاستییەکی سەرسووڕهێنەر و تراژیدیا بوونی هەیە: ملیۆنان کەس کە خەون بە لەدەستدانی پارەوە نابینن، ئەوا ڕوو لە بەفیڕۆدانی هێز و تواناکانیان دەکەن، بە شێوەیەکی ئەوتۆ و گەمژانە، کە هاوشێوەی حەوت سەرخۆشی دەریاوانی سەنگافورە بێت.

کەوایە هۆکاری ئەم هیلاکبوون و شەکەتبوونە چییە؟ پشوو بدە! پشوو بدە! پشوو بدە! فێری پشوودان بە، لە کاتی ڕاپەڕاندنی کارەکەت!

ئاسانە؟ نەخێر، تۆ پێویست ناکات نەریتی ژیانکردنت پێچەوانە بکەیەوە، بەڵام ئەوەیش شیاوی هەوڵ و تێکۆشانە، چونکە دەکرێت ژیانت ڕزگار بکات! ***ویلەم جەیمز***، لە گوتارەکەیدا دەڵێت: "پەیامی پشوودان" بریتییە لە "دڵەڕاوکێ و، پەلەپەلکردن لەلای هاوڵاتی

ئەمریکی، نەریتێکی خراپە، هیچ شتێک لەوە زیاتر و کەمتر نییە،" گرژبوون نەریتێکە، پشوودان نەریتێکە، خووە خراپەکانیان دەکرێت تێکبشکێنرێن و خووە باشەکانین پەرەیان پێ بدرێت.

کەوایە چۆن پشوو دەدەی؟ ئایا لە مێشکتەوە دەست پێ دەکەی، یان لە دەمارەکانتەوە دەست پێ دەکەیت؟ یاخود لە هیچ کامێک لەوانە دەست پێ ناکەی، هەردەم دەبێت لە ماسوولکەکانتەوە دەست پێ بکەیت!

با تاقی بکەینەوە، بۆ ئەوەی نیشانی بدەین، کە چۆن ئەمە دەکرێت، وا دادەنێین، کە لە چاوەکانمانەوە دەست پێ بکەین، ئەمە چەند دێڕە بخوێنەوە، کاتێک پێت نایە کۆتاییەکەی، پاڵ بدەوە و چاوەکانت دابخە، بە هێواشی بە چاوەکانت بڵێ: "بەسە شەڵەژان، بەسە، بوەستە لە گوشار، بوەستە لە مۆرەکردن، بوەستە، بەسە." بۆ ماوەی خولەکێک ئەمە دووبارە و دووبارە بکەوە.

ئایا تێبینی ئەوەت نەکرد، لەدوای چەند چرکەیەک ماسوولکەکانی چاوەکانت وا گوێڕایەڵێت دەکەن؟ ئایا هەست بەوە نە کرد، کە دەستێکت دەبێت ئەو گرژیە ڕابماڵێت؟ زۆر باشە، هەر وەکوو دەردەکەوێت شتێکی نایەبە، تۆ ئەمەت لەماوەی خولەکێکدا کرد و ئاشنای کلیل و نهێنی پشوودان بوویت.

دەتوانی هەمان شت دەگەڵ چەناگەت، ماسوولکەکانی ڕووخسارت، ملت، شانەکانت و تەواوی جستەت بکەی، بەڵام گرنگترین ئەندامی جەستەت برتییە لە، چاوەکانت. دکتۆر ئێدمەند جاکۆبسۆن لە زانکۆی شیکاگۆ دەڵێت: 'ئەگەر بتوانی پشوو بە ماسوولکەکانی چاوەکانت بدەی، ئەوا دەتوانی تەواوی کێشەکانت لەبیر بکەیی و فەرامۆشیان بکەی! هۆکاری ئەوەیش کە چاوەکان ئەوەندە گرنگن لەبەرانبەر پشوودان و نەهێشتنی هیلاکی ئەوەیە، کە بە هەردوو چاو چواریەکی ئەو دەمارە وزە، بەکار دەهێنن. هەر لەبەر ئەمەیشە، زۆربەی ئەو

کەسانەی کە خاوەن بینایییەکی باشن ئازار لە دەست "گرژی چاوەکانیان" دەچێژن.

***ڤیکی بۆم***، ڕۆمان نووسی بەناوبانگ، دەڵێت: "کاتێک منداڵ بووم، چاوم بە پیاوێکی بەتەمەن کەوتووە و گرنگترین وانەی ژیانی فێر کردووم. ***ڤیکی*** بەسەر زەویدا کەوتووە و، ئەژنۆی بریندار بووە و، مەچەکی ئازاری پێ گەیشتووە، پیاوە پیرەکەیش، ئەوی ڕاستکردووەتەوە و، دەی تەکێنێت و پێی دەڵێت: "هۆکاری برینداربوون و ئازار پێگەیشتنت ئەوەیە کە، تۆ نازانی پشوو بدەیت، تۆ دەبێت وا نیشان بدەیت، کە هێندەی گۆرەوییەک گوشراویت، هەر کە پیاوە بە تەمەنەکە گۆرەویە کۆنەکەی قەد کرد، گوتی وەرە و با نیشانت بدەم کە چۆن ئەوە دەکەیت.

ئەو پیرە پیاوە، وانەیەکی فێری ***ڤیکی بۆم*** کرد، چۆن منداڵەکانی دیکەیش دەکەون، چۆن تەقلە لێ دەدەیت، ئەو پیاوە هەردەم پێداگری دەکرد، "وەکوو گۆرەوییەکی کۆنی قەدکراو بیر لە خۆت بکەوە، پاشان پشوو بدە!"

دەتوانی لە کاتی دەست بەتاڵیدا، پشوو بدەی، لە هەر شوێنێک بیت، تەنیا هەوڵ و کۆشش مەدە بۆ ئەوەی پشوو بدەی. پشوودان، بریتییە لە نەبوونی گرژی و هەوڵ و کۆشکردن.

بە ئاسانی و ئاسوودەیی بیر بکەوە. هەر لە پشوودانی ماسوولکەکانی ڕووخسار و چاوەکانت دەست پێ بکە، دووبارە و دووبارە بڵێ، پشوو بدەن، پشوو بدەن، بوەستە و پشوو بدەن، هەست بەو وزەیە بکە، کە لە ماسوولەکانی ڕووخسارت ڕێ دەکات و دەگاتە سنگتەوە، وەکوو منداڵێک بیر لە خۆت بکەوە، کە لە هەموو گرژی و ئاڵۆزیەک بەدووریت.

ئەمە هەر ئەوەیە کە، ***گالی کورسی*** گۆرانبێژی گەورەی ئۆپێرا، لەسەر کردنی ڕاهاتووە، ***هێلن جێیسۆن*** ئەوەی پێ گوتم، کە ***گالی کورسی*** دەبینی بەر لە نواندن، لەسەر کورسییەک دانیشتبوو و هەموو ماسوولکەکانی و شەویلگەی خوارەوەی پشوویان دەدا. مەشقێکی نایاب بوو، ئەمەیش ئەوی لە نیگەرانی و شەکەتی دەپاراست بەرلەوەی بچێتە سەر ستەیج و دەبوویە هۆی نەهێشتنی شەکەتی و هیلاکی.

لێردا، چوار پێشنیار بوونیان هەیە کە فێرت دەکەن چۆن پشوو بدەی:

یەکەمیان: لە کاتی دەست بەتاڵیدا پشوو بدە، هاوشێوەی کۆنە گۆرەوەی، من خۆم کۆنە گۆرەوییەکی مارۆنی، لە کاتی کارکردندا لەسەر مێزەکەم دادەنێم، وەکوو یادخەرەوەیەک لەوێی دادەنێم، کە دەبێت چۆن پشوو بدەم. ئەگەر گۆرەویەکت دەست ناکەوێت، ئەوا سەیری پشیلە بکە، ئایا تا ئێستا پشیلەیەکت هەڵگرتووە کە لەبەر خۆر پاڵ کەوتووە؟ ئەگەر وات کردووە، ئەوا ئەو دووانە وەکوو ڕۆژنامەیەکی تەڕ وان. تەنانەت پەیرەوانی یۆگا لە هندستان دەڵێن؛ "ئەگەر دەتەوێت فێری هونەری پشوودان بیت، ئەوا لە پشیلە وردبەرەوە." هەرگیز پشیلەیەکی شەکەتم بەرچاو نەکەوتووە، پشیلەیەک کە هیلاک و نیگەران بێت، یاخود پشیلەیەک، کە لە دەست دوودڵی و بێخەوی و برینی گەدەوە بناڵێنێت، دەشێت خۆت لەو کارەساتانە بەدوور بگریت، ئەگەر هاوشێوەی پشیلە فێری هونەری پشوودان بیت.

دووەمیان: لە کەشێکی گونجا و ئاسوودە بەخشدا کار بکە. لە بیرت بێت گرژییەکانی جەستە دەبێتە هۆی ئازارەکانی شان و شەکەتی دەمارەکان.

سێیەمیان: لە ڕۆژێکدا، چوار پێنج جار خۆت بپشکنە، بە خۆت بڵێ، "ئایا من کاری خۆم سەختتر دەکەم لەوەی کە هەیە؟ ئایا من ئەو

ماسوولکانە بەکار دەهێنم، کە هیچ پەیوەندییان بە کارەکەمەوە نییە؟"
ئەمە یارمەتیت دەدات لەپێناو بەرجەستەکردنی نەریتی پشوودان.

چوارەم: جارێکی دیکە، لە کۆتایی ڕۆژدا، تاقیکردنەوەی خۆت بکە، "ئایا من چەندێک ماندووم؟ ئەگەر من ماندووم، لەبەر کاری دەروونی نییە، کە من کردوومە، بەڵکو بە هۆی ئەوەیە کە چۆن کردوومە." دکتۆر *دانیال دەبلیوو. جۆسیلین* دەڵێت: "لە کۆتایی ڕۆژدا، دەستکەوتەکانم بەپێی ماندووبوونەکانم پێوانە ناکەم، بەڵکو بەوە پێوانەی دەکەم کە چەندێک ئیسراحەتم، هەر بەر لەوەی پرسیار بکەم دەزانم، کە ڕۆژەکەم چەندێک ناچالاک بووە لە ڕووی چەندێتی و چۆنایەتییەوە."

ئەگەر هەموو بازرگانێکی ئەمریکی، فێری هەمان ئەو وانە بن، ئەوا ڕێژەی مردن بە هۆی ڕاڕایی و گرژییەوەیە، لە شەوێکدا کۆتایی پێ دەهات. ئێمەیش دەستمان دەگرت، لە پڕکردنی بووژانگە و شێتخانەکان، لەو کەسانەی کە ڕاڕایی و، دوودڵی و شەکەتی، تێکی شکاندوون.

## ڕێگای چوارەم

### چۆن هەستی بێزاری بەلاوە بنێین، کە دەبێتە هۆی نانەوەی شەکەتی، نیگەرانی و چارِسبوون.

یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی شەکەت بوون، بریتییە لە بێزاری. با بۆتی ڕوون بکەمەوە، با بنوارِینە حاڵەتی خاتوو *ئەلیس*، *ئەلیس* شەوێکیان گەڕایەوە ماڵەوە زۆر هیلاک بوو، وەکوو کەسێکی شەکەت ڕەفتاری دەنواند، بە جۆرێک زۆر هیلاک بوو، ژانە سەری گرتبوو، پشتیشی ئازاری هەبوو، بە جۆرێک هیلاک بوو، کە دەیوسیت بچێتە سەر جێگە بەبێ ئەوەی نانی ئێوار بخوات. دایکی لێی پاڕایەوە، ئەویش لەسەر مێزەکە دانیشت و، زەنگی تەلەفۆنەکەی لێیدا، هاوڕێ کوڕەکەی بوو، بانهێشتی کرد بۆ ئەوەی بڕوات و سەمای لەگەڵدا بکات! چاوەکانی درەوشانەوە، سەرتاپای گیانی پڕ بوو لە خۆشی و شادی.

ڕایکردە نهۆمی سەرەوە و، پۆشاکە شینەکەی لەبەر کرد و هەتا کاتژمێر سێی بەرەبەیانی سەمای کرد، کاتێک دواجار گەڕایەوە ماڵەوە، هەر تۆزقاڵێکیش شەکەت نەبوو. لە ڕاستیدا، هەر بە جۆرێک دڵخۆش و شادمان بوو، هەر نەیدەتوانی خەویشی لێ بکەوێت.

ئایا *ئەلیس*، بەر لە هەشت کاتژمێر، کەسێکی شەکەت بوو، کاتێک بە کەسێکی شەکەت دەردەکەوت و ڕەفتاری دەنواند؟ بێگومان، شەکەت بوو، چونکە لە کارەکەی بێزار بوو، دەکرێت هەر لە ژیان بێزار بووبێت. ملیۆنان *ئەلیس* بوونیان هەیە، تۆیش دەکرێت یەکێک لە ئەوان بیت.

ڕاستییەکی باوە کە تێڕوانینی هەست و سۆزت عادەتەن ڕۆڵی خۆی هەیە، لە نزیکبوونەوە لە کەناری شەکەتی زیاتر لە کۆشش و ماندووبوونی جەستەی.

چەند ساڵێک لەمەوبەر، ***جۆسێف ئێ. بارماک پی ئێچ دی*** ڕاپۆرتێکی لە ئەرشیفی دەروونناسی بڵاو کردەوە، کە لە ئەزموونەکانی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەو ڕاپۆرتەدا ئەوەی بەیان دەکرد، کە چۆن بێزاری دەبێتە مایەی شەکەتی. دکتۆر ***بارماک*** گرووپێک لە قوتابییەکانی خستە ژێر زنجیرەیەک تاقیکردنەوە، خۆشی دەیزانی کە ئەو قوتابییانە کەمێک چێژ لەوە دەبینن.

سەرەنجامی ئەمە چی بوو؟

قوتابییەکان هەستیان بە شەشەکەتی دەکرد و، خەواڵوو بوون، سەریان ژانی دەکرد و چاوەکانیان گرژبوون و، هەستیان بە بێزاری دەکرد. لە هەندێک حاڵەتدا، هەر هەستیان بە تێکهەڵاتنی گەدەیان دەکرد، ئایا تەواوی ئەمە هەموو خەیاڵ بووە؟

نەخێر، چونکە بۆ هەر یەکێک لەو قوتابییانە، پشکنینی میتابۆلیزمیان بۆ کرا، ئەو پشکنینانە ئەوەیان بەرجەسە کرد، کە پەستانی خوێنی جەستە و ئاستی ئۆکسجین، لە ڕاستیدا دادەبەزێت، کاتێک خەڵک هەست بە بێزاری دەکەن و تەواوی میتابۆلیزم دەچێتەوە باری ئاسایی خۆی هەر کە، ئەو کەسە هەست بە خۆش و شادی دەکات لە کارەکەیدا!

زۆر بە دەگمەن ماندوو دەبین، کاتێک کارێکی خۆش و چێژ بەخش دەکەین. بۆ نموونە من بەم دواییانە بۆ پشووەکەم ڕۆیشتم بۆ شاخەکانی کەنەدا، لە نزیک دەریاچەی لویز، ماوەی چەند ڕۆژێکم بە ماسیگرتن بەسەر برد، بەڕێگەیەکدا ڕێم دەکرد، کە گژوگیا بە ئەندازەی بالآم بەرز بوو، پێم لە کۆلکەدار گیر دەبوو و بەسەر داردا

دەکەوتم، لەدوای تێپەڕبوونی هەشت کاتژمێر بەم شێوەیە، هەر هیچ هەستم بە شەکەتی و هیلاکی نەدەکرد.

بۆچی؟ چونکە من کەسێکی خۆشحاڵ بووم، شادوومان بووم، شەش‌دانە ماسی گەورەم ڕاو کرد، بەڵام وا دابنێ لە کەشێکی بێزاردا بووم، بەوەی کە ڕاوەماسی بکەم، پێت وا بوو من هەستم بە چی دەکرد؟ بێگومان، هەستم بە شەکەتی دەکرد، بە هۆی کردنی ئەو کارە سەختەوە کە لە سەرووی حەوت‌هەزار پێ بوو.

تەنانەت، لە جۆرە چالاکییەکی ئەوتۆ پڕ لە هیلاکی و شەکەتی وەکوو سەرکەوتن بەسەر شاخدا، ئەوا دەکرێت لە هەر کارێکی دیکە، شەکەت و ماندووت بکات. بۆ نموونە بەڕێز ***ئێس. ئەیچ. کینگمان*** سەرۆکی بانکی بەرهەمهێنانی جووتیار و پیشەوەرانی مینیپۆلس، ڕووداوێکی بۆ گێڕامەوە، کە هەر بە تەواوی قسەی من ڕوون دەکاتەوە.

لە تەمووزی ساڵی ١٩٥٣ـدا، حوکمەتی کەنەدی داوای لە یانەی ئەڵپاینی کەنەدی کرد، بۆ ئەوەی چەند ڕاهێنەرێک دیار بکات، بە مەبەستی مەشقکردن بە ئەندامانی "پرینس وۆڵز ڕانگەرز،" لە سەرکەوتن بەسەر شاخدا. بەڕێز ***کینگمان*** یەکێک بوو لەو ڕاهێنەرانەی کە هەڵبژێردرا بوو بۆ ئەوەی مەشق بە سەربازەکان بکات. خۆی بۆی باس کردم، کە چۆن ئەو و، ڕاهێنەرەکانی دیکە، کە ئەو سوپا و گەنجانەیان بردووەتە سەر بەرزاییەکان و سەهۆڵە ڕووبار و دەشتە بەفرییەکان، کە چل پێ بەرز بوون، ئایا پێویست بوو بە پەت سەر بکەون، جێی پێ و دەستیان بۆ خۆیان دروست کردایە، ئەوانە بەسەر "مایکڵ پیک، ڤایس پرێزیدنت پیک" و چەندین لووتکەی دیکە و دۆڵی بچووکی یاهۆ لە چیای ڕۆکیدا کەوتن. لەدوای پازدە کاتژمێر لە سەرکەوتن بەسەر چیادا، ئەو گەنجانە، کە

مەشقکردنێکی شەش هەفتەییان لەو ماوە کەمەدا تەواو کردبوو، هەر زۆر شەکەت و هیلاک بوون.

ئایا شەکەتی ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی ماسولکەکانیان، کە پێشتر ڕاهێنانیان پێ نەکرابوو؟ هەر کەسێ ڕاهێنانی سەربازی بینی بێت، گاڵتەی بەم پرسیارە دێت! نەخێر، بەڵکو ئەوانە هەر زۆر شەکەت بوون، چونکە بێزار بوون بە هۆی سەرکەوتنیان بەسەر چیادا، ئەوەندە ماندوو بوون، کە جۆرێک لە ئەوانە بەبێ ئەوەی چاوەڕێی نانخواردن بکەن خەویان لێ کەوت، بەڵام مەشقپێکەرەکان -کە دوو سێ ئەوەندەی، سەربازەکان بە تەمەن بوون- ئایا ئەوانیش هەر ماندوو بوون؟ بەڵێ، بەڵام هیلاک و شەکەت نەبوون، نانی ئێوارەی خۆیان خوارد و بۆ چەند کاتژمێریکیش بەدەم قسەکردنەوە مانەوە و دەربارەی ئەو ڕۆژانەی، کە ئەزموونیان تێدا کردووە، ئەوانە شەکەت نەبوون، لەبەر ئەوەی حەزیان لەو جۆرە کارە بوو.

کاتێ، دکتۆر ***ئێدوارد سۆرندیک***، لە زانکۆی کۆلۆمبیا، چەند تاقیکردنەوەیەکی دەربارەی شەکەتی ئەنجامدا، کارێکی ئەوتۆی کرد، کە لاوەکان بۆ ماوەی هەفتەیەک نەخەوتن چونکە ئەوانی سەرقاڵ کردبوو بەکاری خۆش و سەرنجڕاکێش. لەدوای لێکۆڵینەوەیەکی تەواو، دکتۆر ***سۆرندیک*** گوتی: "بێزاری تاکە هۆکارێکی ڕاستەقینەی کەمکردنەوەی کارە."

ئەگەر تۆ کرێکارێکی هزری بیت، ئەوا زۆر دەگمەن ڕوو دەدات، کە ماوەی کاکردنەکەت ببێتە مایەی ماندووبوونت. دەکرێت ماندوو بیت لەو ماوەیەی، کە کاری تێدا ناکەی. بۆ نموونە ئەو ڕۆژەی هەفتەی ڕابردووت لەبیرە کە کارەکانت پچڕپچڕ ڕادەپەڕاند. وەڵامی هیچ کامێک لە نامەکانت نەدەدایەوە و، وادەکانت بەجێ نەدەگەیاند، کێشە لێرە و لەوێ سەری وەدەرنابوو، لەو ڕۆژەدا تەواوی شتەکان بە هەڵە ڕێیان کردبوو. تۆیش هیچ شتێکت تێیدا بەدەست نەخست،

سەرباری ئەوەیش بە هیلاکی و شەکەتی چوویە ماڵەوە، دووچاری سەرئێشەش ببوویەوە.

لە ڕۆژی دواتردا، هەموو شتێک بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوەچوو لە نوسینگەکەتدا، چەند بەرانبەری ڕۆژانی ڕابردوو کارت کرد، لە کاتێکدا ڕۆیشتیتە ماڵەوە پڕ لە چووست و چالاکی بوویت و، وەکوو گوڵی سپی گەشابوویەوە، تۆ بەناو ئەو ئەزموونەدا ڕێت کردووە و منیش هەروا.

ئەو وانەیەی، کە دەبێت فێری بین؟ ئەوەیە زۆرجار شەکەتی ئێمە بە هۆی کارکردنەوە سەر هەڵنادات، بەڵکو بە هۆی نیگەرانی و ڕاڕایی و بیزارییەوە دێتەبوون. لە کاتی نووسینی ئەم بەشەدا، ڕۆیشتم بۆ ئەوەی شانۆگەری ***جێروم کێرن*** ببینم، نیشاندانی بەلەم، کاپتن ***ئاندی***، کاپتنی ***چرای پەمۆ***، لە یەکێک لە دەقە فەلسەفییەکانیدا دەڵێت: "کەسانی بەختەوەر ئەو کەسانەن، کە کارێک دەکەن و چێژ لە کردنی دەبینن، ئەوانە کەسانێکی بەختەوەرن، چونکە وزەیەکی زیاتریان هەیە، بەختەوەرترن، کەمتر نیگەران و شەکەت دەبن. کە وایە، حەزەکانی تۆ لە کوێوە سەرچاوە بگرن هەر لەو شوێنەیش هێز و وزەی تۆ دێتە بوون. دە هەنگاو ڕێگابڕین لەگەڵ ژن یان مێردێکی دەم بە پرتەوبۆڵە دەکرێت زۆر هیلاککەرتر بێت لە دە میل ڕێکردن لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا.

کەوایە چی؟ دەتوانی چی دەربارەی ئەمە بکەی؟ زۆر باشە، یەکێک لە سکتێرەکانی کۆمپانیاکانی نەوت لە توڵسا، ئۆکلاهۆما، ئەم وێنەیەمان بۆ بەرجەستە دەکات، هەر مانگێک بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک دەبوواپە کارێکی سەخت و ناخۆشی بکردایە، دەبوواپە گرێبەستە چاپکراوەکانی کۆمپانیای پڕ بکردایەتەوە و، ژمارە و ئامارەکانیشی ئامادە بکردایە. ئەم کارە هەر زۆر بێزارکەر بوو، بەڵام ئەم ئافرەتە بڕیاریدا کارەکەی خۆی خۆش و سەرنجڕاکێش بکات.

بەڵام چـۆن؟ ڕۆژانە، لەگەڵ خۆیـدا کەوتە پێشـبڕکێ، ئەو فۆرمـانەی دەژمـــارد کە لە هەر بەیانییەکـــدا پـــڕی دەکـــردنەوە و، لەدوای نیوەڕۆیانیشـدا هەوڵـی دەدا باشـتر بێـت، کـۆی گشـتی هەر ڕۆژێکـی دەژمارد و هەوڵی دەدا بۆ ڕۆژی دواتر باشتر بێت.

ئـێ ئەنجـامی ئەمە چـی بـوو؟ لە هەر ئـافرەتێکی دیـکە تـوانی فـۆڕمی زیاتر پڕ بکاتەوە، ئێ ئەمەیش، ئەوی بەچی گەیاند؟ سوپاس و دەست خۆشـی؟ نەخـــێر، پـلەی بەرز؟ نەخـــێر، بەرزبـوونەوەی مـوچە؟ نەخێـــر، بەڵکو ئەمە یارمەتیدەری بوو بۆ ئەوەی خۆی لە هیلاکی و شـەکەتی بەدوور بگرێـت، کە بە هـۆی بێـزارییەوە هـاتبوویە بـوون، هەروەهـا هاندانێکی دروونـی وایشـی بۆ بەرجەسـتە کرد، چونکە ئەم باشـترین هەوڵـی خـۆی دابـوو بـۆ ئەوەی کـارێکی سـەخت و نـاخۆش بگۆڕێـت بـۆ کـارێکی خـۆش و سـەرنجڕاکێش، بەمەش وزەی زیـاتری بەدەست خست و، حەزێکی زیاتری بۆ دەستەبەر بـوو، کـامەرانییەکی زیاتری لە کاتی دەستبەتاڵیدا بەدەست خستبوو.

زۆر باش دەزانم، کە ئەم چیرۆکە ڕاست و دروستە، لەبەر ئەوەی من خۆم هاوسەرگیریم دەگەڵ ئەو کچەدا کردووە.

چیرۆکێکـی دیـکە بـوونی هەیە، دەربـارەی کچێکـی دیـکە، کە ئەویـش ویسـتویەتی وا نیشـان بـدات کە کـارەکەی، پـڕ لە خۆشـی و شـادیە، وەلـێ ئەم کـچە ڕاهـاتبوو، لەگەڵ کارەکەیـدا بجەنگێـت، ئەو خـاتوونە ***ڤـالی جـی. گۆلـدن*** بـوو لە شـەقامی "ئێلمهێرسـت ئیلینـۆیس،" ئەمە چیرۆکەکەیەتی، هەر وەکوو خۆی، کە بۆ منی نووسیووە:

لە نوسینگەکەمدا، چوار کەسـی دیکە هەیە، کە هەمـان کـار دەکەن، هەر یەکێـک لە ئـێمە دەبێـت نـامە لە پیـاوی هەمەجـۆر وەربگرێـت و بینووسـێتەوە. ڕۆژێکیـان، هەمووومـان سـەرقاڵی کـاری خۆمـان بـووین، کاتێک یاریدەدەری بەڕێوەبەری بەش پێداگری لەسـەر ئەوە کرد، کە دەبێت نامەیەکی دوورودرێژ سـەر لە نوێ بنووسمەوە، منیش یـاخی

بووم. ویستم ئاماژە بەوە بکەم، کە نامەکە دەتوانرێت ڕاست بکرێتەوە هەر بێ ئەوەی دووبارە بنووسرێتەوە، کەچی ئەو لە وەڵامدا گوتی، ئەگەر تۆ ئەوکارە نەکەی ئەوا من کەسێکی دیکە دەدۆزمەوە کە ئەو کارە دەکات! هەر بە جارێک پەست بووم! بەڵام کاتێک دەستم کرد بە دووبارە نووسینەوەی نامەکە، ئەوە کەوتە خەیاڵمەوە، کە چەندین کەسی دیکە، بەدوای هەلێکدا وێڵن بۆ ئەوەی ئەو کارە بکەن. هەروەها، خۆ من پارەم بۆ کردنی ئەو کارە پێدراوە، وردەوردە هەستم بە باشتر دەکرد. کتوپڕ بڕیارمدا، کە بە جۆرێک ئەو کارە بکەم، هەر چێژی لێ ببینم، هەرچەندە زۆر ڕقم لێی بوو.

لەدوای ئەوە، درکم بە وانەیەکی گرنگ کرد، ئەگەر بە جۆرێک کارەکەم بکەم وەکوو بڵێی چێژی لێ ببینم، پاشان تا ئەندازەیەک چێژی لێ دەبینم. هەروەها درکیش بەوە دەکەم کە دەتوانم کارەکەم خێراتر ڕادەپەڕێنم ئەگەر چێژی لێ ببینم، هەر لەبەر ئەوەیشە هیچ پێویست ناکات کاری زیادە بکەم. ئەم تێڕوانین و دیدگایەی من، وەکوو کارکەرێکی باش ناوبانگی پێ بەخشیم. کاتێک یەکێک لە بەڕێوەبەری بەشەکان پێویستی بە سکتێرێکی تایبەت بووایە، ئەوا داوای لە من دەکرد، بۆ ئەوەی ئەو کارەی بۆ بکەم، وەکوو دەیگوت، کە من حەز بە کردنی کاری زیاتر دەکەم بێ ئەوەی هەست بە بێزاری بکەم! خاتوو ***گۆلدن*** دەنووسێت، "لە ڕاستیدا گۆڕینی دیدگای باری دەروونی بۆ من دۆزینەوەیەکی زۆر گرنگ بوو، بگرە هەر بە شێوەیەکی ناوازە کاری تێکردووم!"

خاتوو ***گۆلدن***، فەلسەفەی پرۆفیسۆر ***هانس ڤەیکینگەری*** بەکار هێناوە، کە فێرمان دەکات هەردەم لە هەڵسوکەوتەکانمان و کارەکانماندا، وا نیشان بدەین کە ئێمە دڵخۆشین، تادوایی.

ئەگەر بە جۆرێک ڕەفتار بنوێنیت، وەکوو بڵێی، کە چێژ لە کارەکەت دەبینی، ئەوا ئەو تۆزقاڵە نیمایشە، وا دەکات هەر بە جدی چێژ لە

کارەکەت ببینیت، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئاستی شەکەتی و هیلاکی و، دوودڵی و گرژییەکانت برەوێنیتەوە.

چەند ساڵێک لەمەوبەر، ***هارلان ئەی. هۆوارد*** بڕیارێکی دەرکرد، کە هەر بە تەواوی ژیانی ئەمی گۆڕی، کارێکی زۆر ناخۆش و سەختی کرد بە کارێکی پڕ لە شادیی و خۆشی، لە ڕاستیدا، کارێکی ناخۆشی هەبوو، شوشتنی قاپ و قاچاخ و ئامێرەکانی ئایسکرێم لە ژووری نانخواردنی قوتابخانەکەیاندا لە کاتێکدا کوڕەکانی دیکە یاری تۆپی پێیان دەکرد یان گاڵتەوگەپیان لەگەڵ کچەکاندا دەکرد.

***هارلان هۆوارد***، زۆر ڕقی لە کارەکەی دەبوویەوە –بەڵام لەبەر ئەوەی دەبووایە پێیەوە پابەند بێت، بڕیاریدا، لە خوێندنەوەی بۆ ئاسکرێم ورد بێتەوە– کە چۆن دروستکراوە، چ پێکهاتەیەکی تێدا بەکارهێنراوە، بۆچی هەندێک لە ئایسکرێمەکان لە ئەوانی دیکە باشترن. سەرەتا کیمیای ئاسیکرێمی خوێند و، بوو بە یەکێک لە دیارترین خوێندکارەکان، ئێستایش حەزێکی زۆری بۆ کیمیای خۆراک هەیە، بە جۆرێک ڕۆیشتە کۆلێژی ماشۆسێترس پسپۆڕی لە بواری تەکنەلۆژیای خۆراکدا بەدەست هێنا.

ئەو کاتەی کۆمپانیایی کۆکای نیۆرک، خەڵاتێکی سەد دۆلاری پێشنیاز کرد، بۆ باشترین تویژەر لەسەر سوودەکانی کۆکا و شکولاتە – دیارییەکە بەڕووی هەموو قوتابیەکانی کۆلێژدا واڵابوو– پێت وایە کێ ئەو خەڵاتەی بردەوە؟ بێگومان ئەو کەسەی کە خەڵاتەکەی بردەوە، ***هارلان هۆوارد*** بوو.

کاتێک وا هەستی کرد، کە کار پەیداکردن قورسە، لە نهۆمی خوارەوەی ماڵەکەیدا، لە ئامهێرت ماشۆسێتس، تاقیگەیەکی تایبەتی کردەوە. بە ماوەیەکی کەم لەدوای ئەوە، یاسایەکی نوێ دەرچوو، ڕێژەی بەکتریا، لە شیردا دەبێت هەژمار بکرێت. ***هارلان ئەی. هۆوارد*** هەستا بە ئامادەکردنی ژمارەی بەکتریا بۆ چواردە کۆمپانیاکانی شیر،

لە ئەمهێرســـتدا، تـــا کـــارەکەی وای لێهـــات، کە پێویســـتی بە دوو یاریدەدەر هەبوو بۆ ئەوەی کاری لا بکەن.

لەدوای بیستوپێنج ساڵ، لە ئێستا بەدواوە چی لێ پەیدا دەبێت؟ زۆر باشە، ئەو پیاوانەی کە لە ئێستادا کیمیای خواردن بەڕێوەدەبەن، بۆ ئەو کاتە خانەنیشن دەبن یان گیان دەسپێرن، خەڵکی گەنج شوێنی ئەوان دەگـرێتەوە، لەدوای بیسـتوپێـنج سـاڵی دیـکە، *هـارلان ئەی. هاوارد* دەبێت بە یەکێک لە بەڕێوەبەرە کارا و کارامەکان، لە کاتێکدا هاوپیشەکانی کە ئاسکرێمی پێ دەفرۆشتن، کەسانێکی بێ کار دەبن و نەفـــرەت لە حکـــومەت دەکەن، گـــلەی و گازنـــدەی ئەوە دەکەن، کە هەرگیز هیچ دەرفەتێکیان بۆ نەڕەخساوە. *هارلان. ئەی هێوارد* دەکرا هەرگیز ئەو دەرفەتەی بۆ ڕێک نەکەوتبایە ئەگەر بەرگێکی خۆش و سەرنجڕاکێش بە بەر کارێکی ناخۆش و خراپدا نە کردبایە.

چەند سـاڵێک لەمەوبەر، گەنجێکی دیکە پەیڕەوی هەمـان شـتی کـرد، کـارەکەی ئەوە بـوو، دەبـووایە لەســەر چەرخێـک دەبنیشـێت و لە کـارگەدا بورغـوو بسـوڕێنێت. نـاوی یەکەمـی *سـام* بـوو، ئەم لاوە دەیویست واز بهێنێت بەڵام ترسیشـی لەوە هەبوو کە کارێکی دیکەی دەست نەکەوێت. ئیتر ناچاریش بوو، ڕێ لەگەڵ ئەو کارە ناخۆشـەدا بکات.

دواجار *سام* بڕیاریدا، کە دەتوانێت وا لە کارەکەی بکات بە شتێکی خۆش و سـەرنجڕاکێش دەربکەوێت، لەبەر ئەوە پێشبڕکێیەکی لەگەڵ بەکارخەرێکی میکانیکی ئامێرێک کرد، لە تەک خۆیەوە، یەکێک لە و بورغووانە سەرەکەی لوس ببوو، ئەوانی دیکەش دەبووایە لە ناوەندی تیرەکە بکوترێن، جار و بار، ئامێرەکان دەگۆڕن و بزانن ئاخۆ کێ دەتوانێـت زیـاترین بورغـوو بسـوڕێنێت. سـەرکارەکە بە خێرایـی و کـارامەیی *سـام* سەرسـام بـوو و هەرزوو کـارێکی باشـتری پێـدا. ئەمەیش بوو بە دەستپێکی زنجیرەیەک لە پلەبەرزبوونەوە لە کاردا.

لەدوای سێ ساڵ، *سام -سامیول ڤۆکلەین-* بوو بە سەرۆکی بۆڵدوین لۆکۆمۆتیڤ وێرکس، بەڵام بە تەواوی ژیانی هەر بە کەسێکی میکانیکی دەمایەوە ئەگەر کارێکی ناخۆش و بێزارکەری نەکردبایە بە کارێکی جوان و سەرنجڕاکێش.

*ئەیچ. ڤی. کالتێنبۆرن* لێکۆڵەری بەناوبانگی ڕادیۆ -جارێکیان بۆی گێڕامەوە، کە چۆن بەرگی جوانی بە بەرکارێکی ناخۆشدا کردووە. کاتێک تەمەنی بیستودوو ساڵان بوو، لەسەر بەلەمێکی گواستنەوەی ئاژەڵان لە زەریای ئەتڵەسی، کاری ئەم لاوە ئەوە بوو، کە ئالیک و ئاوی دەدایە ئەو ئاژەڵانە. لەدوای گەڕانێک بە پاسکیل بە دەوروبەری ئینگلتەڕادا بە برسێتی و داڕووخاوی گەڕایەوە پاریس.

کامێرایەکی وەکوو ڕەهن بە پێنج دۆلار دابین کرد، بۆ دابەزاندنی ڕیکلامێک لە ڕۆژنامەی نیۆرک هێرالد، بۆ ئەوەی کارێک بە دەست بخات لە فرۆشتنی ئامێرەکانی دووربین و کامێرادا. ئەو ئامێرە کۆنانەم لە بیر دێت، کە لە بەرچاوماندا دادەنان بۆ ئەوەی پێیەوە، سەیری دوو وێنە بکەین، کە بیزەبت هاوشێوەی یەکتر بوون، هەر کە لێیەوە سەیرمان کرد، شتێکی دەرئاسا هاتەبوون، هەردوو عەدەسەکە ئەو دوو وێنەیان دەکرد بە یەک وێنە و دیمەن بە بوونی دووری سێیەم لە نێوانیاندا. دووریەکمان دەبینی، دیمەنێکی سەرسووڕهێنەرمان بەرچاو دەکەوت.

باشە، هەر وەکوو دەڵێم *کالتێنبۆرن* دەستی بە فرۆشتنی ئەو ئامێرانە کرد و، دەرگا بە دەرگا دەگەڕا لە پاریس، لە کاتێکدا نەیشی دەتوانی بە زمانی فەرەنسی قسە بکات. بەڵام لە یەکەم ساڵدا توانی، بڕی پێنج هەزار دۆلار بەدەست بخات، لەو ساڵەدا توانی وەکوو کرێکارێک زۆرترین بڕی پارە بەدەست بهێنێت. *ئەیچ ڤی کالتێنبۆرن* ئەوەی پێ گوتم کە ئەم ئەزموونە بوویە مایەی هاندانی، کە وەکوو هەر قوتابییەکی دیکە، لە زانکۆی هارڤارد سەرکەوتن بە دەست بهێنێت.

باوەڕبەخۆبوون؟ ئەو خۆی بۆی گێڕامەوە کە لەدوای ئەو ئەزموونە، بە جۆرێک هەستی کردووە، کە دەتوانێت تۆمارەکانی کۆنگرێس بە ئافرەتە فەڕەنسییەکان بفرۆشێت.

ئەم ئەزموونەیش، تێگەیشتنێکی باشی دەربارەی ژیانی فەرەنسی بۆ دەستبەر کرد، کە دواتر توانی لە ڕێگەی ڕادیۆ ڕووداوەکانی ئەورووپا ڕوون بکاتەوە.

ئایا ئەو پیاوە چۆن توانی ببێتە کەسێکی ئەوندە شارەزا، لە کاتێکدا نەیدەتوانی بە زمانی فەڕەنسی قسە بکات؟ زۆر باشە، کارمەندێکی هەبوو بۆ ئەوەی وشەکانی تایبەت بە فرۆشتنی بە فەڕەنسییەکی پاراو بۆ بنووسێتەوە و، ئەویش لەبەری دەکردن. لە زەنگی ماڵی دەدا و کابانی ماڵیش وەڵامی دەدایەوە، ***کالتینبۆرن***-یش دەستی دەکرد بە دووبـــــارەکردنەوەی ئەو وشـــــانەی، کە لەبەری کردبـــــوون بە شێوەزارێکی شێواوەوە، دواتر وێنەکانی نیشانی کابانی ماڵ دەدان و، کاتێک پرسیاریشی لێ دەکرا، شانەکانی هەڵدەتەکاندن و دەیگوت: "من ئەمریکیم، من ئەمریکیم."

دواتـر کـڵاوەکەی دادەکەنـد و، ئامـاژەی بەو قسـانە دەکـرد، کە بە زمـانێکی فەرەنسـی پـاراو لەسـەر کـڵاوەکەی چەسـپاندبوون. کابـانی مـــاڵەکە پێـــدەکەی و ئەویـــش بەدەم ئەوەوە دەکەوتە پێکەنیـــنەوە و وێنەی زیاتری نیشان دەدان. کاتێک ***ئەیچ ڤی کالتێرنبۆرن*** دەربـارەی ئەمە قسـەی بـۆ دەکـردم، دانـی بەوەدانـا، کە کـارەکە ئاسـان نەبـووە، بەڵام یەک تایبەتمەنـدی بـوونی هەبـووە، کە وای کـردووە بەنـاو ئەم کـارەدا ڕێ بکـات، ئەویـش پێـداگریکردنی بـووە لەوەی کە خۆشـی بەکارەکەی ببەخشێت، تەنانەت بەیانییـان بەرلەوەی دەست پێ بکـات، سەیری ئاوێنەی دەکرد و لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد:

"***کالتینبۆرن*** ئەگەر بتەوێت ژیـان بکەی، تـۆ دەبێـت ئەم کـارە بکەیـت، وەلێ هەر دەبێت بیشیکەیت، مادام وایە بۆچی چێژ و خۆشییەک بەو

کاره نابەخشیت؟ بۆچی وەکوو ئەکتەرێک لە خۆت ناڕوانیت، لە هەر دەرگایەک دەدەیت، وا بزانە، وا لەسەر تەختی شانۆی و لەبەردەم جەماوەردا کاری نواندن دەکەیت و ئەوانیش وا سەیرت دەکەن؟ لە کۆتاییدا، ئەوەی کە تۆ دەیکەی، هێندەی هەر شتێکی دیکەی سەر تەختی شانۆ خۆشە، ئێ مەگەر وایە بۆچی جۆشوخۆرش بەکارەکەت نابەخشی و بە باشترین شێوە ڕای ناپەڕێنیت؟"

بەڕێز *کالتینبۆرن* پێی گوتم: دووبارەکردنەوەی ئەم قسانە هەموو ڕۆژێک یارمەتیداوە بۆ ئەوەی ئەو کارەی، کە ڕقی لێ بووە بیگۆڕێت بۆ کارێک کە زۆر حەزی لێبووە و بووە بە سەرکەشی بۆیی و زۆر سوودی لێ بینیووە.

کاتێک لە بەڕێز *کالتینبۆرن*ـم، پرسی ئاخۆ هیچ ئامۆژگارییەکی بۆ لاوانی ئەمریکا هەیە، کە وێڵ و پەرۆشن بەدوای سەرکەوتندا، ئەویش لە وەلامدا گوتی: "بەڵێ، هەموو بەیانییەک لەگەڵ خۆتدا بدوێ، ئێمە دەربارەی گرنگی ڕاهێنانی جەستەیی دەدوێین، کە لە خەواڵوویی خەبەرمان دەکاتەوە، کە زۆرێک لە ئێمە لە دەوروبەر پیاسە دەکەن، بەلام ئێمە زیاتر پێویستمان بە ڕاهێنانی باری دەروونی و ڕۆحیانەتە، هەموو بەرەبەیانییەک، بۆ ئەوەی پاڵمان پێوە بنێت بۆ کارکردن، لەبەر ئەوە هەموو ڕۆژێک لەگەڵ خۆت بدوێ."

ئایا ئەگەر ڕۆژانە قسە لەگەڵ خۆت بکەی، گەمژەییە، منداڵکارانەیە و، ڕووکارییە؟ نەخێر، بە پێچەوانەوە، بەڵکو ئەمە کرۆکی دەروونناسییە، "ژیانی ئێمە بریتییە، لەوەی کە بیروبۆچوون و تێڕوانینەکانمان وێنای دەکەن،" ئەم وشانە ئێستایش هەر ڕاستن وەکوو چۆن هەژدە سەدە لەمەوبەر ڕاست و دروست بوون، کاتێک *مارکوس ئۆرێلیەس*، ئەوانەی نووسیووە لە کتێبەکەیدا بەناوی، ڕامانەکان: "ژیانی ئێمە بریتییە لەوەی کە بیروبۆچوون و تێڕوانینەکانمان وێنای دەکەن."

ئەگەر هەموو ڕۆژێک لەگەڵ خۆتدا بدوێیت، ئاوا دەتوانی خۆت بەرەو کەشێک ئاڕاستە بکەی بۆ بیرۆکەی بەختەوەریی و دلێری، بیر و فکری هێز و ئاشتی. بە قسەکردن لەگەڵ خۆتدا دەربارەی ئەو شتانەی کە هەتن بۆ ئەوەی کەسێکی سوپاسگوزار بیت ئەوا دەتوانی هزرت پڕ بکەی بەو بیرۆکانەی کە خۆشی و شادیان لێ دەبارێت.

بە بیرکردنەوە لە شتی دروست، ئەوا دەتوانیت هەر کارێک بوونی هەبێت، کەمتر دزێو و ناخۆش بێت. بەڕێوەبەرەکەت لە تۆی دەوێت، کە حەزت بە کارەکەی خۆت بێت، بەمەیش پارەی زیاتر بەدەست دەهێنیت. بەڵام با ئێمە ئەوە لە بیر بکەین، کە ئاخۆ بەڕێوەبەر چی لە تۆ دەوێت، بەڵکو تەنیا بیر لەوە بکەرەوە، ئەگەر چێژ لە کارەکەت ببینی ئەوا ئەمە چی بۆ تۆ دەستەبەر دەکات.

بیر خۆتی بهێنەوە، کە دەکرێت ئاستی بەختەوەریت دوو ئەوەندە بکات، لە ژیانتدا، چونکە نیوەی ساتەکانی بێداریت لەکاردا بەسەر دەبەیت، خۆ ئەگەر تۆ بەختەوەری لە کارەکەتدا بەدی نەکەیت، ئەوا لە هیچ شوێنێکی دیکە دەستت ناکەوێت و، بەدی ناکەیت. بە بەردەوامی ئەمە بخەوە یادی خۆت، کە چێژ بینین لە کارەکەت، مێشکت لە کەنارەکانی دوودڵی و نیگەرانی دوور دەخاتەوە، دەکرێت هەر لە داهاتوودا، ببێتە مایەی پلە بەرزییت و موچەکەت پێی بەرز ببێتەوە. تەنانەت ئەگەر بەو شێوەیەش نەبێت، تا ئاستێک شەکەتی و هیلاکیت دەڕەوێنێتەوە و یارمەتیدەرت دەبێت، بۆ ئەوەی چێژ لە کاتەکانی دەست بەتاڵیت وەربگریت.

## ڕێگای پێنجەم

### ئایا ئەوەی هەتە، بە یەک ملیۆن دۆلار دەیگۆڕیەوە.

ماوەی چەند ساڵێکە، ***هارۆلد ئەبوت*** دەناسم، لە شاری ویب دەژیا، ئەو پیاوە بەڕێوەبەری محازرەکانم. ڕۆژێکیان من و ئەو لە شاری کانسان یەکترمان بینی و، لەوێشەوە منی برد، بۆ کێڵگەکەی خۆم لە بیڵتۆن میسۆری. لە ڕێگادا، پرسیاری ئەوەم لێی کرد، کە چۆن ئەو خۆی لە دوودڵی بەدوور گرتووە، چیرۆکێکی ئیلهام بەخشی بۆ گێڕامەوە کە هەرگیز ناتوانم لە بیری بکەم.

گوتی: "لەسەر دوودڵی و نیگەرانی ڕاهات بووم، بەڵام لە ڕۆژێکی بەهاری ١٩٣٤دا، لە شاری ویب بە شەقامی ڕۆژئاوای دۆهێرتی شۆڕ دەبوومەوە، دیمەنێکم بینی کە بوویە مایەی نەهێشتنی نیگەرانی و دوودڵی لە ناخی مندا. ئەمە هەمووی لە دە چرکەدا ڕووی دا، بەڵام لە ماوەی ئەو دە چرکەیەدا، بە جۆرێک فێری ژیانکردن بووم، کە لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا فێری نەبووبووم.

ماوەی دوو ساڵ بوو، دوکانێکی سەوزە و میوەم بەڕێوەدەبرد، لە شاری ویب، نەک هەر تەنیا تەواوی پاشەکەوتەکانم لە دەستدا، بەڵکو لە سەریشی قەرزدار بوومەوە و حەوت دانە ساڵ کارم کرد، بۆ ئەوەی خۆم لەژێر باری ئەو قەرزانەدا دەربکێشم. شەممەی ڕابردوو دوکانەکەم داخست و، بەرەو بانکی بازرگانی و پیشەوەران ملی ڕێگام گرتەبەر بۆ ئەوەی پارە قەرز بکەم، بەمەیش دەمتوانی بچمە شاری کانساس، بەدوای کاردا بگەڕێم.

تەواوی ئازایەتی و باوەڕی خۆمم لەدەست دا، پاشان هەر کتوپڕ بینیم، کە وا پیاوێک بە شەقامەکەدا دێتە خوارەوە، کە هەردوو لاقی نەبوو. لەسەر کورسییەکی ڕەوڕەوە دانیشتبوو، بە درێژایی

شــەقامەکە بە هــۆی دوو دارەوە، کە بە دەســتییەوە گرتبــوون خــۆی پاڵی بە خۆیەوە دەنا.

هەر کە شــەقامەکەی بــڕی، چــاوم پێــی کەوت، خەریــک بــوو چەنــد ئینجێک خۆی بەرز بکاتەوە بۆ ئەوەی بگاتە ســەر لێواری شۆستەکە. هەر کە خەریکــی ئەمکــارەی بــوو، چاوەکــانی بەرچــاوی مــن کەوتــن. بەبــزەیەکەوە ســڵاوی لــێ کــردم، 'بەیانیــت بــاش، گەورەم. بەیــانییەکی خۆشە، وانییە؟'

کاتێک منیش بە پێوە وەستابووم و سەیری ئەو پیاوەم دەکرد، ئەو کاتە درکم کرد، کە من چەندێک دەوڵەمەندم، دوو لاقم هەیە، دەمتوانی بڕۆم، شەرم دایگرتم و بەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە، بە خۆمم گوت، ئەگەر ئەو پیاوە دڵخۆش بێت، شادمان بێت، باوەڕی بە خۆی هەبێت، بەبــێ هەبــوونی لاق، ئەوا منــیش، بە دوو لاقەوە دەتــوانم دڵخــۆش و شادمان بم.

وا بڕیــار بــوو، کە بــڕی ســەد دۆلار قەرز بــکەم بەڵام ئێســتا خیــرەت گرتمی و داوای دوو سەد دۆلام کرد. دەمیوست وا نیشان بدەم، کە دەمەوێــت بچــمە کانســاس و لەوێ کارێــک بەدەســت بــخەم بەڵام وا ئێســتا بە هەســتێکی پــڕ لە بــاوەڕەوە دەڵــێم، کە وا دەچــم بــۆ شــاری کانســان بــۆ ئەوەی کارێــک بە دەســت بهێــنم، پــارەکەم قەرز کــرد و، کارەکەیشم دەستکەوت.

ئەم وشــانەی خــوارەوەم لەســەر ئــاوێنەی گەرمــاوەکەم نەخشــاندن و هەموو بەیانییەک لە کاتی ڕیشتاشیندا دەمخوێندنەوە:

'دڵتەنگ و غەمبار بووم، بەوەی پێڵاوم نەبوو، تــا ئەو ســاتەی پیــاوێکم لەسەر شەقام بینی هەر لاقی نەبوون.'"

جارێکیان، لە *ئێدی ریکنباکەر*م پرسی، ئاخۆ باشترین وانە چی بووە، کە فێری بووە بە هۆی مانەوەی لەسەر بەلەمێک لەگەڵ هاوڕێکانی بۆ ماوەی بیست و یەک ڕۆژ کە لە زەریای هێمندا ون ببوو.

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: "باشترین وانە، کە لەو ئەزموونکردنەدا فێری بووم ئەوەیە، ئەگەر ئاوێکی سازگارت لابێ بۆ ئەوەی بیخۆیەوە و خواردنیشت هەبێت بۆ ئەوەی بیخۆی ئەوا تۆ هەرگیز نابێت بێزاری و گلەی و گازندە لەبەرانبەر هیچ شتێکدا دەرببڕیت."

ڕۆژنامەی تایم، بابەتێکی بڵاو کردەوە، دەربارەی سەرکردەیەکی سەربازی، کە لە گادالکەناڵ بریندار ببوو، پارچەیەک بەرقورگی کەوتبوو، خوێنی پێیەوە دیار بوو، کاتێک دکتۆرەکەی شتی دەنووسی، لێی پرسی؛ "ئایا من دەژیم؟"

دکتۆرەکەیش وەڵامی دایەوە؛ "بەڵێ،" شتێکی دیکەی نووسی و نەخۆشەکەیش پرسی؛ "ئایا دەتوانم قسە بکەم؟" دووبارە وەڵامەکە "بەڵێ" بوو. پاشان تێبینییەکەی دیکەی نووسی و، نەخۆشەکە گوتی: "کەوایە چ شتێک بوونی هەیە، کە ببێتە مایەی نیگەرانی من؟"

بۆچی تۆیش، هەر ئێستا ناوەستی و پرسیار لە خۆت ناکەی، "چ شتێک بوونی هەیە، کە دەبێتە مایەی نیگەرانی من؟" دەکرێت لەدوای ئەمە بگەیە ئەو بڕوایەی، کە ئەو شتەی دەبێتە هۆی ڕاڕایی و دوودڵی شتێکی بێبایەخە و گرنگ نەبێت.

نزیکەی، لە سەدا نەوەدی شتەکانی ژیانی ئێمە، ڕاستن و سەدا دەیشیان هەڵەن، ئەگەر ئێمە بمانەوێت دڵخۆش بین، ئەوە دەبێت، لەو سەدا نەوەدە خۆشمان قووڵ بکەینەوە و، ورد بینەوە و ئەو سەدا دەیەیش فەرامۆش بکەین. خۆ ئەگەر بشمانەوێت نیگەران و دوودڵ بین و، دووچاری نەخۆشی گەدە بین، ئەوا ئەوەی لەسەرمانە بیکەین

ئەوەیە، کە تیشک بخەینە سەر ئەو سەدا دەیە و، سەدا نەوەدەکەی پڕ لە جوانی فەرامۆش و ئیهمال بکەین.

وشەکانی "بیر بکەوە و سوپاس گوزار بە" لە زۆربەی کەنیسەکانی کرۆمویڵیەم، هەڵکەندراون لە ئینگلتەرا، ئەو وشانە، دەبێت لەسەر دڵی ئێمەشدا هەڵبکۆڵدرێن، "بیر بکەوە و سوپاسگوزار بە" بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەوە، کە ئێمە هەمانە و دەبێت لەسەریان سوپاس گوزار بین و، سوپاسی خودا بکە، لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە پێی بەخشیووین.

***جۆناسان سویفت*** خاوەنی کتێبی گەشتەکانی گولیڤەر، یەکێک بوو لە هەرە نووسەرەکانی ئەدەبی ئینگلزی، زۆر هەستی بە داخ دەکرد، لەوەی کە لەدایک بووە و هاتۆتە دنیاوە، لە ڕۆژی لەدایک بوونیدا خۆی ڕەش پۆش دەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا لە لووتکەی بێ ئومێدیدا بوو، ستایشی هێزی تەندروستی دەکات لە شادمانی و بەختەوەری، ڕایدەگەیەنێت: "باشترین دکتۆرەکانی جیهان، بریتین لە دکتۆر خواردن و دکتۆر هێمن و دکتۆر بەختەوەری."

من و تۆ، دەکرێت هەموو ساتێک سوود لە خزمەتگوزارییەکانی دکتۆری بە ختەوەری وەربگرین، بەوەی کە سەرنجمان چڕ بکەینەوە لەسەر ئەو شتانەی کە هەمانە، شتانێک کە لە گەنجینە ئەفسانەکەی ***عەکی بابا*** زیاترە. ئایا چاوەکانت بۆ یەک بلیۆن دۆلار دەفرۆشیت؟ ئەی لاقەکانت بە چەندێک دەفرۆشیت؟ دەستەکانت؟ دەزگای بیستنت؟ منداڵەکانت؟ خێزانەکەت؟ بەچەندێک دەفرۆشیت. تەواوی ئەو سامانە بەنرخانە کۆ بکەوە، ئەوکاتە درک بەوە دەکەیت، کە هەموو ئەو سامانەی هەتە ناتوانی بیگۆڕیەوە بە سامانی بنەماڵەکانی "ڕۆکفیڵەرز، فۆردز و مۆرگانز."

بەلام ئایا هەمووومان درک بەمە دەکەین و، بەرز دەینرخێنین؟ ئەها، نەخێر، هەر وەکوو ***شۆپێنهاوەر*** دەڵێت: "بە دەگمەن بیر لەو شتانە

دەکەینەوە کە هەمانە، وەلێ هەردەم بیر لەو شتانە دەکەینەوە کە نیمانە." ئەمەیش گەورەترین تراژیدیای سەر گۆی زەوییە، زیاتر لە هەموو کارەساتەکان و جەنگەکانی مێژوو بووەتە هۆی نانەوەی کڵۆڵی و خەفەتباری.

ئەمەیش وای لە *جۆن پالمەر* کرد کە لە کەسێکی ئاسایی بگۆڕدرێت و ببێت بە کەسێکی تووڕە، بە جۆرێک هەر خەریک بوو ماڵەکەی وێران و خاپوور بکات، باش ئەوە دەزانم، چونکە ئەو خۆی ئەمەی بە من گوت.

بەڕێز *پالمەر* لە پاترسۆن، لە نیو جێرسی دەژیا، گوتی: "بە کورتی، کاتێک لە سوپا گەڕامەوە، دەستم بە کارکردنی خۆم کرد، شەو و ڕۆژ بەجدی و قورسی کارم دەکرد، شتەکان زۆر بە باشی دەچوون بەڕێوە. بەڵام ئەوەندەی نەبرد کێشە و ناڕەحەتییەکان سەریان هەڵدا، هیچم بە دەست نەدەکەوت، لەوە دەترسام دەستبەرداری کارەکەم بم، بە جۆرێک نیگەران بووم، کە لە کەسێکی ئاساییەوە بووم بە کەسێکی تووڕە و بێزار. زۆر ڕووگرژ و تووڕەبووم، نەمزانی چیم بەسەر هات، تەنیا ئەوە نەبێت خەریک بوو ماڵە خۆشەکەیشمی لەسەر دابنێم.

پاشان ڕۆژێکیان، گەنجێکی کەمئەندامی شارەزا، کە کاری بۆ دەکردم گوتی: 'چۆنی، تۆ دەبێت شەرم لە خۆت بکەی، بە جۆرێک ڕێ دەکەیت، وەکوو بڵێی تۆ تاکە کەسێکی لەم جیهانەدا کە کێشە و گرفتت هەیە. وا دابنێ کە تۆ دەبێت دوکانەکەت بۆ ماوەیەک دابخەی، ئەو کاتە چی دەکەیت؟ لەدوای ئەوە دەتوانیت دەست بەکار بیەوە، کاتێک شتەکان دەگەڕێنەوە سەرباری ئاسایی خۆیان، زۆر شتت هەیە بۆ ئەوەی پێیانەوە سوپاس گوزار بیت. لەگەڵ ئەوەیشدا، تۆ هەردەم کەسێکی تووڕەی، کاکە، دەزانی چەندێک خۆزگە دەخوازم، کە لە جێگەی تۆ بوومایە؟ سەیری من بکە، من تەنیا یەک دەستم هەیە و، نیوەی ڕووخساریشم لە دەستداوە، کەچی هێشتا گلەیی و گازندە

ناکەم، ئەگەر تۆیش لەو هەموو سکاڵاکردن و گلەیی و گازندەکردنە واز نەهێنیت ئەوا تۆ نەک تەنیا کارەکەت لە دەست دەدەی، بەڵکو تەندروستیشت لە دەست دەدەی، ماڵەکەشت لە دەست دەدەیت و، هاوڕێکانیشت لە سەری دادەنێیت!''

"ئەم قسانە منیان لە جێگەی خۆم وشک کرد، وایان لێ کردم درک بەوە بکەم، کە چەندێک حاڵم باشە، لەبەر ئەوە بڕیارمدا بگۆڕێم و ببمەوە بە کەسەکەی جاران، هەر وایشم کرد."

هاوڕێیەکی خۆم، لوسیل بلەیک، ئەمەشیان لە کەشێکی پڕ لە تراژیدیا گوزەری دەکرد، بەرلەوەی فێری ئەوە بێت، کە چۆن بە دڵخۆشی بژیت بەدەم ئەو شتانەی کە هەیەتی لەجیاتی ئەوەی نیگەرانی ئەو شتانە بێت کە نیتی.

چەند ساڵێک لەمەوبەر *لوسیل*ـم بینی، کاتێک هەر دووکمان پێکەوە وانەی نووسینی کورتە چیرۆکمان لە زانکۆی کۆڵمبیا لە بەشی ڕۆژنامەگەریدا دەخوێند، چەند ساڵێک لەمەوبەر ئەو ئافرەتە، یەکەمین تاسانی ژیانی بەرکەوتووە. ئەوکاتە لە تۆکسۆن، ئەریزۆنا دەژیان، ئا ئەمە چیرۆکەکەیەتی هەر وەکوو خۆی بۆی گێڕامەوە:

"لەناو سەرقاڵی ژیاندا دەخولامەوە، لە بەشی ئەندامم دەخوێند، لە زانکۆی ئەریزۆنا، بەڕێوەبەری کلینکیش بووم، لەو شارۆچکەدا و، وانەیەکی مۆسیقایشم دەگوتەوە لە دیزێرت ویلۆو ڕانچ، کە تێیدا دەمامەوە. بەشداریم لە ئاهەنگەکان و سەماو، ئەسپسواری دەکرد. بەیانییەکیان، هەر بە تەواوی داڕووخام، دووچاری نەخۆشی دڵ بووم! پزیشک پێی گوتم: "کە دەبێت بۆ یەک ساڵی ڕەبەق بۆ ئەوەی پشوو بدەم دەبێت لە جێگەدا پاڵ بکەوم،" ئەوەندە خیرەتی نەدایە بەر من بۆ ئەوەی بگەمە ئەو بڕوایەی کە دەتوانم دووبارە بە بەهێزی بژیمەوە."

"یەک ساڵی ڕەبەق پاڵ کەوتم لە ناو جێگەدا! بووم بە کەسێکی کەنەفت، دەکرێت هەر بمرم! زۆر ترسام! ئەم شتانە بۆچی بەسەر مندا دێن؟ دەبێت چ شتێکم کردبێت، کە شیاوی ئەمە بم؟ گریام و ناڵەم دەکرد. تووڕە بووم و یاخی بووم. بەڵام هەر وەکوو پزیشک ئامۆژگاری کردم، چوومە ناو جێگەوە."

دراوسێیەکی خۆم، بەڕێز ***ڕودۆلف*** کەسێکی فەننان بوو، پێی گوتم: "وا بیر دەکەیەوە کە ساڵێک مانەوە لەناو جێگەدا تراژیدیایە، بەڵام بەم شێوەیە نابێت، کاتت لە بەردەستدا دەبێت بۆ ئەوەی بیر بکەیەوە و، ئاشنای خودی خۆت بیت. لەو چەند مانگەی داهاتوودا لایەنی ڕۆحیانەتیت بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت کە لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا نەتوانیووە پێی پێبگەیت." بەم قسانە هێمن بوومەوە و، هەوڵم دا هەستێکی بەهادار بۆ کەوتنم لەناو جێگەدا بەدی بکەم. دەستم بەخوێندەوەی کتێبت کرد، لەبارەی ئیلهامەوە.

ڕۆژێکیان گوێم لە بێژەرێکی ڕادیۆ بوو، کە دەیگوت: "تۆ تەنیا دەتوانیت ئەوە دەرببڕیت، کە لە ئەندێشە و هەستەکاندا ڕێ دەکات،" پێشتر چەندین جار گوێ بیستی ئەو جۆرە وشانە بووم، بەڵام وا ئێستا کەوتنە ناو ناخی منەوە و، ڕەگیان داکوتا. بۆیە بڕیارمدا تەنیا بیر لەو بیرۆکانە بکەمەوە، کە خۆم دەمەوێت بە دەمیانەوە بژیم: بیرۆکەکانی شادمانی بەختەوەری، تەندروستی، هەموو بەیانییەک خۆم ناچار دەکرد، هەر کە خەبەرم دەبوویەوە، بۆ ئەوەی چاوێک بەسەر هەموو ئەو شتانەدا بخشێنمەوە، کە دەبێت پێیانەوە سوپاسگوزار بم.

هەست بە ئازار نەکەم، کچێکی لاو و، جوانکیلەم هەیە، بینایی چاوەکانم، دەزگای بیستنم، مۆسیقایەکی خۆشی سەر ڕادیۆ، هەبوونی کات بۆ خوێندنەوە، خواردنی باش، هاوڕێی باش. هەر زۆر شادمان و دڵخۆش بووم، خەڵکێکی زۆر سەردانیان دەکردم، تا وای لێهات

دکتـۆر تێبینییەکـی هەڵواسـی، کە تەنیـا یەک میـوان دەتوانێت لە یەک کاتدا سەردانم بکات، ئەوەیش لە هەندێک کاتی دیاریکراودا.

"لەو ساتەوە چەندین ساڵ گوزەریان کرد، وا ئێستا ژیانێکی خۆش و چالاک بەڕێ دەکەم. زۆر سوپاسگوزاری، ئەو ساڵەم کە لەناو جێگەدا بەڕێم کرد. پڕ بـایەخترین و بەختەورتـرین سـاڵی ژیـانم بـوو، کە لە ئەریزۆنـا بەڕێم کـرد. تـا ئێسـتایش نەریتـی ژمـاردنی نیعمەتەکـانم لە بەیانییانـدا، لە بیـر نەچـووەتەوە و لەگەڵمـدا مـاوە. ئەمە یەکـێکە لە بە نرخـترین ئەو شـتانەی، کە هەمە. شـەرم لە خـۆم دەکەم، کە هەرگیـز درکم بەو شـتە نەکـردەوە هەتـا ئەو کـاتەی تـرس دایگـرتم نەوەکـوو بمرم."

***لوسیل بلەیکـ***ـی ئـازیزم، دەکـرێ تـۆ درکـی پـێ نەکەی، بەڵام تـۆیش هەمـان وانە فێر بوویت، کە دکتـۆر ***سـامیول جۆنسـن*** دووسـەد سـاڵ لەمەوبەر فێــری بـــوو. "نەریتـــی ڕوانـــین لەلایەنە باشـــەکانی هەر ڕووداوێک لە هەزاران پاوەند بەنرختر و بە بەهاترە."

بۆ زانیاریت، ئەم قسانە لە قووڵایی ناخی کەسێکی کارامە و گەشبین هەڵنەقوڵاون، بەڵکـو لە نـاخی کەسـێکدا، کە بـۆ مـاوەی بیسـت سـاڵی تەمەنی ئاشنای شەکەتی و تووڕەی و برسیەتی ببوو، تـا دواجـار بـوو بە یەکێــک لە شـــکۆمەندترین نووســـەرەکانی ســـەردەمی خـــۆیی و قسەزانێکی کارامەی سەردەمی خۆی.

***لۆگان پێرساڵ***، دانـایی لە چوارچێوەی کۆمەڵە وشـەیەکدا بەرجەسـتە کـردووە و دەڵێـت: "دوو شـــت بوونیـــان هەیە، کە دەبێـت لە ژیانــدا ئامانجیـــان بـــۆ بخوازرێـت، یەکەمیـــان، ئەوە بەدەســت بخەیـت، کە دەتەوێـت. دووەمیـان، چێـژی لـێ ببینـی. تەنیـا دانـاترین و ژیرتـرین مرۆڤ دەتوانێت ئەوەی دووەم بە دەست بهێنێت."

ئایا دەتەوێت بزانی کە قاپشۆردن لە چێشتخانەدا دەتوانرێت بکرێت بە ئەزموون؟ ئەگەر دەتەوێت، ئەوا کتێبێک دەربارەی ئازایەتی و دلێری بخوێنەوە، لە نووسینی *بۆرگیلد داهل* بە ناوی "دەمەوێت ببینم."

ئەم کتێبە لەلایە ئافرەتێکەوە نووسراوە، کە بۆ ماوەی نیو سەدا کوێر بووە، دەنووسێت، "تەنیا یەک چاوم هەبووە، وەلێ نەم دەتوانی بە تەواوی بەو چاوەش ببینم، لەبەر ئەوە دەبوایە کتێبەکە لە نزیک چاومەوە بگرم و بە یەک چاو هەوڵی خوێندنەوەم دەدا."

لەگەڵ ئەوەیشدا، ڕەدی کردووە، کە خەڵک بەزەیی پێ دابێتەوە، ڕەدی کردەوە بە کەسێکی جیاواز هەژمار بکرێت و، لێی بنواڕدرێت، کاتێ منداڵ بوو، دەیویست یاری خەتخەتێن لەگەڵ منداڵەکانی دیکەدا بکات، وەلێ نەیدەتوانی خەتەکانی سەر زەوی ببینێت، لەبەر ئەوە لەدوای ئەوەی منداڵەکانی دیکە دەچوونەوە ماڵەوە، دەکەوتە سەر زەوی و چاوی بەسەر خەتەکاندا دەکێشا و هەموویانی لەبەر دەکرد، کە هاوڕێکانی یاریان لەسەر دەکرد، ئیتر هەر زوو لەو یاریەدا شارەزایی پەیدا کرد. لە ماڵەوەیش دەیخوێندەوە، کتێبێکی گەورەی لە ڕووخساری نزیک دەکردەوە بە جۆرێک پێڵوەکانی بەر پەڕەکانی کتێبەکە دەکەوتن. کەچی لە ئەنجامی ئەمەدا، دوو بڕوانامەی زانکۆی بەدەست هێنا: "یەکێکیان لە زانکۆی مینیسۆتا، ئەوی دیکەش لە بواری فەننان لە زانکۆی کۆلۆمبیا."

لە گوندێکی بچکۆلانە، لە توین ڤالی، مینیسۆتا، دەستی بە وانە گوتنەوە کرد، هەتا دواجار بوو بە پرۆفیسۆر لە بواری ڕۆژنامەگەریی و ئەدەب لە کۆلێژی ئۆگستانا لە سیۆکس فۆلز، باشووری داکۆتا. بۆ ماوەی سیانزە ساڵ لەوێ وانەی دەگوتەوە، کۆڕی لەبەردەم یانەکانی ئافرەتاندا پێشکەش دەکرد و، لەسەر ڕادیۆ قسەی دەکرد دەربارەی کتێب و نووسەران. دەنووسێت: "لە بیر و

زەینمدا، هەمیشە ترسێکم هەبوو، ترسی لە دەستدانی بینایی چاوەکانم بە تەواوی، بۆ ئەوەی بەسەر ئەوەدا زاڵ بم، تێڕوانین و دیدگایەکی شادمان و خۆشم بۆ خۆم فەراهەم هێنا."

دواتر، لە ساڵی ١٩٤٣دا کاتێک تەمەنی پەنجا و دوو ساڵ بوو، شتێکی نائاسایی ڕووی دا: نەشتەرگەری لە کلینکی بەناوبانگی مایۆ، بۆ کرا و دەیتوانی چل ئەوەندەی جارانی پێشوو ببینێت.

جیهانێکی تازە و پڕ لە خۆشی و شادی لە بەردەمی ئەودا کرایەوە، هەر هەستی دەکرد، کە قاپ شۆردنی ناو چێشتخانەش هەر خۆشی و شادییە. بەو کەفەیش گاڵتەم دەکرد، کە لە مەغسەلەی قاپەکاندا دروست ببوو، دەنووسێت: "دەستم پڕ دەکرد لە گلۆپی سابونەکە و، لەبەر ڕۆشنایییەکە سەیرم دەکرد، لە هەر یەکێک لە ئەوانەدا دەمتوانی هەموو ڕەنگە جوانەکانی پەلکەزێڕینە ببینم."

کاتێکیش لە پەنجەرەی چێشتخانەکەوە، سەیری دەرەوەم دەکرد، چۆلەکەم بە دوو باڵی خۆڵەمێشییەوە دەبینی کە بەناو بەفرە بارێوەکەدا دەفڕی.

ئەم جۆرە شەیداییەی، لە سەیرکردنی بڵقی سابوون و چۆلەکە بەدی کرد و بەدەم ئەو وشانەوە کتێبەکەی دادەخست و چرپەی دەکرد: "ئەی خودایە گیان، ئەی خودای ئەرز و ئاسمان، سوپاسی تۆ دەکەم، سوپاسگوزاری تۆم."

بیر لەوە بکەوە، کە سوپاسی خودا بکەیت، چونکە تۆ دەتوانیت قاپ بشۆیت و پەلکەزێڕینە ببینی لە بڵقی کەفەکەدا و چۆلەکە ببینیت، کەوا لەناو بەفردا لەشەقەی باڵ دەدات!

من و تۆ، دەبێت شەرم لە خۆمان بکەین، تەواوی ژیانمان لە کەشێکی جوان و ڕازاوەدا ژیانمان کردووە، بەڵام کوێر بووین بۆ ئەوەی بیبینین و چێژی لێ ببینین.

ئەگەر دەتەوێت لە دوودڵی بوەستی و دەست بە ژیان بکەی، لە یادت بێت:

**"نیعمەتەکان بژمێرە، نەک ناڕەحەتیی و ناخۆشیەکانت."**

## ڕێگای شەشەم

## لە بیرت بێت، هیچ کەسێک شەق لە سەگی تۆپیو هەڵنادات

لە ساڵی ١٩٢٩دا، ڕوداوێک ڕووی دا، کە بوویە هۆی نانەوەی هەستی نەتەوەیی لە نێوەندەکانی خوێندندا. پیاوانی ڕۆشنبیر، لە سەرتاپای ئەمریکا بەرەو شیکاگۆ ملی ڕێگایان گرتەبەر، بۆ ئەوەی شایەتی ئەو ڕووداوە بدەن. چەند ساڵێک لەمەوبەر، گەنجێک بە ناوی ***ڕۆبێرت ماچینز*** لە "یەڵ" بە شێوەی خۆی کاری دەکرد، وەکوو گارسۆن، دارتاش و مامۆستایەتی.

ئێستایش، لەدوای تێپەڕبوونی هەشت ساڵ، ئەم کابرایە ڕێوڕەسمی بۆ ئامادەکراوە وەکوو چوارەم سەرکردەی دەوڵەمەندترین زانکۆ، لە ئەمریکادا، ئەو زانکۆیەیش شیکاگۆ بوو. ئێ تەمەنی چەند ساڵ بوو؟ تەنیا سی ساڵ بوو. شتێکی باوەڕپێنەکراوە! ڕۆشنبیرە بە تەمەنەکان سەریان ڕادەوەشاند لە ئاست ئەم مەسەلەیەدا. بارانی ڕەخنە لە هەموو لایەکەوە هاوشێوەی باران بەسەریدا دەباری، دەیان گوت ئەو کابرایە ئەمە و ئەوەیە، زۆر منداڵە و بێئەزموونە و دیدگا و تیڕوانینەکانی زۆر نامەعقولن، بە جۆرێک تەنانەت ڕۆژنامەکانیش خۆیان خستە پاڵ ئەو هێرشەوە.

لەو ڕۆژەی، کە ڕێڕ و ڕەسمی بۆ ئامادە کرا، هاوڕێیەکی، بە باوکی ***ڕۆبیرت مایناردز ماچنزی*** گوت: "ئەم بەرەبەیانییە زۆر سەرسام بووم بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەک، کە زۆر بە توندی ڕەخنەی لە کوڕەکەت دەگرت."

***ماچنزی*** بە تەمەنیش، وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، زۆر توندوتیژ بوون، بەڵام ئەوەیشت لە بیر بێت کە کەس شەق لە سەگی تۆپیو نادات."

بەڵێ، هەتا سەگە زیاتر گرنگ و باش بێت، ئەوا زیاتر خەڵک حەز دەکات شەقی لێ بدەن. شازادەی ***وێلز***، کە دواتر بوو بە ***ئێدواردی هەشتەم***، کە لە کۆلێژی دارماوسی دەخوێند لە دیڤۆنشایەر لەو کاتەدا کۆلێژێک کە هاوتای کۆلێژی دەریاوانی ئەناپۆلیسە. شازدە تەمەنی چواردە ساڵان بوو، ڕۆژێکیان یەکێک لە ئەفسەرەکانی دەریاوانی بینی وا شازادە دەگریت، لێی پرسی ئاخۆ کێشەی چییە. سەرەتا شازادە ڕەتی کردووە هیچ قسەیەک بکات، بەڵام دواجار ئەو ڕاستییەی قبوڵ کرد: کە قوتابیەکانی دەریاوانی شەقیان لێداوە، فەرماندەی زانکۆ منداڵەکانی کۆ کردەوە و بۆی ڕوونکردنەوە، کە شازادە هیچ گلەیی و گازندەکی نییە دەربارەی ئەوان بەڵام تەنیا دەیویست ئەوە بزانێت، کە بۆچی بەم شێوە خراپە لە ئەویان داوە.

لەدوای هێنان و بردن، ئیتر قوتابییەکان دانیان بەوەدا نا، کە کاتێک ئەوان خۆیان بوون بە کاپتن و فەرماندە لە هێزی دەریایی پاشادا، دەیانویست بۆ ئەو کاتە خیرەتی ئەوەیان هەبێت کە بڵێن، کاتی خۆی، شەقمان لە پاشا داوە!

لەبەر ئەوە، کاتێ تۆ شەقت لێدرا و ڕەخنەت لێ گیرا، ئەوا لە بیرت بێت، کە هۆکاری ئەمە ئەوەیە، کە کردنی ئەم کارە هەستی گرنگی بۆ کەسی ڕەخنەگر و شەق وەشێن فەراهەم دەهێنێت. زۆر جار مانای ئەوەیە، کە تۆ وا شتێک بە دەست دەهێنیت و جێگەی سەرنج و بایەخی.

زۆربەی خەڵک، کاتێک ڕەخنە، لە کەسانی باشتر لە خۆیان دەگرن، یان ڕەخنە لە کەسانی سەرکەتووتر لە خۆیان دەگرن، هەست بە قەناعەت دەکەن. بۆ نموونە کاتێک ئەم بەشەم دەنووسی، نامەیەکم پێ گەیشت لەلایەن خاتوونێک کە تێیدا بە توندی ڕەخنەی لە ***ولیەم بوس*** دەمەزرێنەری سوپاسی ڕزگاری دەگرت، بەرلەوەی ئەم نامەیەم پێ بگات، خۆم دەست خۆشیم لەو پیاوە کردبوو، لەبەر ئەوە ئەو

ئافرەتە لە نامەیەکدا بۆی نووسیم، دەیگوت کە ژەنەڕاڵ ***ولیەم*** هەشت ملیۆن دۆلاری دزیووە، کە کۆ کرابوویەوە بۆ ئەوەی یارمەتی خەڵکی هەژاری پێ بدات. بێگومان، ئەو تۆمەتبارکردنەوە زۆر هیچوپوچ بوو. بەلام ئەم ئافرەتە وێلی ڕاستی نەبوو، بەڵکو بەدوای جۆرێک لە قەناعەتدا دەگەڕا کە دەیوست لە ڕێگەی شکاندنی کەسێکی دیکەدا پێی بگات، کە لە خۆی باشترە، هەر لەبەر ئەوە نامەکەم فڕێدایە ناو سەبەتەکەوە، سوپاسی خودای گەورەشم کرد کە هاوسەرگیرم لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا نەکردووە. نامەکەی هیچ شتێکی دەربارەی ژەنەڕاڵ بە من نەگووت، بەلام شتگەلێکی زۆری دەربارەی ئافرەتەکە بۆ من بەرجەستە کرد.

***شۆپێنهاوەر***، بە چەند ساڵێک لەمەو بەر گوتوویەتی: "کەسانی نەزان و چەپەڵ، چێژ لە دۆزینەوەی هەڵە و کەموکوڕی دەبین لە کەسانی مەزندا."

یەکێک زۆر بە دەگمەن پێی وایە، کە سەرۆکی "یەڵ" کەسێکی نەزان و چەپەڵ بووبێت؛ لە کاتێکدا سەرۆکی پێشووتری "یەڵ"، "***تیمۆسی دوایت***" چێژێکی زۆری دەبینی لە ڕەخنەگرن لە پیاوێک کە لەسەرۆکایەتی ئەمریکا نزیک دەبوویەوە. سەرۆکی "یەڵ" هۆشداریدا ئەگەر ئەو پیاوە بۆ سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، هەڵبژێردرێت، "ئەوا ئێمە دەشێت ژن و کچەکانمان ببنە قوربانی بەدڕەوشتی و بێشکۆیی؛ ئەمەش کارێکە نەخودا و نە مرۆڤ پێی خۆشە."

ئەمەیش هاوشێوەی تۆمەتبارکردنی ***هیتلەر***ە، وا نییە؟ بەلام بەو شێوەیەیش نییە، چونکە ئەمە ئاڕاستەی ***تۆماس جێفری*** کراوە، کامە ***تۆماس جێفری***یە؟ بێگومان ***تۆماسی نەمر***، دانەری ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، پارێزەری دیموکراسی؟ بەڵێ، لەڕاستیدا، ئەو پیاوە بوو.

دەبێــت، کــام ئەمــریکییە بێــت، کە تۆمەتبــارکراوە بە دووڕوویــی، دەســتبڕیی و، کەمێــک لە بکوژێــک باشــتر بێــت؟ ڕۆژنــامەیەک لە دیمەنێکی کارتۆنیدا ئەمەی بەر جسـتە کردبوو، چەقۆیەکی گەورەیش لەسـەر سـەری ڕاگیـراوە، بـۆ ئەوەی سـەری بیپەڕێنێـت، لەولایشـەوە خەڵـک و جەمـاوەر گـاڵتەی پـێ دەکەن و فیکەیـان بـۆ لێدەدا، هەر کە بەناو شەقامەکاندا ڕێی دەکرد، ئەو پیاوە کێ بوو؟ ئەو کابرایە ***جۆرج واشنتۆن*** بوو.

وەلـێ، ئەم ڕووداوە مـاوەیەکی زۆرە ڕوویـداوە، دەکرێـت سروشـتی مرۆڤ، لەو کاتەوە پەرەی سـەندبێت. بـا ببینین، بـا حـاڵەتی ئەدمیراڵ ***پێــری*** لە بەرچــاو بگــرین، ئەو دۆزەرەوەی کە هەمــوو جیهــانی ڕاچڵەکانـدا لەبەرانـبەر دۆزینەوەی جەمسـەری بەسـتەڵەکی بـاکور لە نیسانی ۱۹۰۹دا ئامانجێکی پێکا، کە بۆ چەندین سـەدە پیاوانی دلێر و نەبەرد لەپێنـاو بە دەسـتهێنانیدا ئازاریـان چەشـت و برسـی بـوون و گیانیان سپارد، بە جۆرێک خۆشی خەریک بوو، لە برسان و سـەرمادا گیـان بسـپێرێت؛ هەشـتدانە لە پەنجەکـانی لاقـی ببوونە سـەهۆڵ، کە دەبــووایە ببــڕێنەوە، بەســـەر تەواوی ئــازار و نارەحەتییەکانـــدا سەرکەوتبوو، هەر پێی وا بوو کە شێت دەبێت.

سـەرکردە دەریاوانەکـان، لە واشـنتۆن، زۆر ڕقیـان لێـی دەبـوویەوە، چونکە ***پێری*** وا ناوبانگی زیـاتر بە دەسـت دەهێنێت و زیـاتر ستایشـی دەکرێت. لەبەر ئەوە بەمە تاوانباریان کرد، کە ئەو پـارە کۆ دەکـاتەوە بەنـاوی دۆزیـنەوەی زانسـتی، دوایـش بە مەبەسـتی گەشـتوگوزار دەچێت بۆ جەمسەری باکور. دەکرێت هەر خـودی خۆشـیان باوەڕیـان بەو جۆرە تۆمەتە کردبێت، چونکە مەحـاڵە، وا لە خەڵـک بکەی بـاوەڕ بە شتێک بکەن کە خۆت باوەڕت پێی نەبێت.

بۆیە، ئەوانە سوور بوون، لەسەر بچووککردنەوە و ڕیسواکردنی *پێری*، بە جۆرێک تەنیا فرمانێکی ڕاستەخۆی سەرۆک *میکینلی* توانی و، وای لە *پێری* کرد درێژە بە پیشەکەی بدات لە جەمسەری باکوردا.

ئایا *پێری* بەو جۆرە دەکەوتە بەرلێشاوی ڕەخنەوە، ئەگەر لە سەر مێزەکەی مابایەوە لە بەشی هێزی دەریایی لە واشنتۆن؟ نەخێر، ئەو، ئەوەندە گرنگ نەدەبوو، کە ئیرەیی پێ ببردرێت.

ژەنەڕاڵ *گرانت* ئەزموونێکی خراپتری لە ئەدمیراڵ *پێری* هەبوو. لە ساڵی ١٨٦٢دا ژەنەڕاڵ *گرانت*، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە دەست هێنا، کە خەڵکی باکور چێژیان لێ دەبینی، سەرکەوتنێک کە لە یەک دوانیوەڕۆدا بەدەست هێنرا. سەرکەوتنێک کە لە شەو و ڕۆژێکدا بوو بە قیبلەگای خەڵک. سەرکەوتنێک کە لە ئەورووپایش دەنگی دایەوە. سەرکەوتنێک کە وای کرد زەنگی کڵێساکان لێ بدرێن، مەشخەڵ لە مەینەوە تاوەکو میسیسیپی هەڵکرابوون. سەربارەی ئەوەیش، لە ماوەی شەش هەفتەدا لەدوای بەدەستخستنی ئەو سەرکەوتنە مەزنەیە -گرانت پاڵەوانی باکور- دەستگیرکراو و، دەست بەسەر سوپاکەیدا گیرا، ئیتر ئەویش لە نائومێدی و بەدبەختییدا دەستی بە گریە و ناڵە کرد.

بۆچی، ژەنەڕاڵ *گرانت*، دەستبەسەر کرا، لە کاتێکدا لە لووتکەی سەرکەوتندا بوو؟ تەنیا لەبەر ئەوەی هەستی ئیرەی و چاوتێبڕینی هێنابووە جۆش، لەلایەن ئەو کەسانەی کە لە خۆی بەرزتر بوون.

ئەگەر بە هۆی ڕەخنەی نادادپەروەرانەوە تووڕە بیت:

**"لەبیرت بێت، ڕەخنەگرتنی نادادپەروەرانە ستایش کردنێکی شاراوەیە. ئەوەیشت لەبیر نەچێت کەس شەق لە سەگی تۆپیو نادات."**

## ڕێگای حەوتەم

### ئەمە بکە و، ڕەخنە ئازارت پێ ناگەیەنێت.

جارێکیان چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ ژەنەڕاڵی گشتی *سمێدلی بەتلەر* هەبوو، *باتلەری* بەتەمەنی دوو چاوتیژە، شەیتانەکەی دۆزەخ! لەبیرتە کێیە؟ یەکێک لە جەنگاوەر و، ژەنەڕاڵەکانی هێزی دەریایی ئەمریکا.

خۆی پێی گوتم، کاتێک لاو بووم، بێئومێدانە تامەزرۆ و، پەرۆشی ناوبانگی بوو، دەیویست لە ناخی هەموو لایەکدا جێگەی خۆی بکاتەوە، لەو ڕۆژانەدا، بچووکترین ڕەخنە دەیگەست و ئازاری پێ دەگەیاند. بەڵام دانی بە ئەوەدا نا، کە خزمەتکردنی بۆ ماوەی سی ساڵ لەناو هێزی دەریایدا، بوویە هۆی ئەوەی، ببێتە پیاوێکی توند، گوتی: "ڕەخنەم لێ دەگیرا و سووکایەتیم پێ دەکرا، وەکوو مار و سەگی هار منیان خستبوویە ژێر لێشاوی ڕەخنەی توندەوە. لەلایەن کەسانی شارەزا و پسپۆڕەوە نەفرەتم لێ دەکرا. قسەی ئەوتۆم پێ دەگوترا، کە لە فەرهەنگی ئینگلیزیدا جێگایان نەدەبوویەوە، ئایا ئەو قسە و ڕەفتارە نەشیاوانە کاریان لە من کرد؟ هههە، کاتێک ئێستا کەسێک دەبینم، کە سووکایەتی و قسەی نەشیاوم پێ دەڵێت، هەر سەریشم ناسووڕێنم بۆ ئەوەی بزانم کێیە قسە دەکات."

دەکرێت خاوەنی دوو چاوەتیژەکە، گرنگی بە ڕەخنەگرتن نەدابێت، بەڵام شتێکی دڵنیایی بوونی هەیە، زۆرێک لە ئێمە ئەو ڕەخنە و، ڕمانەی لە ئێمە دەگرێن بە شتێکی جدی و گرنگیان وەردەگرین، چەند ساڵێک لەمەوبەر، ئەو کاتەم لەبیرە، پەیامنێرێکی سەنی نیو یۆرک هاتە یەکێک لە پۆلەکانمەوە، لەدوای ئەمە سووکایەتی بە خۆم و کارەکەم کردبوو.

ئایا من بەو قسانە تورە بووم؟ ئەم قسانە و سووکایەتییەم بە شتێکی خودی هەژمار کرد، ئیدی پەیوەندیم بە ***گل مۆگزەوە*** کرد، سەرۆکی دەستەی جێبەجێکاری سەن بە شێوەیەکی کرداری داوام لێ کرد، کە گوتارێک بڵاو بکاتەوە و تێیدا ڕاستییەکان بخاتەڕوو لە جیاتی گاڵتەپێکردن، لەو بڕوایەدا بووم، کە ئەو سزایە پڕ بە تاوانەکەی بێت.

ئێستا، وا شەرم لە خۆم دەکەم، کە ئەو شێوازە ڕەفتارم نواندووە، وا درک دەکەم، کە ئەو کەسانەی ئەو ڕۆژنامەیان کڕیووە هەرگیز چاویان بەو گوتارە نەکەوتووە، نیوەی ئەوانەی، کە خوێندویانەتەوە با گاڵتە و شتێکی خۆشیان زانیووە، هەر کەسێکیش بە وردی و درشتی خوێندبێتییەوە ئەوا لەماوەی چەند هەفتیەکدا هەر هیچی بیر نەماوە.

ئێستا وا بیر دەکەمەوە، کە خەڵک نە بیر لە من و نە بیر لە تۆ دەکەنەوە، نە بایەخیش بەوە دەدەن کە ئاخۆ چی دەربارەی ئێمە دەگوترێت، بەڵکو ئەوانە بیر لە خۆیان دەکەنەوە، بەر لە نانی بەیانی، لەدوای نانی بەیانی، هەر لە ئێستاوە تا دە خولەک لە نیوەی شەو دەڕۆن، ئەوانە بیر لە خۆیان دەکەنەوە، بیر لە ژانەسەری خۆیان دەکەنەوە، زۆر زیادترە لەوەی کە بیر لە مەرگی من و تۆ بکەنەوە.

تەنانەت ئەگەر، درۆ و دەلەسەشمان لەسەر بگوترێت، گاڵتەمان پێ بکرێت، لەپشەتەوە خەنجەرمان لێ بدرێت، لەلایەن یەکێک لە باشترین شەش هاوڕێکانمان بخرێنە ناو ڕووبارەوە، ئەوا خۆت سەرقاڵی کەشێک مەکە کە تێیدا هەست بە بەزەیی خودی بکەیت. لەجیاتی ئەوە با ئەوەی بەسەر پێغەمبەر عیسادا هات بیر خۆمانی بخەینەوە، یەکێک لە دوانزە هاوڕێ گیانی بە گیانییەکانی، لەپێناو بڕێک بەرتیلدا، بوو بە کەسێکی ستەمکار.

ئەو بڕە بەرتیلەیش، بە پارەی ئێستا دەکاتە، نۆزدە دۆلار، یەکێکی دیکە لە دوانزە هاوڕێکانی، هەر لەو ساتەی کە عیسا کەوتە ناو

کێشـەوە، بەجێی هێشـت و سـێ دانە جـار دووپـاتی کـردەوە کە هەر عیسـایش ناناسـێت، ئـا ئەمەیە کە بەسـەر پێغەمبەر عیسـادا هـات. بۆ دەبێت من و تۆ چاوەڕێی شتێکی لەوە باشتر بکەین؟

چەند سـاڵێک لەمەوبەر درکم بەوە کرد، کە هەرچەندە نـاتوانم خەڵک لە خۆم بەدوور بگرم لەوەی، کە ڕەخنەی نادادپەروەم لێ بگرن، ئەوا بە دڵنیـاییەوە، دەتـوانم شـتێکی زۆر لەوە گرنگتر بـکەم: خـۆم دەتـوانم بڕیار بدەم، ئاخۆ ئەو ڕەخنەیە کارم تێ دەکات یان نا؟

بـا دەربـارەی ئەمە ڕوون و ڕەوان بـین: مـن هانـت نـادەم، کە هەمـوو جۆرە ڕەخنەیەک فەرامۆش بکەی، بەڵکو دوور لەوە، بەڵکو مـن قسـە دەربارەی پشتگوێخستنی ڕەخـنەی نـا دادپەروەرانە دەکەم. جارێکیـان، لە *ئلینـــۆر ڕۆســـێرڤێلت*ـــم، پرســـی کە چـــۆن لەگەڵ ڕەخـــنەی نـادادپەروەرانە ڕێـی کـردووە، خـوا دەزانێت ئەو بەنـاو ڕەخنەگەلێکی زۆر لەو شـێوەیەدا ڕێـی کـردووە. دەکرێـت زۆر هـاوڕێی دڵسـۆز و نەیـاری تونـدوتیژی هەبووبێـت زیـاتر لە هەر ئـافرەتێکی دیـکە، کە لە کۆشکی سپیدا دەژیان.

خـۆی پێـی گـوتم: کاتێـک منـداڵ بـووم، هەر زۆر شـەرمن بووم، لەوە دەترسام، کە خەڵک دەربارەی مـن دەیـان گـوت، بە جۆرێک لە ڕەخنە دەترسام، تا ڕۆژێک، داوام لە پورم کرد، خوشکی *سیدۆر ڕۆسیڤێلت*، بۆ ئەوەی ئامۆژگاریم بکـات: "پـورێ *بـای*، مـن دەمەوێت ئەمە و ئەوە بکەم، بەڵام زۆر لە ڕەخنە دەترسم."

خوشکی *تیدی ڕۆسیڤێلت* سەیری ڕووخساری کرد و گوتی: "هەرگیـز بێـزار مەبە، بەوەی خەڵـک دەیڵـێن، ئەوەنـدەی کە تـۆ دەزانیـت لە قووڵایی ناختەوە تۆ کەسێکی باشیت." **ئیلینەر ڕۆسیڤێلت** پێی گوتم کە بە چەند سـاڵێک دواتر، ئەو تۆسقاڵە ئامۆژگارییە هەر بوو بە *ڕۆکـی جیبراڵتەر*، کاتێک لە کۆشـکی سـپی بـوو، ئەوەیشـی پێ گوتم کە تـاکە ڕێگـا دەتوانیـت لە هەمـوو ڕەخـنەیەک خـۆت بە دوور بگریـت ئەوەیە

وەکوو پەیکەری چین وا بیت لەسەر بنکی خۆی بوەستێت: "ئەوە بکە کە لە قووڵایی ناختەوە هەست بە باشی و گونجاوی دەکەیت، جا بە هەر شێوەیەک ڕەخنەت لێ بگیرێت، بە هەر حاڵ ئەگەر بیکەی هەر نەفرەتت لێ دەکرێت و، هەر نەشیکەیت هەر نەفرەتت لێ دەکرێت،" ئا ئەمە ئامۆژگاری ئەوە.

کاتێ، *ماتیو سی برۆش-ی* کۆچکردوو، سەرۆکی دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتی ئەمریکی بوو، لێم پرسی ئاخۆ هیچ جار هەبووە، کەسێکی هەستیار بیت لەبەردەم ڕەخنەدا، ئەویش وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، کەسێکی زۆر هەستیار بووم، لە سەرەتای ڕۆژانی لاویمەوە، دەمویست تەواوی کارمەندەکانی ڕێکخراوەکە بە جۆرێک بیر بکەنەوە، کە من کەسێکی کامڵم. خۆ ئەگەر وایشیان بیر نەکردبایەوە، ئەوا دەبوویە مایەی نیگەرانی من. بە جۆرێک هەر هەوڵم دەدا کە ئەو کەسانە قایل بکەم، کە لە دژی من بوون، بەڵام هەر کە لە ڕازیکردنی کەسێک لێ دەبوومەوە، کەسێکی دیکە لەو سەرەوە تووڕە دەبوو، کێشەکەم لەگەڵ ئەوەشیان چارەسەر دەکرد و لەولاوە پرتەوبۆڵەی کەسێکی دیکە سەری هەڵدەدا."

لەبەر ئەوە بۆم دەرکەوت هەتاوەکو زیاتر سارێژی برینەکان بکەم و، هێمن بم لەپێناو ئەوەی لە ڕەخنەی خودی دروو بکەومەوە ئەوا زیاتر ژمارەی نەیارەکەم زیاد دەکەن. بۆیە بۆ دواجار بە خۆمم گوت: "ئەگەر سەری خۆشت لەناو قەرەباڵغیدا بەرز بکەیەوە، ئەوا ڕەخنەی تێ دەگیرێت. کەوایە ئەم بیرۆکەیە لە گوێ بگرە." کە بە شێوەیەکی ئێجاگار زۆر یارمەتی منی داوە، لەو کاتەوە، ئەوەم کرد، بە یاسا بۆ ئەوەی باشترین هەوڵی خۆم بدەم کە لە دەستم دێت و، پاشان چەترە کۆنەکەم بە دەستەوە بگرم، بۆ ئەوەی ڕێگری لە بارانی ڕەخنە بکەم نە چێتە ملمەوە.

***دیمز تایلەر*** زیاتر لەمە قووڵ دەبێتەوە: لەبەردەم خەڵکدا ئەو ڕێگەی دەدا بارانی ڕاخنە بڕژێتە ملیەوە و پێکەنینێکی باشی بە دەمیەوە دەکرد. لە دوانیوەڕۆی ڕۆژانەی شەممەدا، کاتێک بەرنامەی کۆنسێرتی، نیۆرۆکی فیلهارمۆنیکی سیمپۆنی لەسەر ڕادیۆ پێشکەش دەکرد، ئافرەتێکیان نامەیەی بۆ نووسی و بە کەسێکی "درۆزن، ناپاک و گەوج و مار" هەژماری کرد. بەڕێز ***تایلەر*** لە کتێبەکەیدا بەناوی "پیاوان و مۆسیقا" دەڵێت: "گومانم هەیە لەوەی، کە ئەو ئافرەتە هیچ گرنگی بە قسەکانی من نەداوە."

لە ڕۆژی یەکشەممەی داهاتوودا، لەسەر ڕادیۆ، بەڕێز ***تایلەر*** نامەکەی خوێندەوە، کە ملیۆنان کەس گوێی لێ گرتبوو، لەدوای چەند ڕۆژێکی کەم لەلایەن هەمان خانمەوە نامەیەکی دیکەی پێگەیشت، لە نامەکەیدا هەمان دیدگا نەگۆڕاوەکەی خۆی بەرجەستە کردبوو، بەڕێز ***تایلەر*** دەڵێت، هێشتا من دۆرزن و ناپاک و مار و گەوج بووم،" ئێمە دەبێت ڕێز لەو پیاوە بگرین، کە بەو شێوەیە لەژێر بارانی ڕەخنەدا خۆی ڕادەگرێت، هێمن و لەسەرخۆیی، ئارامی هەستی گاڵتەوگەپی جێگەی ڕێزلێنانن.

کاتێک ***چارلز شواب***، قسەی بۆ قوتابیان دەکرد لە پرینسیتۆن، دانی بە ئەوەدا نا، کە یەکێک لە گرنگترین وانەکانی ژیانی کە فێری بووە لەلایەن پیرە پیاوێکی ئەڵمانی، کە لە کارگەی پۆڵاسازی ***شواب***دا کاری دەکرد، ئەوە بوو ئەو پیرە پیاوە دووچاری دەمەتەقێیەک بوو لەگەڵ کرێکارەکانی دیکەدا و ئەوانیش فڕێیان دایە ناو ڕووبارەوە.

بەڕێز ***شواب*** دەڵێت: "کاتێک ئەو پیرە پیاوە هاتە ناو نووسینگەکەمەوە، هەموو گیانی ئاو و قوڕاو بوو، پێم گوت کە ئاخۆ چی بەرانبەر بە ئەو پیاوانە کردووە و ئەوانیش خستویانەتە ناو ڕووبارەوە، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: 'تەنیا پێکەنیووم.'"

بەڕێـز ***شـواب*** گـوتی: "کە ئەو وشـانەی، ئەو پیـاوە ئەڵمـانییە بە تەمەنەی، کردوون بە دروشم، 'تەنیا پێ بکەنە.'"

ئەو دروشـمە، بە تـایبەتی باشـە، ئەگەر تـۆ قوربـانی دەسـتی ڕەخنەیەکی نادادپەروەربیت، دەتوانیت وەڵامی ئەو کەسە بدەیەوە، کە ڕەخنەو تێ دەگرێت بەڵام تاکە شتێک، کە بیڵێی ئەوەیە تەنیا پێ بکەنە؟"

***لینکولن*** خەریکبوو بڕووخێت، لەژێر باری شەڕی ناوخۆدا، ئەگەر فێر نەبوایە چۆن وەڵامی ڕەخنەی توند و تاڵ بداتەوە، کە تێی دەگیران. شێوازی ئەو لەبەرانبەر وەڵامدانەوەی ئەو جۆرە ڕەخنانە هەر بوون بە دروشمێکی ئەدەبی کۆن.

ژەنەڕاڵ ***ماکئاسەر*** نوسـخەیەکی لەو دروشـمە لە نوسـینگەکەیدا، لەمـاوەی جەنگـدا هەڵواسـیبوو، ***وینسـتۆن چێرچـڵ***، ئەویـش نوسـخەیەکی لە هەمـان دروشـم، لەنـاو چوارچێوەیەک گرتبـوو لە چارویێڵ، هەڵواسیبوو.

ئەمە بەم شـێوەیە ڕێ دەکـات: "ئەگەر هەوڵ بـدەم بخـوێنمەوە و، کەمتـر وەڵام بـدەمەوە، لە وەڵامـی هەمـوو ئەو هێرشـانەی، کە دەکرێنە سـەرم، ئەوا ئەم دوکـانە دەکرێـت بـۆ هەر کـارێکی دیکە دابخرێـت، باشـترین هەوڵـی خـۆم دەدەم و دەزانـم چـۆن وایـش دەکەم، باشـترین هەوڵ، کە لە دەسـتم دێـت، مەبەسـتم ئەوەیە، تـا دواجار هەوڵی بەردەوام بوون دەدەم. ئەگەر ئەنجامەکەی کـارێکی باشـم بە ڕوودا وەلا بکـات، ئەوا هەرچییەک دەربـارەم دەگوترێـت هـیچ بەهـا و بـایەخێکی نییە و گرنـگ نییە. خۆ ئەگەر بە خـراپە و هەڵە بەسەرمدا شکایەوە، ئەوا دە دانە فریشتەش سوێند بخۆن، کە کارێکی باشـم کردووە ئەوا هەر هیچە و، سـوودێکی نابێت و هـیچ جیاوازیەک نانێتەوە."

کاتێک تۆ و من بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە ڕەخنەمان لێگیرا، با تەنیا ئەوەمان لە بیر بێت:

**"باشترین هەوڵی خۆت بدە، ئینجا چەترە کۆنەکەت بگرە بە دەستەوە، بۆ ئەوەی ڕێگری لە بارانی ڕەخنە بگرێت نەچێتە ملتەوە."**

# بەشی دووەم

## تەکنیکە سەرەکییەکانی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا

چـۆن هـاوڕێ پەیـدا دەکەیـت و دەچیـیە دڵـی خەڵـکەوە، کتێبـێکە دەربـارەی پەیوەنـدییە مرۆییەکـان، سـەبارەت بە هەڵسـوکەوتکردن و، ڕێکـردن لەگەڵ خەڵکیـدا، لەبەرانـبەر هەبـوونی پێویسـتی دۆسـت و هاوڕێ تا ژیانێکی تەواو خۆش بەڕێ بکەیت.

بەرگریکـردن، لە هەسـتی ڕەخنەگـرتن و، بەدەستخسـتنی نەریتـی سـوپاس و ستایشـکردن و، بەرزنرخاندنی ڕاسـتگۆیانە، زیـاتر لە هەر شـتێکی دیکە خەڵک پێیـانەوە کاریگەریـان دەبێت بۆ ئەوەی ئێمەیـان خۆش بوێت. هەمان شتیش ئێمە دڵخـۆش دەکەن لە جیهاندا، کە ژیـان و مـاڵێکی خۆشمان بۆ دەسـتەبەر دەکـات و پێداویسـتی یەکەمـی هەر پیاو و ئافرەتێکە.

## تەکنیکی یەکەم

### ئەگەر دەتەوێت هەنگوین کۆ بکەیەوە، شانەی هەنگەکە تێک مەدە

لە ٧ی ئازاری ١٩٣١دا شاری نیۆرک گەورەترین ڕاوەدونانی بەخۆیەوە بینی، لەدوای چەند هەفتەیەک گەڕان و سوڕان، *کراولی* ناسراو بە "جووت دەمانچە" کاکی بکوژ، پیاوی دەمانچە هەڵگرتوو، کە نە دەیخواردەوە و نە جگەرەشی دەکێشا، لە کەنار دەریا بوو و، لە باڵەخانەی خۆشەویستەکەیدا و، لە شەقامی ویست ئێند، دەستگیرکرا.

سەدوپەنجا پۆلیس، گەمارۆی خانووەکەیاندا و، هەوڵیاندا سەربانی خانووەکە کون بکەن و، گازی فرمێسک ڕێژی لێوە بکەنە ناوەوە. لەدوای ئەوە ئاراستەی چەکەکانیشیان کردبوویە بیناکانی دەوروبەریش، لەماوەی زیاتر لە یەک کاتژمێر، جوانترین ناوچەی شاری نیۆرک بوو بە ئامانجی لولەی تفەنگەکان و، کراولیش خۆی لە پشت کورسییەکەوە حەشار دابوو، بەردەوام تەقەی لە پیاوانی پۆلیس دەکرد. دەهەزار کەس سەیری ئەو جەنگەیان دەکرد و، هەرگیز شتێکی لەم شێوەیە، لەسەر شەقامەکانی شاری نیۆرکدا ڕووی نەدابوو.

کاتێک *کراولی* دەستگیر کرا، مفەووەزی پۆلیس *ئی. پی مەلرۆنی* ڕایگەیاندا، *کراولی*ی ناوسراو بە جووت دەمانچە، یەکێکە لە هەرە تاوانبارە ترسناکەکان، کە مێژووی نیو یۆرک ڕووبەڕووی بووەتەوە.

بەلام، ئایا *کراولی* بەچی خۆی هەژمار دەکرد؟ ئێمە دەزانین، چونکە کاتێک پۆلیس بەرەو باڵەخانەکە تەقەی دەکرد، *کراولی*یش نامەیەکی نووسیبوو "بۆ هەموو ئەوانەی پەیوەندیدارن بە باسەکەوە،" لە ساتە وەختی نووسینی ئەو نامەیەدا، خوێنی برینەکانی جۆگەلەی بەستبوو

و دەتکـایە سـەر پەڕەکە، لەم نـامەیەدا کراولـی دەڵێـت: "لەژێـر چاکەتەکەمدا، دڵێکی مانـدوو هەیە، بەڵام دڵێکی میهرەبـان، دڵێک کە ئازاری هیچ کەسێک نادات."

ماوەیەکی کەم بەر لە ڕوودانی ئەمە، کراولی لەگەڵ کچە هاوڕێکەیدا، لە ئاهەنگ بوو لەسەر ڕێگەی لۆنگ ئایلەند. کتوپڕ پۆلیس ڕۆیشتە لای ئۆتۆمبێلەکەی و گوتی: "مۆڵەتی شۆفێرییەکەتم نیشان بدە."

هەر بەبێ ئەوەی، ***کراولـی*** یەک تـاکە وشـە بڵێـت، دەمـانچەکەی دەرکێشـاو، پۆلیسـەکەی گوللەبـاران کـرد. لەدوای ئەوەی پۆلیسـەکە دەکەوێتە سەر زەوی و دەمرێت، ***کراولی*** لە ئۆتۆمبێلەکەی دادەبەزێت و، دەمـانچەی پۆلیسـەکە هەڵـدەگرێت و، چەنـد گـوللەیەکی دیـکە بە تەرمەکەوە دەنێـت. ئەمەیـش ئەو بکـوژەیە کە، دەڵێـت: "لەژێـر چاکەتەکەمدا، دڵێکی مانـدوو هەیە، بەڵام دڵێکی میهرەبـان، دڵێک کە ئازاری هیچ کەسێک نادات."

سـزای مەرگ، بە هـۆی کورسـییەکی کارەبـاییەوە بەسـەر ***کراولـی***ـدا سـەپێندرا، کـاتێکیش گەیشـتە ئەو شـوێنەی، کە سـزای مەرگـی تێدا جێبەجێ دەکرا، لە سـینگ سـینگ، ئایا ***کراولی*** گوتی: "ئەوەی بەسـەر مندا هاتووە، لە ئەنجامی کوشـت و بڕینی خەڵکەوەیە؟" نەخێر بەڵکو گوتی: "ئەوەی کە بە سەرم دێت، لە ئەنجامی بەرگریکردن لە خودی خۆمە."

مەبەسـت لە گێـڕانەوەی، ئەم بەسـەرهاتە ئەوەیە: "***کراولـی***، جـووتە دەمـاچە بە دەسـت، لە پـای هـیچ شـتێکدا سـەرکۆنە و لـۆمەی خـۆی نەکرد."

ئایـا ئەم تێڕوانین و جـۆرە بیرکـردنەوەیە، شـتێکی ئاسـاییە، لەنێـوان تاوانبارەکاندا؟ ئەگەر پێت وایە، ئەوا گوێ بۆ ئەمە شل بکە:

"باشترین ساڵەکانی ژیانم بە بەخشینی، خۆشی و شادی لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەسەر بردووە، یارمەتیم داون، بۆ ئەوەی کاتێکی خۆش و باشیان هەبێت، کەچی لەبەرانبەر ئەمەدا، ئەوەی بە دەستی دەهێنم تەنیا سووکایەتی و قسەی ناشیرنە."

ئەمە قسەی ***ئال کاپۆنی***یە. بەڵێ دوژمنی سەرسەخی ئەمریکا و، سەرکردەی بەدترین باند بوو لە شیکاگۆدا. ***ئال کاپۆنی*** هیچ ڕەخنەیەکی لە خۆی نەدەگرت، بەڵکو خۆی بە کەسێکی سوودبەخش هەژمار دەکات، کەچی خۆیشی درک بەوە دەکات، کە کەس ڕێزی ناگرێت و بە هەڵە لێی تێ دەگەن.

***داچ شولترز***، بەر لەوەی لەژێر ئاگربارانی گوللەکانی باندەکەدا بژاکێتەوە، لە نیو یۆرک. ***داچ شولترز***، یەکێک بوو لە بەدکارەکانی نیو یۆرک، لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا وتبووی خۆی وا هەژمار دەکات کە سوودێکی گشتی هەیە، و خۆشی بڕوایی بەوە هەبوو.

دەربارەی ئەم بابەتە، پەیوەندییەکی سەرنجڕاکێشام پەیدا کرد، لەگەڵ ***لویس لاویز*** کە بەرپرسی زیندانی سینگ سینگی بەناوبانگی نیو یۆرک بوو، بۆ ماوەی چەندین ساڵ. دەربارەی ئەم باسە گوتی: "تەنیا ژمارەیەکی کەمی دەستگیرکراوەکانی زیندانی سینگ سینگ خۆیان بە کەسێکی خراپ لە قەڵەم دەدەن، ئەوانیش وەکوو من و تۆ مرۆڤن. ئەو کەشەی کە تێیدا هەن، ڕوونی دەکەنەوە و پاساوی بۆ دەهێننەوە، دەتوانن ئەوەت بۆ ڕوون بکەنەوە، کە لە پای چی میلی تفەنگەکانیان ڕادەکێشن و تەقە دەکەن. زۆرێک لە ئەوانە، هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی لۆژیک و، دانای و نارەوای کردەکانیان پاساو بدەن، بۆ ئەوەی پاساو بۆ کردە ناکۆمەڵایەتییەکانیان بهێننەوە، بە جۆرێک وا دەکەن، کە هەر پێویست نەبێت ئەوانە زیندانیش بکرێن."

ئەگەر ***ئال کاپۆنی***، ***کراولی***، ***داچ شولترز*** و، ئەو پیاو و ئافرەتە نائومێدانەی کە لە پشت دیوارەکانی زیندانەوەن، بۆ هیچ شتێک

خۆیان سەر کۆنە و لۆمەی خۆیان نەکەن لەبەرانبەر کردەوەکانیان، ئەی دەبێت ئەو کەسە ئاساییانە چۆن بن، کە ڕۆژانە ئێمە ڕووبەڕوویان دەبینەوە.

*جۆن واناماکر* جارێکیان دانی بەئەوەدا نا: "سێ ساڵ لەمەوبەر فێر بووم، کە گەمژەییە بۆ ئەوەی سەرزەنشتی خۆت بکەی، چونکە بە جۆرێک سەرقاڵم، لە تواناکانی خۆم بەدەرە، ئەوەیش بزانە، کە خودا تایبەتمەندی زیرەکییەتی بە شێوەیەکی یەکسان دابەش نەکردووە."

*واناماکر*، هەر زوو ئەم وانەیە فێر بوو، بەڵام من وەکوو خودی خۆم، دەبووایە سێ یەکی سەدەیەک لەم جیهانە کۆنەدا بزر بم، بەر لەوەی بۆم ڕوون بێتەوە ئەگەر خەڵک سەدا نەوەدونۆی کارەکانیان هەڵە بن، ئەوا هێشتا ئامادەییان تێدا نییە ڕەخنە لە خۆیان بگرن، لەپای هیچ شتێکدا، جا گرنگ نییە چ هەڵەیەکیان کرد بێت.

ڕەخنەگرتن شتێکی بێ کەڵکە، چونکە مرۆڤ دەخاتە کەشێکی بەرگرییەوە و، عادەتەن وای لێ دەکات پاساو بهێنێتەوە بۆ کارو کردەوەکانی خۆی. ڕەخنەگرتن، شتێکی کوشندەیە، چونکە شکۆی مرۆڤ بریندار دەکات، هەستی گرنگی ئازار دەدات، دەبێتە مایەی نانەوەی بێزاری.

*بی ئێف سکینەر* دەروونناسی بەناوبانگی جیهانی، لە ڕێگەی تاقیکردنەوەکانییەوە ئەوەی سەلماند کە، ئاژەڵێک پاداشت دەکرێت بە نواندنی هەڵسوکەوتێکی باش و جوان و زۆر بە خێرایی فێر دەبێت و، بگرە بە شێوەیەکی کارامە و چووست، وەکوو لە ئاژەڵێک کە سزای دەدرێت لەبەرانبەر نواندنی کارێکی خراپدا. توێژینەوەکانی دواتر، ئەوەیان بەرجەستە کردووە، کە هەمان شتیش بەسەر مرۆڤەکاندا جێبەجێ دەبێت، بە هۆی ڕەخنەگرتنەوە، ئێمە گۆڕانکاری ڕیشەکێش نانێینەوە و، بە زۆی ئازار و جاڕسبوونی لێ دەکەوێتەوە.

*هانس سیلی*، دەروونناسێکی دیکەی بەناوبانگ گوتوویەتی: "ئەوەندەی ئێمە وێڵ و تینووین بەدوای ڕەزامەندیدا، ئەوا ئەوەندە خۆمان مەحکووم دەکەین."

ئەو بێزارییەی، کە لە ڕەخنەگرتنەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەوا دەتوانێت کارمەندەکان، ئەندامانی خێزان، هاوڕێکان بەدخود بکات، هێشتایش کارێکی ئەو تۆ ناکات، دۆخەکە ڕاست بکاتەوە لەو ناڕەزای و گلەییەی لەسەری بەیانکراوە.

*جۆرج بی جۆنستۆن*ـی ئینید، ئۆکلاهۆما، ڕێککخەری سەلامەتییە لە کۆمپانیایەکی ئەندازیاری، یەکێک لە بەرپرسیارییەتەکانی ئەوەیە کە، بنوارێت ئاخۆ کارمەندەکان کڵاویان لەسەر دەکەن، کاتێک لە ماوەی کاکردندان لە کێڵگەدا ئەوەی بەیان کرد، کە هەرکاتێک دێتە ناو کارمەندەکان و ببینێت، کە کەسێک ئەو کڵاوە لەسەر ناکات ئەوا ڕێنماییان پێ دەدات و، ئەوانیش دەبێت بە گوێی بکەن. لە ئەنجامی ئەمەیشدا، هەر کە ئەو لەوێ نامێنێت و دەڕوات، تەواوی کرێکارەکان کڵاوەکانیان لا دەبن.

ئیتر لەدوای ئەمە، بڕیاریدا، شێوازێکی دیکەیان لەگەڵ تاقی بکاتەوە، جاری داهاتوو، بینی وا هەندێک لە کرێکارەکان ئەو کڵاوەیان لەسەر نەکردووە، لێی پرسین ئاخۆ بەو کڵاوە هەست بە نائاسوودەیی دەکەن یان شتێکی گونجا و شیاو نییە، بۆ سەری ئەوان. لەدوای ئەوە بە ئاوازێکی خۆشحاڵییەوە، بیری پیاوەکانی خستەوە کە، کە هۆکاری لەسەر نانی ئەو کڵاوە ئەوەیە ئەوان لە ئازار و برین دوور دەخاتەوە و پێشنیاری ئەوەی کرد، کە هەموو کاتێک دەبێت لە کاتی کاکردندا لەسەر بکرێت. ئەنجامی ئەمە هەر زۆر نایاب بوو، هەر بەبێ ئەوەی سزا و بێزاری و بێتاقەتی و نیگەرانی، هەست و سۆزی لێ بکەوێتەوە گوێڕایەڵیان کرد.

دەتوانیت نموونەی، ڕەخنەی بێ کەڵک و هیچ و زەبر لە هەزاران پەڕی مێژوودا بەدی بکەیت، سەیر بکە، بۆ نموونە دەمەقاڵێی باوی نێوان ***سیدۆر ڕۆسیڤێلت*** و سەرۆک ***تافت*** ناکۆکییەک کە بوویە هۆی دابەش بوونی پارتی کۆماریی و، ***ودرۆ ویلسن***ـی خستە ناو کۆشکی سپییەوە.

با بە خێرایی بەسەر ڕاستیەکاندا گوزەر بکەین، کاتێک لە ساڵی ١٩٠٨دا، ***سیدۆر ڕۆسیڤێلت*** پێی نایە دەرەوە لە کۆشکی سپی، پشتگری ***تافت***ی کرد، کە بۆ سەرۆکایەتی خۆی دەستنیشان کردبوو، پاشان بۆ خۆی ڕۆیشتە ئەفریقا بۆ ئەوەی ڕاوی شێر بکات.

کاتێک گەڕایەوە، زۆر بە توندوتیژی ڕەخنەی لە ***تافت*** گرت، هەوڵی دا بۆ ئەوەی بوونی خۆی بۆ پاڵاوتنی جاری سێیەم مسۆگەر بکات. پارتێکی دیکەی بە ناوی ***بەل موس***ی پێکەوەنا. لە هەڵبژاردنی دواتردا، ***ولیەم هوْوارد تافت*** و پارتی کۆماری تەنیا دوو ویلایەتیان گرت بەدەستەوە، ئەمەیش گەورەترین خراپترین ئەنجام بوو، کە ئەو پارتە تاوەکوو ئێستا بە خۆیەوە بینی بێت.

***سیدۆر ڕۆسیڤێلت*** سەرکۆنەی ***تافت***ی کرد، بەڵام ئایا سەرۆک ***تافت***ی هیچ لۆمە و سەرکۆنەی خۆی کرد؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر، بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە، ***تافت*** گوتی: "نازانم دەبووایە چ شتێکی جیاوازترم بکردایەوە لەوەی کە کردوومە."

دەبووایە لۆمەی کێ بکرێت؟ ***سیدۆر ڕۆسیڤێلت*** یان ***تافت***؟ ڕاشکاوانە بدوێم، خۆشم نازانم، بەلامەوە گرنگ نییە. بەڵام ئەو مەبەستەی کە لێرەدا هەمە ئەوەیە، تەواوی هەوڵ و ڕەخنەکانی ***سیدۆر ڕۆسیڤێلت تافت***یان قایل نەکرد، بەوەی کە هەڵەی کردبێت، بەڵکو تەنیا وای لە ***تافت*** کرد، کە پاساو بۆ خۆی بهێنێتەوە و، دووبارە و دووبارە ئەسرینەکان لە چاویەوە جۆگەلە ببەستن: "نازانم دەبووایە چ شتێکی جیاوازترم بکردایەوە لەوەی کە کردوومە."

یاخود سەیری ***تیپۆت دۆمی*** ئابڕووچوونی نەوت بکەین، لەسەرەتای بیستەکاندا ئەم بێزارییە، ڕۆژنامەکانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، بگرە هەر نەتەوەی ئەمریکای هەژاند! لە زەینی پیاوانی زیندوودا، هیچ شتێک هاوشێوەی ئەمە، بەر لە ژیانی گشتی ئەمریکادا ڕووی نەدابوو. ئەمانەیش نموونەی حاشاهەڵنەگری ئەو ئابڕووچوونانەن:

***ئەلبێرت بی. فۆل*** سکتێری ناوخۆی کابینەی ***هاردینگ*** متمانەی پێدرا، لەبەرانبەر کرێنامەی نەوتی یەدەگی حکومەتدا، لە ***ئێلک هیل*** و ***تیپۆت دۆمی*** ئەو نەوتەی کە کرابوو بە یەدەگ بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بەکار بهێنرێت، لە هێزی دەریاییدا. ئایا سکتێر ***فۆل*** ڕێگەی بە پێشبڕکێکی موزایەدەکردندا؟ نەخێر گەورەم. بەڵکو هەر بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕێکەوتنی لەگەڵ هاوڕێکەی، ***ئێدوارد ئێل دۆهێنی*** کرد. ئێ لەبەرانبەر ئەمەدا ***دۆهێنی*** دەبوایە چی بکات؟ ئەویش قەرزێکی دڵخۆشکەری بڕی سەد هەزار دۆلاری بە ***فۆل***دا.

پاشان بەفەرمانێکەوە سکتێر ***فۆل*** فەرمانی بە هێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، بۆ ناوچەیەک بۆ ئەوەی ڕێگری بکەن لەبەرانبەر پێشبڕکێکاران کە، بیرە هاوسنورەکانیان لە نەوتی یەدەگ لە گردی ئێلیک خاڵی ببوون. ئەم ڕکابەرانە، بەزەبری هێز و ئەسڵەحەوە پێیان خستە ناو کۆشکەوە لە خوار بیری ***تیپۆت دۆمی***، بۆنێکی ناخۆش بڵاو بوویەوە، کە بوویە هۆی وێرانکردنی ئیدارەی ***هاردینگ***، تەواوی ئەوناوەی دووچاری هێڵنجدان کرد و، بوو بەمایەی هەڕەشە لەسەر تێکشکاندنی پارتی کۆماریی و ***ئەلبێرت بی. فۆل***ی ڕاوانەی پشتی دیوارەکانی زیندان کرد.

***فۆل*** بە شێوەیەکی زۆر خراپ و ناشیرین سەرزەنشتی کرا، هاوشێوەی پیاوانێکی کەمی ژیانی گشتی. ئایا ئەو لەو کارەی پەشیمان بوویەوە؟ هەرگیز! لەدوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک، ***هێربێت هوڤەر*** لە گوتارێکدا ڕایگەیاند، کە مەرگی سەرۆک ***هاردینگ***،

به هـــۆی شـــەکەتی و نیگەرانـــی دەروونـــی بـــووە، لەبەر ئەوەی هاوڕێیەکی خیانەتی لێ کردووە. کاتێک خاتوو *فۆل* گوێ بیستی ئەوە بوو، لەسەر کورسییەکەی هەڵبەزیەوە و، دەستی بە گریان کرد، مستەکانی لە دژی چارەنووس دەوەشاندن و هاواری دەکرد: "چی؟ *فۆل* خیانەتی لە هاردینگ کردووە؟ نەخـــێر! هەرگیز مێردی من، خیانەتی لە هیچ کەسێک نەکردووە. ئەگەر ئەم ماڵە پڕ بکرێت لە زێڕ هەرگیز نابێتە پاڵنەر بۆ ئەوەی مێردەکەی من هەڵەیەک بکات. بەڵکو ئەو ئەو کەسەیە کە خیانەتی لێ کراوە و براوە بۆ کوشتارگە و، لەخاچ دەدرێت."

لەم جۆرە ڕەفتارانەدا، سروشتی مرۆڤ خۆی دەکاتە ناو باسەکەوە، بکەری هەڵە و خراپە لۆمە و سەرکۆنەی هەموو کەسێک دەکات، تەنیا خودی خۆی نەبێت. ئێمە بەم شێوەین. لەبەرئەوە کاتێک من و تۆ هەوڵ دەدەین بەیانی لۆمەی کەسێک بکەین، با *ئال کاپۆنی*، *کراولی* و *ئەلبێر فۆلمان* لە بیر بێت.

با درک بەوە بکەین، کە ڕەخنەگرتن وەکوو کۆترێکی ماڵی وایە، کە هەردەم دەگەڕێتەوە ماڵەوە. با لەوە تێ بگەین، کە ئەو کەسەی دەمانەوێت ڕاستی بکەینەوە و سەرزەنشتی بکەین، ئەوا دەشێت پاساو بۆ خودی خۆی بهێنێتەوە و، لەبەرانبەر ئەمەدا سەرزەنشتی ئێمە بکات، یاخود هەر وەکوو *تافت*ی میهرەبان دەڵێت: "نازانم دەبووایە چ شتێکی جیاوازترم بکردایەوە، لەوەی کە کردوومە."

بەیانی ١٥ی نیسانی ١٨٦٥ *ئەبراهام لینکۆلن* لەسەر جێگەی مەرگ پاڵ کەوتبوو، لە خانوویەکی بچووکدا، بەرانبەر بە شەقامی سینەمای فۆردز کە لەوێدا *جۆن ویلکز بوس* تەقەی لێ کردبوو.

*لینکۆلن* لەسەر دۆشەکێک ڕاکشابوو، کە لە بالای خۆی کورتر بوو، بە دیواری ژوورەکەیدا وێنە بەناوبانگەکەی *ڕۆسا بۆنهاوەر* ئەسپە

جوانەکە هەڵواسرابوو، ڕووناکییەکی زەردیش باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو.

لەو کاتەی *لینکۆلن* هەناسەی مەرگی دەدا، سکتێری *وۆر ستانتۆن* گوتی: "لێرەدا، کامڵترین فەرمانڕەوا کە جیهان بە خۆیەوە بینیووە ڕاکشاوە."

نهێنی سەرکەوتنی *لینکۆلن*، لە ئەدای مامەڵەکردنی، لەگەڵ خەڵکدا چی بوو؟ بۆ ماوەی دە ساڵ توێژینەوەم لەسەر ژیانی *ئەبراهام لینکۆلن* کرد و، سێ ساڵیشم تەرخان کرد، بۆ ئەوەی کتێبێک بنووسم و بنووسمەوە، لەژێر ناونیشانی *لینکۆلن*ی نەناسراو.

پێم وایە توێژینەوەیەکی ورد و درشتم دەربارەی خودی ژیانی *لینکۆلن* و ژیانی ماڵەوەی کردووە، هەروەها توێژینەوەیەکی تایبەتیشم کرد، لەسەر ئەدای مامەڵەکردنی *لینکۆلن* لەگەڵ خەڵکیدا.

ئایا *لینکۆلن* خۆی بە ڕەخنەگرتن سەرقاڵ کردووە؟ ئۆو، بەڵێ. لە کاتی لاویدا لە دۆڵی پیچن کریکی ئیدیانا، نەک هەر تەنیا ڕەخنەی گرتووە، بگرە نامەی نووسیوە و شیعری هۆنیوەتەوە، لەپێناو گاڵتەکردن بە خەڵکی. نامەی لەسەر ڕێگاکانی گوندەکە فڕێ دەدا، کە لەوە دڵنیا بوو کەسێک هەڵیان دەگرێتەوە. یەکێک لەو نامانە، بوویە هۆی نانەوەی بێزاری و نیگەرانی کە بۆ تەواوی ژیانی بوو بە مۆرکێک بەسەریەوە.

تەنانەت لەدوای ئەوەی، کە *لینکۆلن* بوو بە بە پارێزەر لە سپرینگفیلد، ئیلینۆیس، بە شێوەیەکی دیار و ئاشکرا، هێرشی دەکردە سەر ڕکابەرەکانی، لە ڕێگەی ئەو نامانەی کە لە ڕۆژنامەدا بڵاو دەبوونەوە.

لە پاییزی ١٨٤٢دا گاڵتەی بە کەسێکی سیاسی بەفیز و شەڕانی کرد، بەناوی **جەیمز شیلدز**. *لینکۆلن* لە نامەیەکی دیاردا، کە لە ڕۆژنامەی سپرینفیلدا بڵاو بوویەوە، جنێو و قسەی نەشیاوی بە **جەیمز** گوت.

تەواوی خەڵکی شار بەمە دەستیان بە پێکەنین کرد، بەڵام *شیلدز* کەسێکی هەستیار و لەخۆبایی بوو، هەر لە بێزاری و نیگەرانییدا گڕی گرتبوو.

نووسەری نامەکەی دۆزیەوە، سواری ئەسپەکەی بوو، بەدوای *لینکۆلن*دا دەگەڕا و، بەرەنگاری کرد بۆ ئەوەی زۆرانبازی لەگەڵدا بکات. *لینکۆلن* نەیدەویست شەڕ بکات، بەرهەڵستی کرد، لەوەی کە زۆرانبازی لەگەڵدا بکات، بەڵام لەبەر ڕێز و شکۆی خۆشی نەیدەویست لەو شەڕە هەڵ بێت و ڕا بکات.

بژاردەی چەکی شەڕەکەی پێدرا، وەلێ قۆڵەکانی درێژبوون، شمشێری پانی هەڵبژارد و، وانەی شمشێر بازی لە وێست پۆینت خوێندبوو. لە ڕۆژی دیاریکراودا، ئەو و *شیلدز* لە کەناری ڕووباری میسیسیپی چاویان بەیەک کەوت، ئامادەبوون شەڕی مەرگ بکەن. بەڵام لەدوا ساتەکانی ئامادەکاریکردندا، ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون، ئەوانیان وەستاندا و ڕێگەیان نەدا شەڕ بکەن.

ئەمەیش دژوارترین ڕووداوی ژیانی *لینکۆلن* بوو، وانەیەکی پڕ بەها و پەند ئامێزی فێر کرد، لە هونەری مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا. هەرگیز جارێکی دیکە نامەی پڕ لە ڕیسوواکردن و سەرزەنشتکردنی نەنووسییەوە، هەرگیز جارێکی دیکە گاڵتەی بە کەسی دیکە نەکرد. هەر لەو کاتەوە لەپای هیچ شتێکدا ڕەخنەی لە هیچ تاکە کەسێک نەگرت.

سات لەدوای سات، لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا، *لینۆکلن* ژەنەڕاڵێکی دەستنیشان دەکرد، بۆ ئەوەی سەرکردایەتی سوپا بکات، لە پۆتۆماک هەر یەکێک لە ئەوانە، *مککلێلان، پۆپ، بێرنساید، هووکەر، میدی،* هەڵەی گەورەی تراژیدیان دەکرد و، ئەمەیش وای لە *لینکۆلن* دەکرد، کە بکەوێتە چاڵی نا ئومێدییەوە. تا وای لێهاتبوو، نیوەی دانیشتوانی وڵات ڕەخنەیان لەو ژەنەڕاڵانە دەگرت. بەڵام *لینکۆلن* بە هەستێکی

دوور له قینه و پڕ له خۆشەویستییەوە، هێمن و لەسەرخۆ بوو، یەکێک له گوته دڵخوازەکانی بریتی بوو له: "بڕیار لەسەر کەس مەدە، کەسیش بڕیار لەسەر تۆ نادات."

کاتێک خێزانی *لینکۆڵن* و ئەوانی دیکه به زمانێکی زەبر و پیسەوە دەربارە خەڵکی باشوور قسەیان دەکرد، *لینکۆڵن* وەڵامی دەدانەوە: "ڕەخنەیان لێ مەگرن، ئەگەر ئێمەیش له کەش و هەلومەرجی ئەوانەدا ڕێمان کردبا، هەر وا دەبووین." ١

لەگەڵ ئەوەیشدا، کەسێک هەلێکی بۆ ڕێک کەوتبێت، بۆ ئەوەی ڕەخنە بگرێت ئەوا به دڵنیاییەوە، لینکۆڵن بوو، با لەم نموونەیەی خوارەوە وردبینەوە:

له سێ ڕۆژی سەرەتای، مانگی تەمووزی ١٨٦٣دا جەنگی گێتسبێرگ ڕووی دا، له شەوی چوارەمی شەڕەکەدا، *لی* دەستی به پاشەکشە کرد، لەو کاتەیشدا هەور و باران بەری ئاسمانی تەنی بوو. ئەو کاتەی کە، *لی* به خۆیی و سوپا شکستخواردووەکەی گەیشتە پۆتۆماک، بینی وا ڕووبارێکی زۆر گەورە لەبەدەرمی دایەوە و ناتوانن لێی بپەڕنەوە، له پشتیشەوە، سوپایەکی یەکگرتووی سەرکەوتوو بەرەو ڕوویان دەهاتن. ئیتر *لی* کەوتە بۆسەوە و، نەیدەتوانی لێی ڕا بکات.

*لینۆڵن* ئەو دیمەنەی بینی و، پێی وابوو وا هەلێکی زێڕینی بۆ ڕێک کەوتووە، دەرفەتێک بۆ ئەوەی دەست به سەر سوپای *لی*دا، بگرێت و دەستبەجێ کۆتایی به شەڕەکە بهێنێت. بۆیە به هەستێکی پڕ هیواوە، *لینکۆڵن* فەرمانی به *میدی*دا بۆ ئەوەی ڕاوێژکاری جەنگ بانگهێشت نەکات، بەڵکو دەستبەجێ هێرش بکاتە سەر *لی*. لینکۆڵن ئەم فەرمانانەی دەکرد، نامەبەرێکی تایبەتی بۆ *میدی* نارد و، داوای لێ کرد که دەستبەجێ به کردنی ئەو کارە هەستێت.

ئەی ژەنەڕاڵ *میدی* چی کرد؟ بەپێچەوانەی فەرمانەکەی *لینکۆڵن* دەستی بەکار کرد، بانگی ڕاوێژکاری جەنگی کرد و، دەستبەجێ لەدژی فەرمانەکەی *لینۆکۆڵن* وەستایەوە. دوودڵ بوو، هێرشەکەی دواخست، پاساوی بۆ تەواوی ڕەفتارەکانی هێنایەوە، ڕەتی کردەوە هێرش بکاتە سەر *لی*. دواجار ئاستی ئاوەکە دابەزیی و، *لی* توانی بە خۆیی و سوپاکەیەوە بگاتە پۆتۆماک.

*لینکۆلن* تورە بوو، هاواری بەسەر کورەکەیدا، *ڕۆبێرت* کرد؛ "ئەمە مانای چییە؟ ئەی خودای گەورە! ئەمە مانای چییە؟ ئێمە دەمان توانی ئەوان بگرین و، ئێستا لەژێر دەستی ئێمەدا دەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ناتوانم هیچ بکەم و هیچ بڵێم، بۆ ئەوەی جووڵە بە سوپاکەم بکەم. لەژێر هەر هەلومەرجێک بوایە، هەر ژەنەڕاڵێک بوایە، دەیتوانی *لی* ببەزێنێت ئەگەر من لەوێ بوومایە، ئەوا خۆم دەمتوانی دەست بەسەری بکەم."

لەوپەڕی نائومێدیدا، *لینکۆلن* دانیشت و، نامایەکی بۆ *میدی* نووسی: "لە بیرت بێت، لەم ماوەیەدا، *لینکۆلن* تەواو پارێزگار و جڵەوگیر بووە، لە دەربڕینی وشەدا." ئەم نامەیە لە ساڵی ١٨٦٣دا نووسراوە کە بە نامەیەکی یەکسان لەبەرانبەر هەڕەشەیەکی توندوتیژ هەژمار دەکرێت.

لەنامەکەیدا دەنووسێت:

ژەنەڕاڵە ئازیزەکەم

"لەو باوەڕەدا نیم، تۆ ئەو بەدبەختییە بەرز بنرخێنیت، کە لەبەرانبەر ڕاکردنی *لی*دا، ئێمە دوچاری بووین. زۆر بە ئاسانی دەمانتوانی دەستگیری بکەین، بەمەیش کۆتاییمان بە جەنگە دەهێناو و، سەرکەوتمان تۆمار دەکرد. هەر وەکوو دەردەکەوێت، ئەو جەنگە بۆ ماوەیەکی نادیار درێژە دەکێشێت. ئەگەر نەتوانیت ڕۆژی دووشەمەی ڕابردوو هێرش بکەیە سەر *لی*، ئەی چۆن دەتوانیت لە باشووری ئەو

ڕووبارەدا، بەسەریدا سەربکەویت، بەهێزێکی کەمەوە کە زیاتر دوو لەسەر سێی ئەو هێزەت نییە؟ شتێکی نامەعقولە، بۆ ئەوەی پێشبینی ئەوە بکرێت و وایش چاوەڕێ ناکەم، کە بتوانی کاریگەریەکی ئەو تۆت هەبێت. تازە هەلە زێرینەکەت لە دەستدا، ئەوەیش زۆر نیگەران و خەفەتباری کردووم."

پێت وایە *میدی* چی کرد کاتێک ئەو نامەیەی خوێندەوە؟ هەرگیز *میدی* چاوی بە نامەکە نەکەوت، *نیکۆل* هەر بۆی نەناردبوو، بەڵکو لەدوای مەرگی لەنێو پەڕاوەکانییدا دۆزرایەوە.

تێڕوانینی من ئەوەیە –ئەمە تەنیا بڕوایەکە– لەدوای نووسینی ئەو نامەیە، *لینکۆڵن* لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کردووە و بە خۆی گوتووە: "تەنیا یەک خولەک، لەوانەیە پێویست نەکات، ئەوەندە پەلە بکەم، شتێکی زۆر ئاسانە، لە کۆشکی سپیدا دابنیشم و فەرمان بە *میدی* بکەم بۆ ئەوەی هێرش بکات، بەڵام ئەگەر منیش لە گێتسبێرگ بوومایە، ئەو خوێنە زۆرەم ببینیبایە، کە لە هەفتەی ڕابردوودا *میدی* بەرچاوی کەوتبوو، ئەگەر گوێیەکانم کون ببوبان، بە هەوار و ناڵەی برینداەرەکان و جوانەمەرگەکان، ئەوا لەوانەبوو منیش ئەوەندە پەرۆشی هێرشکردن نەبوومایە. ئەگەر منیش لە هەمان باری دەروونی *میدی* بوومایە، ئەوا دەکرا، هەر هەمان ئەو شتە بکەم، کە ئەو کردوویەتی. بەهەر حاڵ وا لەژێر پردەکەوە ئاو جوڵە دەکات، ئەگەر ئەم نامەیەم ناردبایە، ئەوا ئاسوودەیی بە هەستەکانم دەبەخشی، بەڵام وایش لە *میدی* دەکات پاساو بۆ خۆی بهێنێتەوە، وای لێ دەکات من مەحکووم بکات. هەستی ناڕەزایی دەنێتەوە، وەکوو سەرکردەیەک پێگەی خۆی ڕەت بکات و، ڕەنگە ناچاری بکات هەر دەستبەرداری سوپاکەی بێت."

لەبەر ئەوە، هەروەکوو گوتم: "لینکۆڵن نامەکەی بەلاوەنا، چونکە ئەو لە ڕێگەی ئەزموونێکی تاڵ و تفتەوە تێگەیشتبوو، کە ڕەخنەی توندوتیژ و هەڕەشە شتێکی هیچوپوچ و بێ کەڵکە."

***سیدور ڕوسیڤێلت*** دەڵێت کاتێک سەرۆک بوو، ڕووبەڕووی کێشەی بێ پێچ و پەنا دەبوویەوە، پاڵی دەدایەوە و سەیری وێنە گەورەکەی ***لینکۆڵن***ـی دەکرد، کە بەدیواری کۆشکی سپی هەڵواسرابوو و، لە خۆی دەپرسی: "ئەگەر ***لینکۆڵن*** لە جێگەی من بوایە چی دەکرد؟ چۆن ئەم گرفتەی چارەسەر دەکرد؟"

بۆ جارێکی دیکە هەر کە ویستمان سەرزەنشت وسەرکۆنەی کەسێک بکەین، با پێنج دۆلار لە گیرفانمان دەربهێنین، سەیری وێنەی ***لینکۆڵن*** بکەین و، لە خۆمان بپرسین، "ئەگەر ***لینکۆڵن*** ئەم کێشەیەی هەبوایە ئەوا چۆن چارەسەری دەکرد؟"

***مارک توەین*** جاروبار تووڕەیی لەدەست دەدا و نامەی دەنووسین و، ڕەنگی کاغەزەکەی قاوەیی دەکرد. بۆ نموونە، جارێکیان نامەیەکی بۆ کابرایەک نووسی، کە بوویە هۆی تووڕە بوونی ئەم، "ئەمە شتێکی ناچارییە بەسەر تۆدا، تۆ تەنیا دەتوانی قسە بکەی و، منیش ئەنجامەکەی دەبینم، کە چیت دەست دەکەوێت." لە بۆنەیەکی دیکەدا، بۆ هەڵەچنێکی نووسی دەربارەی هەوڵەکانی، بۆ هەڵەبڕکردن، فەرمانی کرد، "هەڵەی نووسین و خاڵبەندیم بەرەو پێشەوە بەرە، لەمەودا مەسەلەکە بەگوێرەی نوسخەی من دابڕێژە و، ببینە کە پاکنووسەکە پێشنیارەکانی لە مێشکە ڕیزو و بۆگەنەکەیدا هەڵدەگرێت."

نووسینی ئەم جۆرە نامانە وای لە ***مارک توەین*** کرد هەست بە باشتر بکات، ڕێگەیان پێدا خۆی لەو کەشەدا ڕزگار بکات و، نامەکانیشی هیچ ئازارێکی ئەوتۆی ڕاستەقینەیان نەبوو، چونکە خێزانی ***مارک*** بە نهێنی دەستکاری نامەکانی دەکرد و هەرگیز نەدەنێردران.

ئایـا حەز دەكەیـت كەسـێك بگـۆڕی و، ڕێكـوپێكی بـكەی و، بەرەو پێشـەوە پەرەی پـێ بـدەی؟ باشـە! ئەمە كـارێكی باشـە، مـن بەش بە حاڵی خۆم كەسێكی تەواو یارمەتیدەر دەبـم. بەڵام بۆ هەر لە خۆتەوە دەست پێ ناكەیت؟ هەر لە قووڵایی نـاخی خـۆتەوە دەست بەكار بە، ئەمە زۆر بەسوودتر و بەكەڵكتر دەبێت وەكوو لە كەسانی دیكە، بەڵێ ئەوەندەیش مەترسیدار نابێت. ***كۆنفۆشیۆس*** دەڵێت: "لۆمە و سكاڵای ئەو بەفـرە مەكە، كە بەسـەربانی دراوسـێكەتەوە دەبارێـت لە كاتێكـدا بەردەرگای ماڵەكەی خۆت پیس و پۆخڵە."

كاتێك هێشتا لاو بووم و، هەوڵـم دەدا بچمە دڵـی خەڵكەوە، نـامەیەكی گەمـژانەم بـۆ ***ڕیچـارد هاردینـگ داڤـیس*** نووسـی، نووسـەرێك كە شـومێكی بەسـەر ئاسـۆی ئەدەبی ئەمریكـادا هێنـا. گوتـارێكم دەبـارەی نووسەران ئامادە دەكرد و، داوام لە ***داڤیس*** كرد بۆ ئەوەی دەربـارەی ئەدای كاركردنی خۆییم بۆ بدوێت. بەر لە چەنـد هەفتەیەك نـامەیەكم لەلایەن كەسـێكەوە پێگەیشـتبوو، بەم ئامـاژەیە: "سـەپێنراوە بەڵام نەخوێنـدراتەوە،" ئەوە هەر زۆر كـاری تـێ كـردم، بە جۆرێـك هەسـتم كرد، كە دەبێت ئەو نووسـەرە زۆر گەورە و، سـەرقاڵ و گرنـگ بێت، وەلێ مـن تۆسـقاڵێكیش سـەرقاڵ نەبووم. بەڵام بە پەرۆش و خوازیـار بووم بكەومە دڵی ***ڕیچارد هاردینگ داڤیس*** لەبەر ئەوە بەم وشـانەی خـوارەوە كـورتە تێبینیـیەكەم كۆتـایی پـێ هێنـا: "سـەپێنراوە بەڵام نەخوێندراوەتەوە."

هەرگیز، ئەزیەتی نەدەكێشا، بۆ ئەوەی وەڵامـی نامەكـان بداتەوە، هەر بەشـێوەیەكی سـادە بەو وشـە تـێكەڵ و پـێكەڵانە نـامەكەی بـۆ دەگەڕاندمەوە: "ڕەفتـارە خراپەكـان سـەرنجامی كـارە نەشـیاوەكانتن." ڕاستە من هەڵەیەكی گەورەم كردبوو، دەكرێت شیاوی ئەو هەڕەشەیە بوویم، بەڵام ئەی مـرۆڤ بـوون، زۆر بەدەسـتیەوە بێـزار بـووم، زۆر خراپ توڕەبووم، كاتێك بە دە ساڵ دواتر، دەربـارەی مەرگـی ***ڕیچارد***

***هاردینگ داڤیس***م خوێندەوە، تاکە بیرۆکەیەک، کە هێشتا لە بیر و زەینی مندا مابوویەوە -هەر پێم شەرمە ئەوە قبوڵ بکەم- ئەو ئازارە بوو کە بەدەستییەوە دەمناڵاند بە هۆی ئەوەوە.

ئەگەر من و تۆ، ببینە هۆی نانەوەی بێزاری لە بەیانییدا، ئەوا بۆ دەیان ساڵ لەبیر ناچێتەوە و، هەتا مەرگ لەگەڵماندا دەژیت، تەنیا با خۆمان سەرقاڵی رەخنەیەکی بچکۆلانە بکەین و بەس.

لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، با ئەوەمان لەبیر و هزردا بێت کە، ئێمە مامەڵە لەگەڵ بوونەوەرێکی لۆژیکیدا ناکەین، بەڵکو مامەڵە لەگەڵ بوونەوەرێکی پڕ لە هەست و سۆزدا دەکەین، بوونەوەرێک کە پڕە، لە ڕقوقینە و، هاندەدرێت بە هۆی فەخر و پڕوپووچگەرییەوە.

ڕەخنەی تاڵ و تفت کاری لە ***تۆماس هاردی*** کرد، یەکێکە لە هەرە ڕۆماننووسە باشەکان، بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی ئینگلیزی، لەبەر ئەوە بۆ هەتاهەتایە، وازی لە نووسینی چیرۆکی خەیاڵی هێنا. ڕەخنە وای لە ***تۆماس چاتەرتن*** کرد، هۆزانڤانی ئینگلیزی کە خۆی بکوژێت.

***بێنجامین فرانکلین*** هەر لە هەرەدی لاویدا کەسێکی قسەزان بوو، بوو بە کەسێکی دبلۆماسی، کەسێکی کارامە، لە ئەدای مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، بەمەیش کردیان بە باڵوێزی ئەمریکا لە وڵاتی فەڕەنسا. نهێنی سەرکەوتنی ئەو چی بوو؟ گوتی: "من بە زمانێکی شڕ و خراپ دەربارەی هیچ کەسێک نادوێم، بەڵکو قسە دەربارەی لایەنە باشەکان و چاکەکانی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە دەیان ناسم."

زۆربەی کەسە گەمژەکان ڕەخنە دەگرن، ناڕەزایی دەردەبڕن و، زۆربەی گەوجەکان ئەوە پیشەیانە گلەیی و گازندە دەکەن.

وەلێ ئەمە کەسایەتی و جڵەوگیری دەوێت، بۆ ئەوەی لەمە تێبگەی و کەسێکی لێ بوردە بیت.

*کارلایل* دەڵێت: "پیاوی مەزن گەورەیی خۆی دەنوێنێت لە ئەدای مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسانی بچووکدا."

*بۆب هووڤەر* فڕۆکەوانی بەناوبانگ و نوێنەری پێشووی بەرنامەکانی هێڵی ئاسمانی، لە لۆس ئەنجلۆس، لە سان دیاگۆ دەگەڕایەوە، هەر وەکوو لە گۆڤاردا بە کرداری فڕین وەسفی کردبوو، کەسێک هەزار پێ لە زەوییەوە بەرز بوو، کتوپڕ هەردوو ئامێرەکان لە کارکردن وەستان. بە تەواوی شارەزایی خۆی، هەوڵی دا فڕۆکەکە بنیشێنێتەوە بەڵام زۆر بە خراپی فڕۆکەکە تێکشکا، وەلێ هیچ کەسێک ئازاری پێ نەگەیشت.

یەکەمین کاری *هووڤەر* لەدوای نیشتنەوەی فڕۆکەکە ئەوە بوو، کە بەنزینی فڕۆکەکە بپشکنێت، هەروەکو پێشبینی دەکرد، پەروانەکانی فڕۆکەکانی جەنگی دووەمی جیهانی فڕیوون بە بەسوتەمەنی، فڕۆکەی جێت، زیاتر لەوەی کە بەنزینیان بەکارهێنابێت.

لە کاتی گەڕانەوە بۆ فڕۆکەخانە، داوای کرد کە ئەو ئامێرسازە ببینێت کە ئامادەکاری و خزمەتی فڕۆکەکەی کردبوو، ئەو پیاوە لاوە بە هۆی ئەو هەڵەوە لە سەرەمەرگیدا بوو، هەر کە *هووڤەر* گەیشت، ئەسرین جۆگەی لە چاوەکانی بەستبوو. ئەو کابرایە هۆکاری لە دەستدانی فڕۆکەیەکی ئاوا گرانبەها بووە، هەروەها هۆکارێکیش بووە بۆ لەدەستدانی ژیانی سێ کەسی دیکە.

خۆ دەتوانیت خەیاڵی تووڕەیی *هووڤەر* بکەیت، کێ دەتوانێت مەزندەی ئەوە بکات، کە ئەو فڕۆکەوانە هەروا بەکەمتەرخەمی بەڕەڵا کات و لێی گەڕێت، بەڵام *هووڤەر* سەرزەنشتی ئامێرسازەکەی نەکرد بە هیچ جۆرێک ڕەخنەی لێ نەگرت، بگرە لەجیاتی ئەوە، باوەشی پێدا کرد و، گوتی: "بۆ ئەوەی نیشانت بدەم، دەزانم هەرگیز دووبارە کارێکی لەم شێوەیە ناکەیەوە، دەمەوێت بەیانی خزمەتی فڕۆکە ئێف پانزەکەم، بکەیت و ئامادەی بکەیت."

بە زۆری دایک و باوکان، هەوڵی ڕەخنەگرتن دەدەن لە منداڵەکانیان، وام لێ چاوەڕێ دەکەیت کە بڵێم: "وا مەکە،" بەڵام وا ناڵێم، بەڵکو تەنیا دەڵێم بەر لەوەی ڕەخنەیان لێ بگریت، ئەوا یەکێک لە دەقە کۆنەکانی ڕۆژنامەی ئەمریکی بخوێنەوە، کە دەڵێت: "باوک لەبیری دەچێت." بە شێوەیەکی بنەڕەتی، ئەمە لەسەر وتاری، ***جۆرنال هۆمی*** خەڵک بەدەرکەوت. ئێمەیش وا لێرەدا، بە مۆڵەتی نووسەر، دووبارە بەرجەستەی دەکەینەوە و دەینووسینەوە، ئەگەر خوێنەرەکانمان پێیان هەزم کرێت.

باوک لەبیری دەچێت، یەکێکە لەو پارچە بچووکانە -کە لە هەستێکی پڕ لە سۆزەوە خۆی دەنووێنێت- هەوڵ دادەت بۆ ئەوەی ئاوازێکی ئەو تۆی هەبێت، کە وا لە زۆرێک لە خوێنەران بکات ببێت بە شتێکی دڵخوازی هەمیشەیی. هەر لە یەکەم دەرکەوتنیدا باوک لەبیر دەکات، دووبارە کراوەتەوە، نووسەر ***دەبلیوو لڤینگستۆن لارند***، دەنووسێت: "لە سەدان گۆڤار و ئۆرگانی ماڵدا و، لە ڕۆژنامەکەکانی وڵاتدا، بگرە بە شێوەیەکی بەرفراوان بە زمانی بیانیش بڵاوکراوەتەوە. مۆڵەتی خودی خۆم بە هەزاران کەس داوە کە خوازیاربوون لە قوتابخانە، کڵێسا و وانەکاندا بیخوێننەوە. لە چەندین بۆنە و بەرنامەدا تاووتوێکراوە. هەر بە شێوەیەکی زۆر، گوتاری مانگانەی کۆلێژ و، قوتابخانەکانی ئامادەیی بەکاریان هێناوە. هەندێک جار پارچەیەک بەشتێکی شاراوە بەدەردەکەوێت، بۆ ئەوەی کلیکی لەسەر بکەی و بە دڵنیاییەوە ئەمە بێتەبوون.

باوک لە یادی دەچێت

***دەبلیو. لڤینگستۆن لارند***

کوڕەکەم گوێ بگرە، من ئەوە دەڵێم وەکوو بڵێی خەوتبیت، یەک چنگی بچووک بەسەر ڕوومەتەوە چرچ بووە و، قژە لوولە زەردەکەیشت بە تەڕی بە تەوێڵەتدا ڕاکشاوە. بە تەنیا خۆم

خزاندووەته ناو ژوورەکەتەوە. تەنیا چەند خولەکێک لەمەوبەر هەر کە کاغەزەکەم لە کتێبخانە دەخوێندەوە، دەستێکی ماڵئاوایی بەسەر مندا باڵیگرت. *گولتیلی* وا من هاتوومە تەنیشت تۆ.

کوڕەکەم ئەمانە ئەو شتانەن، کە من بیرم لێیان دەکردەوە: من لە تۆ تووڕەبووم، سەرزەنشت و سەرکۆنەم کردوویت، هەر کە بۆ قوتابخانە خۆت پۆشتە دەکرد، چونکە تەنیا بە خاولی دەستت لە دەموچاوت دەدا. کارێکم پێ بەخشیت بۆ ئەوەی پڵاوەکانت پاک نەکەیەوە، زۆر لێت پەست و قەڵس دەبووم کاتێک تۆ شتێکت بە زەویدا دەکێشا.

لە خوانی بەیانییشدا، هەڵەم بەدی کرد، شتەکانت ڕشتبوو. خواردنەکەت قوت دابوو. ئانیشکت خستبوویە سەر مێزەکە، کەرەیەکی زۆرت سەختە سەر نانەکەت. هەر کە دەستت بە یاریکردن دەکرد، ڕوویەکت تێدەکردم و، دەستت ڕادەوەشاند، "ماڵئاوا باوکە!" منیش ناوچاوانم گرژ دەکرد و لەوەڵامدا دەمگوت: "ڕووت لە من وەرگێڕە!"

پاشان سەرتاپای ئەمە لە دوانیوەڕۆیاندا دووبارە دەبوویەوە، بەو ڕێگایەدا دەهاتم و سیخوڕیم بەسەرتەوە دەکرد، شوێنی تۆ دەکەوتم، کەلانەم دەکرد، لە گۆرەوییەکەتدا چەندین کون هەبوون، لەبەردەم هاوڕێ کوڕەکانتدا، ڕیسووام دەکردی و بچووکم دەکردییەوە بەوەی، کە بە پێش خۆم دەدای یەکسەر بۆ ماڵەوە. ئەو گۆرەویانە گرانبەها بوون، ئەگەر ناچار بوویتایە ئەوانە بکڕیت، ئەوا دەبووایە زۆر ئاگادار و وریابای! لە باوکتەوە خەیاڵی ئەوە بکە، کوڕەکەم!

لە بیرت دێت، کاتێک من لە کتێبخانە دەم خوێندەوە، کە تۆ چەندێک بە ترسنۆکی بەژوورکەوتیت، ئازارێک لە چاوەکانتدا بەدی دەکرا؟ کاتێک چاوێکم بە کاغەزەکەمدا خشاند، زۆر بێئارام و حەوسەڵە بووم، بەوەی کە تۆ لە خوێندنەوەت کردم، هەر لە دەرگاکەوە دوودڵ بویت، گوتم: "چیت دەوێت؟"

تـۆش هیچـت نەگـوت، وەکـوو ڕەشــەبایەک بـزر و نقـوم بـووی و، باوەشــت بە ملـی منـدا کـرد و ماچـت کـردم، قـۆڵە بچووکەکانـت بە هەســتێکی کـاریگەرەوە منیـان تونـد کردبـوو، کە خـودا نـاخی تـۆی گەشاندبوویەوە و، تەنانەت فەرامۆشکردن و لەیادکردنیش نەدەتوانرا سیس بێت. لەدوای ئەوە، ڕۆیشتیت و چوویە نهۆمی سەرەوە.

باشـە کـوڕەکەم، هەر لەدوای ئەوە، کـاغەزەکە لە دەسـتەکانم خـزی و هەستێکی پڕ لە ترس گیانی منی داپۆشی. چ شـتێکت لە مـن کردووە؟ نەریتـی دۆزیـنەوەی هەڵە، نەریتـی سەرزەنشـتکردن، ئەمە خەڵات و پاداشتی من بوو، بەوەی بووی بە کوڕی من. تەنیا هەر ئەوە نەبوو، کە مـن تـۆم خـۆش نەدەویسـت، بەڵکو ئەوەیش بـوو کە زۆر شـتم لە قۆنـاغی لاویتـدا چـاوەڕێ دەکـرد، تـۆم بە داری پێـوانەکردن، پێـوانە دەکرد بە ساڵەکانی خۆم.

زۆر شتی باشت تێدا هەبوون و شتانێکی چاک و ڕاست و دروست، لە کەسایەتیتدا بەدی دەکران. ئەو دڵە بچکۆلانەی تۆ، خۆی لە خۆیدا دڵێکی گەورە بـوو کە بەسـەر گردەکانی دەنواڕێت. ئەمەیش بە هـۆی ســەرەڕۆیی بەخشــندەیی تــۆ، هــاتووەتە بــوون بــۆ ئەوەی ڕاکەیە ژوورەوە و من ماچ بکەی و شەوشادم لێ بکەی. کوڕەکەم ئەم شـەو هیچ شتێکی دیکە گرنگ نییە. منیش لە تاریکای هـاتوومەتە لای تۆ و، وا چۆکم داداوە، هەست بە شوورەی و شەرمەزاریی دەکەم!

چ هەستێکی لاوازە، دەزانم تۆ لەم شتانە تێ ناگەیت، ئەگەر ئەوانەم لە کـاتی پیاسـەکردندا بە تـۆ گوتبـا. بەڵام لە بەیـانییەوە دەبـم بە بـاوکێکی ڕاسـتەقینە! دۆسـتایەتی تـۆ دەکەم، ئـازار دەچێـژم کاتێـک تـۆ ئـازار دەچێژیت، پێ دەکەنـم کاتێک تۆ پێ دەکەنیت، زمـانم دەگەزم کاتێک وشـەی نەشـیاو دێـتە سـەر زووبـانم. بەردەوام دەبـم، لە قسـەکردن وەکـوو بڵێـی ئەمە نەریـت و ڕێوڕسـمێک بێـت: "ئەو هـیچ نییە تەنیـا کوڕێک نەبێت، کوڕێکی بچکۆلە!"

بەداخەوەم، کە تۆم وەکوو گەورە پیاوێک وێنا کردووە، بەڵێ وەکوو ئێستا تۆ دەبینم، کوڕەکەم، وا لەناو بێشکەی خۆتدا شەکەت و ماندوو و دەڕاکێی، وا دەزانم هێشتا تۆ هەر منداڵی ساوای. دوێنێ تۆ لە باوەشی دایکدا بوویت، دەستت لەسەر شانی دایکدا بوو، زۆر زۆرم پرسیووە.

لەجیاتی ئەوەی سەرزەنشی خەڵک بکەی، با هەوڵ بدەین لە دۆخ و کەشی ئەوان تێبگەین. با هەوڵ بدەین ئەوە بدۆزیەوە، کە بۆچی ئەوانە بەم شێوەیە ڕەفتار دەنوێنن، ئەمە زۆر بەسوود و بەکەڵکتر دەبێت، لە ڕەخنەگرتن و سەرکۆنەکردن، هەروەها هەستی هاوسۆزی، سنگفراوانی و میهرەبانی دێنێتە بوون.

هەروەکوو دکتۆر **جۆنسن** دەڵێت: "بۆ زانینی تەواوی ئەمە، خودای گەورە بەخشندەیە و، ڕۆژی دوایی لێپرسینەوە لەگەڵ هیچ کەسێک ناکات."

کەوایە، بۆ دەبێت من و تۆ ئەوە بکەین.

**"ڕەخنە مەگرە،**

**سەرکۆنە مەکە،**

**یاخود سکاڵاو**

**گازندە مەکە"**

## تەکنیکی دووەم

## نهێنی گەورەی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا

لەژێر ئەم ئاسمانە پان و بەرینەدا، تەنیا یەک شت بوونی هەیە، کە دەتوانیت وا لە هەر کەسێک بکەیت، هەرچییەکت بۆ بکات کە دەتەوێت. ئایا تا ئێستا بیرت لێی کردووەتەوە ئاخۆ ئەو تاکە ڕێگەیە، چییە؟ بەڵێ، تەنیا یەک تاکە ڕێگایە ئەویش ئەوەیە تۆ وا لەو کەسە بکەیت، کە بتەوێت و ئارەزووی هەبێت بۆ ئەوەی ئەو کارە بکات.

لەبیرت نەچێت، جگە لەم ڕێگەیە، ڕێگەی دیکە لە ئارادا نییە.

بێگومان دەتوانیت وا لە کەسێک بکەیت، کە کاتژمێرەکەی خۆییت پێ بدات، ئەگەر لوولەی دەمانچەکەتی ئاڕاستەی سنگی بکەیت. یاخود وا لە کارمانەدەکانت بکەیت، گیانی هاوکاری بنیات بنێنن و یارمەتیت بدەن –هەتا دەچییەوە لایان– بەوەی هەڕەشەی کوشتنیان لێ بکەیت. دەتوانیت وا لە منداڵێک بکەیت، کە هەر چییەکت بوێ بۆت بکات، ئەگەر هەڕەشەی لێ بکەیت و لێی بدەیت و بیترسێنیت. بەڵام ئەم ڕەفتارە ناشیرن و بێبەزەییانە، تەنیا کاردانەوەیەکی نەخوازراوی لێ دەکەوێتەوە.

تاکە ڕێگەیەک، کە دەتوانم وا لە تۆ بکەم بۆ ئەوەی کارێکم بۆ بکەی، ئەوەیە کە هەرچییەکت بوێ پێت ببخشم.

چیت دەوێت؟

***سیگمۆند فروید*** گوتوویەتی: "هەر چییەک، کە من و تۆ دەیکەین، لەژێر باری دوو پاڵنەردا سەرچاوە دەگرن، پاڵنەری سێکسی و حەزی بوون بە کەسێکی مەزن."

***جۆن دیوی***، یەکێک لە پرۆفیسۆرە گەورە و بەناوبانگەکانی ئەمریکا، بە شێوەیەکی کەمێک جیاوازتر وەسفی ئەمە دەکات. دکتۆر ***دیوی*** دەڵێت: "قوولترین پاڵنەر لەسروشتی مرۆڤدا بریتییە لە، حەز و ئارەزووی مرۆڤ، بۆ بوون بە کەسێکی گرنگ." ئەمە شتێکی گرنگە، لەم کتێبەدا زۆر گوێبیستی شتی لەم شێوەیە دەبیت.

چییت دەوێت؟ شتگەلێکی زۆرت ناوێت؟ تەنیا هەندێک شت نەبێت، کە هیوا و خولیایان پێوە دەخوازین، بە هەستێکی بە پەرۆش و پێداگیرییەوە، کە ناتوانی نکۆڵی لێ بکەی. هەندێک لەو شتانەی، کە زۆربەی مرۆڤەکان دەیانەوێن بریتین لە:

- تەندروستی و پارێزگاریکردن لە ژیان.
- خواردن.
- خەوتن.
- پارە و ئەو شتانەی بە پارە دەکڕدرێن.
- ژیان لە پاشەڕۆژدا.
- تێرکردنی هەست و باری سێکسی.
- پەروەردەکردنێکی باشی منداڵەکانمان.
- هەستکردن بە گرنگی و بایەخی خود.

تەواوی ئەم حەز و ئارەزووانە دەتوانرێت بە دەست بهێنرێن، وەلێ یەکێکیان نەبێت، بەڵام دانەیەکی قووڵ و مەودا درێژ بوونی هەیە – وەکوو خەو و خۆراک بایەخدارە – کە ئەمەیان بە دەگمەن دەتوانرێت بەدەست بخرێت، هەر ئەوەیە ***فروید*** دەڵێت: "هەست و خولیای بوون بە کەسێکی گرنگ." هەر ئەوەیە کە ***دیوی*** پێی دەڵێت: "حەز و خولیای بوون بە کەسێکی گرنگ."

جارێکیان ***لینکۆلن*** نامەیەک دەنووسێت و تێیدا دەڵێت: "هەموو کەسێک حەزی بە ستایشە." ***ولیام جەیمز*** دەڵێت: "قوولترین بنەما لە

سروشتی مرۆڤدا، بریتییه له بەدەستخستنی ستایش." ئەو دەربارەی هیوا یاخود خولیا نادوێت، بۆ ستایشکردن، بەڵکو دەڵێت تامەزرۆبوون و، حەزلێبوون، بۆ ئەوەی بەرز بنرخێندرێیت و ستایش بکرێیت.

لێرەدا، برسییەتییە بێزارکەر و هیلاککەرەکەی سروشتی مرۆڤە، کە خۆی حەشارداوە، ئەو کەسەی کە ڕاستگۆیانە برسییەتی دڵی تێر دەکات و، ئەوا خەڵک لەسەر لەپی دەستی خۆی هەڵ دەگرێت، "تەنانەت مردوو نێژیش، هەست بە داخ و پەژارە دەکات کاتێک دەمرێت."

ئارەزووی هەستکردن بە گرنگی، یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی، کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە، بۆ ئەوەی ئەمە ڕوون بکەینەوە، کاتێ کوڕە جووتیارێک بووم لە میسۆری، باوکم بەراز و ڕەشەوڵاخی بەخێو دەکرد. لەسەر ئەوە هاتبوو، کە ئەو ئاژەڵانە لە پێشنگای ئاژەڵاندا نمایش بکات، کە لە ڕۆژئاوای ناوەڕاستدا ساز دەکران. ئێمە خەڵاتی یەکەممان بە دەست دەخست، باوکم هەموو ئەو شریتانەی، کە وەریدەگرتن، دەیلکاندان بە پارچە موزلینێکی سپییەوە. کاتێک میوان و هاوڕێکانمان سەردانیان دەکردین، پارچە موزلینە سپیەکەمان دەردەهێنا و نیشانی ئەوانمان دەدا. باوکم سەرێکی موزلینەکەی دەگرت و منیش سەرێکی دیکە و، شریتە شینەکانمان پیشانی ئەوان دەدا.

بەرازەکان، هیچ گرنگی و بایەخیان بەو شریتانە نەدەدا، کە بردبوومانەوە، کەچی باوکم زۆر بەلایەوە گرنگ بوون، ئەو خەڵاتانە هەستی گرنگیان بە باوکم دەبەخشی.

ئەگەر پێشینانی ئێمە، بەم شێوەیە هەستیان بە گرنگی و بایەخ نەکردبایە، ئەوا سەرهەڵدان و هاتنەکایەی شارستانییەت شتێکی

مەحاڵ دەبوو. ئەوسا، بەبێ هەستی گرنگی، هیچ جیاوازیەکمان لەگەڵ ئاژەڵەکان نەدەبوو.

هەر ئەم ئـارەزووی گرنگـی پێـدانەیش بـوو، کە ئیلهـامی بە ***دیکنـز*** بەخشی، بۆ ئەوەی ڕۆمـانگەلێکی نەمـر بنووسـێت. هەر ئەم خولیـا و ئـارەزووە بـوو کە، بەڕێـز ***کریستۆفەر ڕێن***، سـیمفۆنی لەسـەر بەرد بنەخشـێنێت. ئەم ئـارەزووە بـوو کە، وای لە ***ڕۆکفێلەر*** کـرد، ملیۆنـان دۆلار کـۆ بکـاتەوە، کە هەرگیـز خەرجـی نەکردبـوون! هەر ئەم ئارەزووەیە، وا لە دەوڵەمەندترین خێزانەکانی شـارۆچکەکەت دەکات، خـانوویەک دروسـت بکەن، کە زۆر گەورەتر بێت لە ئاسـتی قەوارەی پێداویستییەکانی خۆیان.

هەر ئەم ئـارەزووەیەیە، وا لە تـۆش دەکـات، کە جـوانترین سـتایل بپۆشـی، باشـترین ئۆتۆمبێل لێبخـوری، دەربـارەی منداڵە ناوازەکانت بدوێیت.

هەر ئەم ئارەزووەیەیە، کە وا لە کچان و کوڕان دەکات، پەیوەندی بە باندەکانەوە بکەن و، کاری ناڕەوا و خراپ بکەن، بە گوێرەی ***ئی. پی. مەلروونـی*** کە کـاتی خۆشـی سـەرۆکی پۆلیسـی نیـو یـۆرک بـوو، تاوانبارەکـان، هەرزەکارەکـانن، لەدوای ئەوەی کە دەسـتگیر کـراون و داوایـان لە ڕۆژنامەکـان وایە، کە بڵاویـان بـکەنەوە و بیـان کەن بە پاڵەوان.

ئەگەر پێم بڵێیت چۆن هەستی گرنگیت بە دەست دەخەیت، ئەوا من پێت دەڵێم، کە تۆ کێیت. ئەم هەستکردنە، کەسایەتی تۆ دیاری دەکات. ئەمەیش گرنگترین شتە دەربارەی تۆ. بۆ نموونە، ***جۆن دی. ڕۆکفێلەر*** هەسـتی گرنگـی خـودی خـۆی بە دەسـت خسـت، بە پێدانی پـارە بـۆ دروستکردنی نەخۆشخانەیەک لە پەکین لە چین، بۆ ئەوەی ئاگـاداری ملیۆنـــان کەس بکـــات، کە هەرگیـــز ئەو کەســـانەی نەبینیبـــوون و هەرگیزش نایشیان بینێت.

لەلایەکی دیکەوە ***دیلینگەر*** بەوە هەستی گرنگی خۆی بەدەست خست، کە بوو بە سەرۆکی باندێک کە دزیی و کوشتاریان دەکرد. کاتێک سەرانی ئێف بی ئای، کەوتنە ڕاوەدونانی ئەو، خۆی کردە ماڵێک لە کێڵگەی مینیسۆتا و گوتی: "من ***دیلینگەر***م!" زۆر شانازی بەوەوە دەکرد، کە دوژمنی سەرسەختی نەتەوەیەکە، ئەوەیشی گوت: 'نیازم وا نییە، ئازارتان بدەم، بەڵام من هەر ***دیلینگەر***م!"

بەڵێ جیاوازی هەرە گرنگی نێوان ***دلینگەر*** و ***رۆکێفێلەر***، بریتییە لە ئەدای هەستکردن بە گرنگی و بایەخی خۆیان.

مێژوو پڕە لە نموونەی سەرنجڕاکێش، لە کەسانی بەناوبانگ، لەبەرانبەر هەوڵدانیان بۆ هەستکردن بە گرنگی و بایەخی خۆیان. تانەت ***جۆرج واشنتۆن*** دەیویست بە "خاوەن شکۆی سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان" بانگ بکرێت. ***کۆلۆمبس*** نازناوی "میری دەریا، سەرکەوتووی هیندی" لێنرابوو. ***کاسرین***ـی مەزنیش، هەرگیز ئەو نامەیەی نەدەکردەوە کە لەسەری نەنووسرابا "شاژنی خاوەن شکۆ. خاتوو ***لینکۆلن***، لە کۆشکی سپیدا، ڕووی لە خاتوو ***گرانت*** کرد و هاوشێوەی پڵنگ بەسەریدا هاوار کرد: "چۆن خیرەتی ئەوە دەکەیت لە بەرانبەر من، دابنیشی ئەگەر خۆم بانگهێشتت نەکەم!"

ملیۆنێرەکان، هاوکاری چاپووکی، ئەمیری دەریایی بایردیان کرد، بۆ جەمسەری باشوور لە ساڵی ١٩٢٨دا بەو تێگەیشتنەی مەودای شاخی سەهۆڵین بەناوی ئەوانەوە بنرێت، ***ڤیکتۆر هیگۆ*** حەزی دەکرد هیچی نەبێت کەمتر لەوەی کە شاری پاریس بەناوی شکۆی ئەوەوە ناو بنرێتەوە. تانەت ***شکسپیر***، مەزنی ناو مەزنەکان، هەوڵی دا حەزێک بۆ ناوەکەی زیاد بکات، بە دابینکردنی چاکەتێک، چاکەتێک دابکەنێت و بۆ خانەوادەکەی فەراهەم بهێنێت.

هەندێک کەس پەنا دەبەنە بەر کاری ناڕەوا، لەپێناو کەمەندێشکردنی هەستی گرنگی و سەرنجی خەڵک. بۆ نموونە، خاتوو ***مکینلی*** هەستی

گرنگی خۆی بەرجەستە کرد، بە ناچارکردنی مێردەکەی، سەرۆکی نەتەوەیەکگرتووەکان، بۆ ئەوەی، هەموو کاروبارە گرنگەکانی دەوڵەت فەرامۆش بکات و، لەلای بخەوێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، باوەشی پێدا بکات هەتا خەوی لێ دەکەوێت. حەزی برسی گرنگی بەوە تێر کرد، کە پێداگری کرد مێردەکەی لەلای بمێنێتەوە، هەتا دکتۆر ددانەکانی چاک دەکاتەوە. تەنانەت جارێکیان کەشێکی ناخۆشیشی تێکەوت، لەوەی کە مێردەکەی خەریک بوو بە جێی بهێڵێت لەلای دکتۆر، لەکاتێکدا وادەیەکی گرنگی، لەگەڵ ***جۆن های*** سکتێری هەبوو.

***ماری رۆبێر رینهارت***ی نووسەر، چیرۆکی ئافرەتێکی بەهێز و باشی لاوی بۆ گێڕامەوە، کە کارێکی نارەوای کرد، بۆ ئەوەی هەستی گرنگی بەدەست بهێنێت. خاتوو ***رینهارت*** گوتی: "ڕۆژێکیان ئەم ئافرەتە، ناچار کرا بۆ ئەوەی شتێک بکات، دەکرێت مەسەلەی تەمەنی بێت. ساڵگەلێکی زۆر ڕێیان کردبوو و، ئەویش هەر بە سەڵتی مابوویەوە."

"ئیتر کەوتە ناو جێگە، بۆ ماوەی دە ساڵ، دایکە بەتەمەنەکەی هاتوچۆی سەرێ و خوارێی کردووە، خواردنی پێ دەدا و چاودێری دەکرد، ڕۆژێکیان پیرە دایکی لە خزمەتکردن هیلاک بوو و، بە ئەرزدا کەوت و کۆچی دوایی کرد. بۆ چەند هەفتەیەک، ئەو کچە پەژموردە دەبێت و؛ هەڵدەستێتە سەر پێ، پۆشاکەکانی لەبەر دەکات، دووبارە دەست بە ژیانکردن دەکاتەوە."

هەندێک لە سەرچاوەکان ئەوە دەڵێن، هەندێک کەس هەر بە جارێک شێت دەبن، بۆ ئەوەی لە جیهانی شێتیدا هەستی گرنگی خۆیان بەدەست بخەن، لەدەست ئەو هەستە پربایەخ و گرنگییەی کە لە جیهانێکی پڕ لە زەبروزەنگی واقیعدا سەرچاوەی گرتووە و، نکۆڵی لێ کردووە.

زۆرێک لە نەخۆشەکان بوونیان هەیە، کە لەدەست تێکچوونی باری دەروونیان دەناڵێنن لە ئەمریکادا، وەکوو لەدەست تەواوی کارەسات و نەخۆشییە تێکەڵ و پێکەڵەکانی دیکە.

ئێ هۆکاری شێتبوون و تێکچوون چییە؟

هیچ کەسێک ناتوانێت، وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، بەڵام ئێمە نەخۆشییە دیارەکانیش دەزانین، وەکوو ئاوڵە، داڕووخان، تێکچوونی خانەی دەمارەکان و شێتبوون. لە ڕاستیدا، نیوەی هەموو ئەو کەسانەی کە دووچاری نەخۆشی دەروونی بوون، دەکرێت هۆکارێکی جەستەی لە پشتەوە بێت وەکوو نەخۆشی دەروونی، کحول، ژەهر و برین و زام، بەڵام نیوەکەی دیکەی کە ئەمە بەشە ترسناکەکەی چیرۆکەکەیە نیوەی ئەو کەسانەی کە دووچاری شێتبوون دەبن، شانەکان و خانەکانی مێشکیان هیچ کێشەیەکیان نییە و سەلامەتن، چون کاتێک پشکنین بۆ باری دەروونی ئەو جۆرە کەسانە دەکرێت، دەردەکەوێت کە مێشکیان هیچ کێشەیەکی نییە و ئەوەندی مێشکی من و تۆ سەلامەت و تەندروستە.

دەی کەوایە، بۆچی ئەو جۆرە کەسانە شێت دەبن؟

ئەم پرسیارەم ئاڕاستەی، سەرۆکی پزیشکە دەروونییەکانی، یەکێک لە نەخۆشخانە بەناوبانگەکای کرد، ئەم دکتۆرە بە هۆی شارەزای و لێهاتووی لەم کارەدا، زۆرترین ڕێزی لێ گیرابوو و، خەڵاتی پیشەکەش کرابوون. بە هەستێکی ڕاشکاوانە پێی گوتم، کە خۆشی نازانێت، بۆچی خەڵک شێت دەبن. هیچ کەسێک بە دڵنیاییەوە ئەوە نازانێت، وەلێ ئاماژەی بە ئەوەیش کرد، کە ئەو کەسانەی شێت دەبن، هەر لە چوارچێوەی ئەو شێتییەدا، هەستی گرنگی بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن بە جۆرێک کە نەیاندەتوانی لە دونیای واقیعدا بەدەستی بهێنن، لەدوای ئەمە ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە:

"نەخۆشێکم لایە، کە لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا شکستی خواردووە و، بۆنی تراژیدیای لێ دێت. ئەو ئافرەتە خۆشەویستی دەویست، سێکسی دەویست، دەیویست منداڵ بنێتەوە و پلە و پایەکی کۆمەڵایەتی هەبێت، بەڵام ژیان تەواوی هیوا و خولیاکانی کرد بە بڵقی سەرئاو. مێردەکەی خۆشی نەدەویست، تەنانەت هەر ڕەتیشی کردەوە، کە خواردنی لەگەڵ بخوات و ناچاری دەکرد کە نانی بۆ بهێنێتە نهۆمی سەرەوە و، ژوورەکەی خۆی. هیچ منداڵێکی نەبوون، هیچ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی نەبوو، ئیتر بەمەیش بە جارێک شێت بوو لەبیر و خەیاڵی خۆیدا، لە مێردەکەی خۆی جیابووەتەوە و، ناوی پاکیزەیی خۆی بۆ گەڕاوەتەوە، پێی وایە وا شووی بە پیاوێکی خانەدانی ئینگلیز کردووە، لەسەر ئەوەش پێداگیری دەکات، کە بە خاتوو **سمیس** بانگی بکرێت."

سەبارەت بە منداڵیش، وا خەیاڵ دەکات، کە هەموو شەوێک منداڵێکی دەبێت، هەر جارێک بانگی دەکەم، دەڵێت: "دکتۆر، شەوی ڕابردوو منداڵێکم بووە."

ژیان، کەشتی خەون و خولیاکانی ئەم ژنەی وردوخاش کرد و، تێکی شکاند لە تاشەبەردەکانی واقیعدا بەڵام لە دوورگە خۆش و قەشەنگ و ساماڵەکانی شێتیدا، لە کەشتێکی دیکەدا زیندەگی دەکات.

ئایا ئەمە تراژیدیایە؟ ئاه من نازانم. دکتۆرە دەروونییەکەی پێی گوتم: "ئەگەر توانیبام دەستی بۆ بەرم و لە دوورگەی شێتیدا ڕزگاری بکەم، ئەوا ئەو کارەم نەدەکرد، چونکە بەم شێوەیە هەر زۆر دڵخۆشە."

ئەگەر هەندێک کەس برسی بەدەستخستنی هەستی گرنگین، بە جۆرێک هەر شێت دەبن لەپێناو بە دەستهێنانیدا، ئەوا خەیاڵ بکە، ئاخۆ ئێمە دەتوانین چ موعجیزەیەک بەدەست بخەین ئەگەر بە

ڕاستگۆیی دەست خۆشی و پێزانینمان بۆ ئەم دیوەی شێتبوونە هەبێت.

یەکێک لەو ئەمریکییانەی کە ساڵانە یەکملیۆن دۆلاری بە دەست دەخست "لە کاتێکدا هیچ باج نەبوو، کەسێک هەفتانە بڕی پەنجا دۆلاری بە دەست دەخست" بریتی بوو لە ***چارلز شواب***، ***شواب*** لەلایەن ***ئەندریو کارنگی*** هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی ببێت بە یەکەم سەرۆکی کۆمپانیانی پۆلا لە نەتەوەیەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٢١دا، لە کاتێکدا ***شواب*** تەنیا سی ساڵ بوو "لەدوای ئەوە، ***شواب*** ئەویی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی قسە لەسەر کەموکوڕی و کێشەکان بکات و توانی ئەو کۆمپانیایە بکات بە یەکێک لە کۆمپانیا بەسوود و بەکەڵکەکانی ئەمریکا."

بۆچی ***ئەندریو کارنگی***، ساڵانە یەکملیۆن دۆلاری دەدا بە ***شواب***، یان ڕۆژانە زیاتر لە سێهەزار دۆلاری پێ دەدا؟ بۆچی؟ چونکە ***شواب*** کەسێکی بلیمەت بوو؟ نەخێر، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، کە ئەو کەسێکی پیشەگەر و شارەزای پۆڵاو بوو؟ نا نەخێر. ***چارلز شواب*** خۆی پێی گوتم، کە زۆر کەس کار بۆ ئەو دەکات، کە زۆر لە ئەو شارەزاتر بوون لەو پیشەگەرییەدا.

***شواب*** دەڵێت بەڕادەیەکی زۆر ئەو پارەیەی پێدراوە، لەبەر توانای، لە ئەدای مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکدا. لێم پرسی، کە چۆن مامەڵەی لەگەڵ خەڵک کردووە، ئا ئەمەیە نهێنییەکەی کە لە چوارچێوەی چەند وشەیەکدا بەیانیکردن، وشانێک کە دەبێت بە بڕۆنز بنووسرێنەوە و لە هەموو ماڵ و خوێندنگەیەکدا، هەموو دووکان و نووسینگەیەکدا هەڵبواسرێن، وشانێک کە دەبێت منداڵان لەبەریان بکەن لە جیاتی لەبەرکردنی فرمانەکانی لاتینی یان بڕی باری بارانی ساڵانە لە بەڕازیلدا، ئەگەر ئەم وشانە بە کرداری بکرێن ئەوا ژیانی تۆش و منیش دەگۆڕن:

***شواب*** دەڵێت: "لەو توانایەمدا ورد دەبمەوە، کە هەمە، بۆ ئەوەی هەستێکی پڕ لە جۆش و خرۆش لەنێو خەڵکەکەمدا بخولقێنم، ئەوە مەزنترین سەرمایەیە، کە من هەمە، باشترین ڕێگەیش بۆ ئەوەی پەرە بەخەڵک بدەیت، بریتییە لەوەی هانیان بدەیت و سوپاس و ستایشت بەرانبەریان هەبێت."

"هیچ شتێک بوونی نییە، ئەوەندەی ڕەخنەی کەسانی بالاتر لە خۆت، ناخی مرۆڤ بکوژێت. هەرگیز ڕەخنەم لە هیچ کەسێک نەگرتووە، باوەڕم بە ئەوە هەیە، کە هانی خەڵک بدەم و پاڵنەرێک بم، لە کارەکانیاندا. لەبەر ئەوە خولیای ستایشکردنم و بێزاریشم لەبەرانبەر هەڵەدا، ئەگەر حەزم لە هەر شتێک بێت، ئەوا لە قووڵایی دڵمەوە سوپاس و ستایشم بۆی دەبێت و کەسێکی دەست بڵاو دەبم لە پێزانین و ستایشدا."

ئەمە ئەوەیە کە ***شواب*** کردوویەتی، بەڵام تێکڕای خەڵکی دیکە، چی دەکەن؟ تەواو پێچەوانەی ئەمە دەکەن. ئەگەر ئەوانە حەزیان لە شتێک نەبێت، ئەوا تووڕە دەبن، خۆ ئەگەر حەزیان لێ بێت، هەر هیچ شتێک ناڵێن. هەر وەکوو دەگوترێت: "کاتێک کارێکی خراپم کرد، دەستیان کردە چاوم، کە دوو کاری باشم کرد هەر هیچیان نەگوت."

***شواب*** دەڵێت: "لەمیانەی ژیانی خۆمدا، چاوم بە زۆر کەس و کەسانی گەورە کەوتووە، لە چەندین بواری هەمەچەشندا، هیچ تاکە کەسێکم نەبینیووە، کە کارێک بەرەو پێشەوە نەبات و ڕەنجێکی باشتر نەدات لەژێر باری ڕەزامەندی وەکوو لەوەی بە هەستێکی پڕ لە ڕەخنەوە بیکات."

بەڕاشکاوانە دەدوێت، یەکێک لە سەرکەوتنەکانی ***ئەندریو کارنگی*** ئەوە بووە کە بە شێوەیەکی تایبەتی و گشتی سوپاس و پێزانین و ستایشی یاریدەرەکانی دەکرد.

***کارنگی*** دەیویست ستایشی یاریدەرەکانی بکات، تەنانەت لە سەر کێلی گۆڕستانیشـدا، لەسـەر کـێلە بەردێـک نووسـیبووی: "لەم گـۆڕەدا، کەسێک پاڵکەوتووە، کە توانی بووی کەسانێک لە خۆی کۆ بکاتەوە، کە لە خۆی زیرەکتر و باشتر بوون."

ستایشـکردنی دڵسـۆزانە، یەکێـک بـووە لە نهێنییەکـانی سـەرکەوتنی، ***جۆن دی ڕۆکفێلەر*** لەبەرانەر مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکدا. بۆ نمـوونە، جارێکیـان یەکێک لە هاوکارەکانی ***ئێدوارد تـی بێدفۆرد***، یەکملیـۆن دۆلاری لەدەسـتدا لە کۆمپانیـا، بە کردنـی هەڵەیەک لە باشـووری ئەمریکـادا، ***جـۆن دی*** دەکرا و دەیتـوانی ڕەخـنەی لـێ بگێـرت، بەڵام ئەوەی دەزانی کە ***بێدفۆر*** باشـترین هەوڵـی خۆیداوە و ڕووداوەکەیش کۆتایی پێ هاتووە. لەبەر ئەوە ***ڕۆدفێلەر*** شـتێکی دۆزییەوە بۆ ئەوەی پێیەوە ستایشی بکات، پیرۆزبـایی لە ***بێدفۆرد*** کرد، چونکە لە توانایدا هەبووە، کە لە سەدا شەستی پارەکە بپارێزێت کە لەو کارەدا بەرهەم هێنرابوو.

***ڕۆکفێلەر*** گوتی: "شتێکی نایەبە، ئێمە هەردەم ئەم کارە ناکەین."

لەناو وردە کاغەزەکانمدا، چیرۆکێک کە دەزانـم هەرگیز ڕووی نەداوە، بەڵام ئەم چیـرۆکە ڕاسـتییەک ڕوون دەکـاتەوە، لەبەر ئەوە لێـرەدا دووبارەی دەکەمەوە.

بەگوێری ئەم چیرۆکە هیچە، ئافرەتێکی جووتیـار لە کۆتـایی ڕۆژێکـی پـڕ لە کارکردنـدا، هەنـدێکی کـای لەبەردەم پیاوەکانـدا دانـا، کاتێـک ئەوانیش ئاگری تورەییـان گرت و پرسـیان ئاخۆ شـێت بـووە، کەچـی ئەویش وەڵامـی دانەوە: "بـۆچی، چـۆن مـن بزانم کە ئێوە تێبینـی ئەوە دەکەن؟ بۆ ماوەی بیست ساڵە، من خواردن بۆ ئێوە ئامـادە دەکەم و، لە تەوای ئەو کاتەدا تەنانەت گوێ بیسـتی یەک تـاکە وشـە نەبووم بۆ ئەوەی ئەوە بزانم کە ئێوە کا ناخۆن."

کاتێک توێژینەوەیەک، لەسەر ئافرەتانی ڕا کردوو کرا، پێت وایە چ درکی پێ بکرێت، کە هۆکاری سەرەکی بێت بۆ ئەوەی، ئەو ئافرەتانە ڕا بکەن؟ هۆکارەکە بریتی بوو، لە "کەمی هێزی ستایشکردن و پێزانین" دڵنیاشم ئەگەر توێژینەوەیەکی هەمان شێوە لەسەر مێردەکان بکرێت هەر ئەمان هۆکاری دەبێت. ئێمە هەرگیز ئەوەندە سوپاس و ستایشی هاوسەرەکانمان ناکەین و پێزانینمان بۆیان نییە.

ئەندامێکی پۆلەکەی ئێمە، داوایەکی کرد کە لەلایەن خێزانەکەیەوە سەرچاوەی گرتبوو، خۆی و پیرێکی دیکەی ئافرەتان لە کڵێساکەیاندا، بەشداریان لە بەرنامەیەکی بەرەوپێش چوونی خوود کردبوو. داوای لە مێردەکەی کردبوو، کە یارمەتی بدات بەوەی کە لیستێکی بۆ ئامادە بکات و تێیدا شەش شت بنووسێت کە خۆی بڕوای پێیەتی یارمەتیدەر دەبن، بۆ ئەوەی خێزانەکەی باشتر بێت. ئەوەی بۆ قوتابییەکان گێڕایەوە: "سەرسام بووم بە داوایەکی لەم شێوەیە، ڕاشکاوانە بدوێم، پڕکردنەوەی لیستێکی شەش شتی، بۆ من کارێکی ئاسان بوو کە حەز دەکەم دەربارەی ئەو بگۆڕدرێم، ئەڵا خودایە، ئەویش دەیتوانێت هەزارن شت لە لیستێکدا جێگە بکاتەوە، بۆ ئەوەی من لە خۆمیاندا بگۆڕم، بەڵام ئەوەم نەکرد. پێیم گوت: "ڕێگە بدە بیری لێ بکەمەوە و لە بەیانیدا وەڵامت دەدەمەوە." بەیانی دواتر زوو لە خەو هەستام، بانگی گوڵفرۆشەکەم کرد و، شەشدانە گوڵی سوورم بۆ خێزانەکەم ناردن، لەگەڵ نامەیەک، کە تێیدا نووسیبووم: "ناتوانم بیر لە شەش شت بکەمەوە، کە حەز بکەم تۆ لە خۆتیاندا بگۆڕیت، بەو شێوەیەی کە هەیت من تۆم خۆش دەوێت."

"کاتێک ئەو ئێوارەیە گەیشتمەوە ماڵەوە، پێت وایە کێ لە بەردەرگای ماڵ سڵاوی لێ کردبم: ئەوە ڕاستە، خێزانەکەم بوو! خەریک بوو، ئەسرین لە چاوەکانی دەبارین، پێویست بە گوتن ناکا، زۆر دڵخۆش و

شـادمان بـووم، بەوەی کە ڕەخـنەم لێـی نەگرتبـوو لەوەی کە داوای کردبوو."

"لە ڕۆژانـــی یەکشـــەممەی داهـــاتوودا، لە کەنیســـەدا لەدوای ئەوەی ڕاپۆرتی لەسـەر ئەرکی خۆی بەرز کردبوویەوە، چەندین ئافرەت کە لەگەڵ ئەو توێژینەوەیان دەکرد هـاتنە لام و گوتیـان: 'ئەمە جـوانترین شت بووە، کە تاوەکوو ئێستا بەر گوێم کەوتووە.' ئەمە ئەو کاتەبوو کە درکم بە هێزی ستایشکردن و پێزانین کرد."

***فلۆرێنز زیگفێلدا*** بەرهەمهێنی سـەرنجڕاکێش، کە لە بڕۆدوەی چـاوی ڕێشکەوپێشـەکەی دەکرد، ناوبـانگی خۆی بەدەسـت خسـت، بە هـۆی توانـایەوە "بـۆ ئەوەی شکۆ بۆ کچانی ئەمریکا دابنێت،" کـات لەدوای کـات وردە مەخلـوقی دەبـردن، کە هـیچ کەسـێک دوو جـار سـەیری نەدەکردن، ئەوانەی بـردە سـەر تەختـی شـانۆ و، دیمەنێکی جـوانی و شاراوە و فریودان. بەهای پێزانین و بڕوابەخۆبوونی دەزانـی، وای لە ئافرەتـان دەکـرد، کە هەسـت بە جـوانی بـکەن، لە ڕێـگەی هێـزی جـوامێری و تێڕامـانەوە. کەسـێکی کـرداری بـوو، مـوچەی ئافرەتـانی کۆرسی لە سی دۆلارەوە بۆ سەدوحەفتاوپێنج دۆلارە بەرز کردەوە. هەروەها کەسێکی جوامێر و نەبەرد بوو، لە شـەوانی فلۆیسـدا، نـامەی بـۆ ئەسـتێرەکان دەنـارد و، هەمـوو کۆرسـێکی کچـانی لە نمایشـدا بە گوڵی جوانی ئەمریکی گوڵاوی دەکرد.

جارێکیـان، پەنـام بـردە بەر ڕۆژووگـرتن و، بـۆ مـاوەی شـەش شـەو، شـەش ڕۆژ هـیچم نەخـوارد. ئەمەیـش شـتێکی سـەخت نەبـوو، بەڵکـو بگرە لە ڕۆژی شەشەمدا کەمتر هەسـتم بە برسـییەتی دەکرد، وەکوو لە ڕۆژی دووەم، هێشتا دەزانم هەر وەکوو تۆیش دەزانیت، کەسـانێک پێیـان وایە کە تـاوان دەکەن ئەگەر لـێ گەڕێـن خێزانەکانیـان یـاخود کارمەندەکانیان بۆ ماوەی شەش ڕۆژ بەبێ خـواردن بمێننەوە، کەچـی ڕێگە دەدەن شەش ڕۆژ و شەش هەفتە، هەندێک جار شـەش ساڵ ڕێ

دەکەن بەبێ ئەوەی سوپاس و ستایشێک لە ناخی دڵیانەوە پێش کەش بە ئەوان بکەن، لە کاتێکدا ئەم جۆرە سوپاسکردنە خۆراکی گیان و ڕۆحە.

کاتێک *ئەلفرید لونت* یەکێک لە ئەکتەرە مەزنەکانی سەردەمی خۆی، ڕۆڵی گێڕا لە یەکخستنەوەی ڤیەننا، گوتی: "پێویستم بە هیچ شتێک نییە ئەوەندەی پێویستم بە تێرکردنی ڕێزی خودی هەیە."

ئێمە خۆراکی لەش دەدەین بە منداڵەکانمان، هاوڕێکانمان، کارمەندەکانمان، بەڵام چۆن خۆراک و هێز و وزەی ڕێزی خودیان پێ دەدەین؟ ئێمە گۆشت و پەتاتەیان پێ دەدەین بۆ ئەوەی هێز و وزەیان بە بەردا بکەین، بەڵام ئەوەیش فەرامۆش دەکەین بۆ ئەوەی جۆرە وشانێکیان بە گوێدا بچرپێنین، کە بۆنی سوپاس و ستایش و پێزانینیان لێوە بێت، کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە بیرەوەریاندا دەمێنێتەوە وەکوو میوزیکی ئەستێرەکانی بەرەبەیان.

*پۆل هارڤی*، لە یەکێک لە بەرنامەکانی ڕادیۆیدا، "پاشماوەی چیرۆکەکە" ئەوەی بەیان کردبوو کە چۆن دەستخۆشی و پێزانینێکی دڵسۆزانە ژیانی کەسێک دەگۆڕێت، ئەوەی باس کردبوو کە ساڵانێک لەمەوبەر مامۆستایەک، لە دیترۆیت لە ستیڤ مۆریسی، داوای یارمەتی لێ کرد، بۆ ئەوەی مشکێک بدۆزنەوە، کە لە پۆلەکەدا بزر بووە. دەزانیت ئەو ڕاستییەی بەرز نرخاند، کە سروست شتێکی بە **ستیڤ** بەخشی بوو، کە هیچ کەسێکی دیکە لە ژوورەکەدا پێی نەبەخشرابوو. سروشت دوو جووتە گوێی باشی پێبەخشی بوو وەکوو قەرەبوو کردنەوەیەک بۆ چاوە کوێرەکانی. بەڵام ئەمە بۆ یەکەم جار بوو، کە **ستیڤ** دەستخۆشی لێ بکرێت و پێی بزانرێت، بە هەبوونی ئەو دوو گوێ بەهرەدارانە.

ئێستا لەدوای تێپەڕبوونی ساڵانێک، دەڵێت، کە ئەم ڕەفتارەی بەرزنرخاندنە دەستپێکی نوێی ژیان بووە. دەبینی، لەو کاتە بەدواوە

دیاری بیستی بەرەو پێشەوە برد و پەرەی پێدا و، بەردەوام بوو هەتاوەکوو بوو بە *ستیف واندەر*، یەکێک لە گۆرانی بێژە هەرە ناوازەکانی پۆپ و گۆرانی نووسەکانی حەفتاکان.

هەندێک لە خوێنەران، هەر ئێستا کە ئەم چەند دێڕەیە دەخوێننەوە دەڵێن: "ئای، ع قسەیەکی هیچە! ماستاوکردنە!" خۆم ئەم شێوازەم تاقیکردووەتەوە، بەڵام کاریگەری نییە، لەگەڵ کەسانی زیرەکدا کاریگەری نابێت."

بە دڵنیاییەوە، بە دەگمەن چەکی ماستاوکردن کاریگەری دەبێت، لەگەڵ کەسانی زیرەکدا. ئەمە نادڵسۆز و ئەمانی و هیچە. لەبەر ئەوە هەر دەبێت شکست بخوات و هەروایش دەبێت. ڕاستییەکە ئەوەیە، هەندێک کەس هەر زۆر برسین، زۆر تینوون، بۆ ئەوەی دەستخۆشیان لێ بکرێت و پێیان بزانرێت بە جۆرێک هەموو شتێک قوت دەدەن، هەر وەکوو پیاوێکی برسی کە گژوگیا و کرم دەخوات.

تەنانەت شاژنە *ڤیکتۆریاش*، کەوتووەتە ژێرباری ماستاوکردنەوە، سەرۆک وەزیران *بێنجامین دسرایل* دانی بە ئەوەدا ناوە کە لەبەرانبەر مامەڵەکردنی لەگەڵ شاژندا ماستاوی کردووە. بۆ ئەوەی وشە دەقیقەکانی خۆی بەکار بهێنێت، گوتوویەتی: "بڵاوی بکەوە لەسەر خاولییەک." بەڵام *دسرایل* یەکێک بووە لە هەرە زیرەک و شارەزاکان کە فەرمانڕەوای ئیمپراتۆریەتی بەریتانیانی کردووە. کەسێکی بلیمەت بوو، ئەوەی بۆ ئەو کاری کردووە بە ئەندازەیەکی پێویست کار بۆ من و تۆ ناکات.

بە شێوەیەکی مەودا دوور ماستاوکردن، زیاتر لە کردنی کاری باش ئازارت دەدات. ماستاوکردن بریتییە لە ساختەکردن، هەر وەکوو ساختەکردنی پارە، ئەگەر بیدەی بە کەسێکی دیکە دواجار هەر دوچاری کێشە و گرفتت دەکات.

ئێ کەوایە جیاوازی چییە، لەنێوان ماستاوکردن و ستایشکردن؟ ئەمە سادەیە، یەکێک لە ئەوانە دڵسۆزانەیە و ئەوی دیکە دووڕوویییە. یەکێکیان لە قووڵایی ناخ سەرچاوە دەگرێت و، ئەوی دیکەیش لە لێوانەکانەوە هەڵدەقوڵێت. یەکێکیان ئەمانی نییە و، ئەوی دیکەیان تەواو ئەمانی هەیە. یەکێکان لە گەردووندا بایەخی هەیە و ئەوی دیکەشیان بێبایەخ و جێگەی نارەزاییە.

لەم دواییانەدا، نیوە پەیکەری قارەمانێکی مەکسیکیم بەرچاو کەوت، ژەنەڕاڵ ***ئەلڤارۆ ئەبریگۆن***، لە کۆشکی چاپولتیپیک لە شاری مەکسیۆ، لەژێر پەیکەرەکەدا ئەم وشە زێڕینانە هەڵکەندرابوون: "لەو دوژمنانە مەترسە، کە پەلامارت دەدەن، بەڵکو لەو هاوڕێیانە بترسە کە ماستاوت بۆ دەکەن."

نا، نا، نەخێر! من لێرەدا پێشنیاری ماستاوکردن نادەم؟ بەڵکو هەر دوور لەمە من دەربارەی ڕێگایەکی نوێی ژیانکردن دەدوێم، ڕێگە بدە، دووبارەی بکەمەوە، من دەربارەی ڕێگایەکی نوێی ژیانکردن دەدوێم.

شاجۆرجی پێنجەم، کۆمەڵێک دانای هەبوو، لە چوارچێوەی دیوارەکانی کۆشکی بەکینگهام، یەکێک لەو دانایانە گوتی: "فێرم بکە کە سوپاس و ستایشێکی هەرزان پێشکەش بکەم، نەک پێشکەشم بکرێت." ئا ئەمەیە ماستاوکردن، ستایشکردنێکی هەرزان. جارێکیان پێناسەی ماستاوکردنم خوێندەوە، دەکرێت شیاوی دووبارەکردنەوە بێت: "ماستاوکردن بریتییە لە شتێک، کە بە کەسی بەرانبەر دەگوترێت، بە شێوەیەکی ورد و درشت لەوەی کە خۆی بیری لێ دەکاتەوە."

***ڕاڵف والدۆ ئیمێرسن*** گوتی: "ئەو زمانە بەکار بهێنە، کە خۆت حەزی پێ دەکەیت، ناتوانیت هیچ شتێک لە دەرەوەی کەسایەتی خۆت بڵێیت، جگە لەوەی کە لە هەگبەتدایە."

ئەگەر چەکی دەستی ئێمە ماستاوکردن بێت، ئەوا هەموو کەسێک دەتوانێت ئەوە بکات و، هەموومان دەتوانین، لە پەیوەندییەکانی مرۆڤدا ببین بە کەسێکی شارەزا.

کاتێک ئێمە وابەستەی جۆرێک لە بیرکردنەوە نابین، دەربارەی کێشەیەکی ڕوون و ئاشکرا، ئەوا ئێمە سەدا نەوەدوپێنجی کاتمان بە بیرکردنەوە دەربارەی خۆمان بەسەر دەبین. ئێستا خۆ ئەگەر بۆ ماوەیەک لە بیرکردنەوە، دەربارەی خودی خۆمان بوەستین و، بیر لە خاڵەباشەکانی خەڵکی دیکە بکەینەوە، ئەوا هیچ ناچاری ئەوە نابین، کە پەنا بۆ ماستاوکردنێکی ئەوەندە هەرزان و هەڵە بەرین، بە جۆرێک هەر بەر لەوەی لە دەممان بێتە دەرەوە درکی پێ دەکرێت.

یەکێک لە هەرە ڕەفتارە بەرزە فەرامۆشکراوەکانی ژیانی ئێمە بریتییە لە ستایشکردن و پێزانین، تاڕادەیەک ئێمە ستایشیکردنی کوڕەکەی خۆمان فەرامۆش دەکەین یان کچەکەمان کاتێک، کاتی ڕاپۆرتێکی باشمان بۆ دەهێننە ماڵەوە و، ئێمەیش شکست دەخۆین لەوەی هانی منداڵەکانمان بدەین کاتێک لە سەرەتادا سەرکەوتن تۆمار دەکەن. لە ئامادەکردنی کێک یان دروستکردنی کۆلارەیەک. هیچ شتێک نابێتە مایەی دڵخۆشبوون و شادبوونی منداڵان هێندەی پێدانی ڕەزامەندی و حەزێک، کە لە ناخەوە ڕەگی گرتبێت.

جاری داهاتوو کاتێک چێژ لە گۆشتی ڕەشەوڵاخ دەبینیت، لە خواردنگەدا، ئەوا ڕستەیەکی پڕ لە ستایش بۆ شێفەکە ئامادە بکە و، کاتێک فرۆشیارێکی شەکەت ڕەفتارێکی نا ئاسایی بەرجەستە دەکات، تکایە ئاماژەی پێ بکە.

هەموو وانەبێژێک، شالیارێک، وتاربێژێک بێوری خۆی دەزانێت کاتێک، دێتەگۆ لەبەردەم جەماوەر و، هیچ تاکە وشەیەکی سوپاس و پێزانینی ئاڕاستە ناکرێت. ئەوەی بەسەر کەسانی لێزان و شارەزادا جێبەجێ دەبێت، بەسەر کرێکارانیشدا جێبەجێ دەبێت لە نوسینگە،

دوکـــان، کـــارگە و، خێـــزان و هاوڕێکانمانـــدا. لە پەیوەنـــدییە کۆمەڵایەتییەکانماندا هەرگیز نابێت ئەوە لە بیر بکەین، هەموو ئەوانی لە دەوروبەرمانن، ئەوانیش هەر مرۆڤن و برسی سوپاس و پێزانینن. ئەوە حەزێکی یاسایی خۆمانە، کە ڕۆحمان چێژی لێ دەبینێت.

هەموو ڕۆژێـک سـوپاس و ستایشـێکی هاوڕێیـانە، لەدوای گەشـتی ڕۆژانەی خـۆت بەجـێ بهـێڵە، لەبەرانـبەر ئەمەدا سەرسـام دەبیـت، کە چۆن گڕی بچووکی پەیوەندیی هـاوڕێیەتی بەرز دەبێتەوە، کە دەبێت بە مۆرکێکی گوڵی بۆ سەردانی داهاتووت.

***پـــامێلا دەنهـــام***ـــی نیـــو فێیەرفیڵـــدا، کـــۆنێکتیکەت، لەنێـــو بەرپرســـیاریەتییەکانیدا لەمـــاوەی کارەکەیـــدا، سەرپەرشـــتیاری دەرگـــاوانێکە کە کـــارکەرێکی زۆر کەڕ و لاواز و هـــیچ هەبـــوو. کارمەندەکانی دیکە گاڵتەیان پێ دەکرد و، نیشانی بدەن، کە چ کارێکی خراپی هەیە. ئەمە هەر زۆر خـراپ بـوو، لەو دوکـانەدا کـاتی پڕبەهـاو بەرهەمێنەر لەدەست دەرچوو.

بەبـێ سـەرکەوتن، ***پام***، چەنـدین ڕێگـای هەمەچەشـنی گـرتە بەر بـۆ ئەوەی هـانی ئەو کـابرایە بـدات. جاروبـار درکـی بەوە دەکـرد، کە کارەکەی کەمێک باشە. کارێکی ئەوتۆی کرد بۆ ئەوەی ستایشی بکەن لەبەردەم ئەوانـی دیـکە. هەر ڕۆژێـک ئەو کـارەی کە دەیکـرد بەرەو کەشێکی باشتری دەبرد، ئەوەندەی پێ نەچوو کارەکەی بە شێوەیەکی کـارامە و چووسـت و چـالاک بەڕێـوە دەبـرد. لە ئێسـتا ئەو کـارێکی نایاب دەکات و، کەسانی دیکەیش سوپاس و پێزانینی ئاڕاستە دەکەن. بە سـوپاس و پێزانینێکـی ڕاسـتگۆیانە ئەنجـامێکی بەدەسـت خسـت، کە تێیدا گاڵتەکردن و ڕەخنەگرتن چۆکی لەبەردەمدا دادا.

ئـازاردانی خەڵـک نەک هەر نایـان گۆڕێـت، بەڵکو هەر نابێت ئازاریـان بدرێت. گوتەیەکی کۆن هەیە کە من لە ئاوێنەکەی خـۆمم داوە، هەمـوو ڕۆژێک بەرچاوم دەکەوێت.

من بیرەدا ڕەت دەبم، بەڵام جاریکیان هەر کاریکی باش کە لە دەستم دیت بیکەم یان نواندنی هەر میهرەبانییەک، کە دەتوانم بە ڕووی هەر مرۆڤیکدا بیکەم، لیم گەڕێ با ئیستا بیکەم. لیم گەڕێ با دوای نەخەم، بەمەیش دووبارە بەم ڕییەدا ڕێ ناکەمەوە.

*ئیمیرسن* دەڵیت: "چاوم بە هەر پیاویک بکەویت لە ڕوویەکەوە، لە من باشترە و، بەمەیش لییەوە فیر دەبم."

ئەگەر ئەمە لە دیدگای *ئیمیرسن*ـە ڕاست و دروست بیت، ئەی ناگونجیت هەزار ئەوەندەیش بۆ من تۆ ڕاست و دروست بیت؟ با کەمیک لە بیرکردنەوە لە دەستکەوت و کارامەییەکانی خۆمان، ویستەکانی خۆمان بوەستین، با هەوڵ بدەین خاڵە باش و ئەرینییەکانی خەڵکی دیکە بەیان بکەین و درکیان پێ بکەین. "لە قووڵایی دڵتەوە ستایشی خەڵک بکە و، کەسیکی بەخشندە بە لە سوپاس و ستایکردندا." خەڵکیش ئاگاداری وشەکانت دەکات و، بەرز ڕایان دەگریت و، لە ماوەی ژیانکردنیاندا دووبارەیان دەکەنەوە، چەند ساڵانیک دووبارەیان دەکەنەوە، کە هەر تۆ لە بیریشت نەماون.

**"سوپاس و پیزانینیکی دڵسۆزانە و ڕاستگۆیانە، ئاراستەی کەسانی دەوروبەرت بکە."**

## تەکنیکی سێیەم

### "هەر کەسێک بتوانێت ئەمە بکات هەموو جیهان لەگەڵ ئەودایە ئەوەی ناتوانێت ئەمەش بکات بە تەنیا ملی ڕێگا دەگرێتەبەر"

زۆر جار لە وەرزی هاویندا دەچووم بۆ ڕاوەماسی لە مەین. وەکوو خوودی خۆم زۆر حەزم لە تووفەرەنگی و کریمە، لەبەر هەندێک هۆکاری سەیریش، درکم بەوە کرد ماسی حەزی بە کرمە، ئیتر کاتێک خۆم دەچووم بۆ ڕاوەماسی، گرنگیم بەوە نەدەدا، کە خۆم چیم دەوێت بەڵکو بیرم لەوە دەکردەوە، کە ئاخۆ ماسییەکان چیان دەوێت. تووفەرەنگی و کریمم بەسەری قولابەکەوە نە دەکردن، بەڵکو زیاتر لەمە، کرم و کوللەم شۆڕدەکردنەوە بۆ ناو ئاوەکە و، دەمگوت: "ئایا حەز ناکەیت ئەوەت بە دەست بکەوێت؟"

کەوایە بۆچی لە ڕاوکردنی مرۆڤەکانیشدا هەمان تەکنیک بە کار نەهێنین؟

ئەمەیش هەر ئەوەیە کە ***لوید جۆرج*** سەرۆک وەزیرانی مەزنی بەریتانیان، لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانی کردی، کاتێک کەسێک پرسیاری لێ کرد، چۆن مانەوەی خۆی لە دەسەڵاتدا مسۆگەر دەکات، لەدوای ئەوەی ئەو سەرکردانە بەنێویدا ڕێیان کردووە، ***ویلسن***، ***ئۆرلاندۆ*** و ***کلیمێنسۆ*** لەبیر کراون. ئەویش لە وەڵامدا گوتی: ئەگەر گەورەیی مانەوە لەو پێگەیەدا بۆ شتێک بگەڕێتەوە، ئەوا ئەو شتە ئەوەیە فێری ئەوە بووە کە "ئەو تامە بەکار بهێنێت کە لەگەڵ نێچیرەکانیدا بگونجێت."

کەوایە، بۆ دەربارەی ئەوە دەدوێین کە خۆمان دەمانەوێت؟ ئەمە شتێکی منداڵانەیە، شتێکی پرووپووچە. بە دڵنیاییەوە حەز بە ئەوە دەکەیت کە خۆت دەتەوێت. هەر لە ڕاستیدا تامەزرۆی ئەو شتەیت کە

خـۆت دەتەوێـت بەڵام هـیچ کەسـێکی دیـکە وەکـوو تـۆ نیـیە، تەواوی ئـێمەیش هەر وەکـوو تـۆ وایـین، تـامەزرۆیی ئەوەیـن و چێـژ لەوە دەبینین کە خۆمان دەمانەوێت.

لەبەر ئەوە تاکە ڕێگەیەک لەسەر زەویدا، بۆ ئەوەی پێیەوە بچییە دڵی خەڵکەوە ئەوەیە، قسـە دەربـارەی ئەوە بـکەی کە ئەوان دەیانەوێـت و نیشانیان بدەی کە چۆن بە دەستی بخەن.

لەبیرت بێت، کاتێک بەیـانی هەوڵ دەدەی بـۆ ئەوەی کەسـێک شـتێک بکـات، بـۆ نمـوونە ئەگەر ناتەوێـت منـداڵەکانت جـگەرە بکێشـن، ئەوا ئامۆژگـاری مەکە و، دەربـارەی ئەوە مەدوێ کە خـۆت دەتەوێت بەڵام نیشـانیان بدە، کە دەکرێت جگەرەکێشـان ئەوان لە کردنـی یـاری تـۆپی سەبەتە یاخود لە یاری ڕاکردندا بێبەش بکات.

شتێکی زۆر باشە، کە ئەمەت لە بیر بێت جا گرنـگ نییە مـامەڵە لەگەڵ مرۆڤ بکەی یان لەگەڵ مەیموون بکەی، بۆ نموونە ڕۆژێکیـان ***ڕالف والدۆ ئیمێرسن*** و کـوڕەکەی، هەوڵیاندا بـۆ ئەوەی گۆلکێک بـکەنە نـاو تەویـلەوە، بەڵام ئەوانە تەنیـا بیریـان لە هەڵەیەکـی بـاو دەکـردەوە بەوەی، کە خۆیـان چییـان دەوێـت. ***ئیمێرسـن*** پـاڵی دەنـا و، کـوڕەکەی ڕایـی دەکێشـت. کەچـی گـۆلکەکە ئەوەی دەکـرد، کە خـۆی دەیویسـت، تەنیـا بیـری لەوە دەکـردەوە، کە خـۆی چـی دەوێـت، ئیتـر لاقەکـانی لە زەوی جێگرکردن و ڕەتی کردەوە، کە لە وەرگاکە بەجێ بهێڵێت.

کـارەکەرێکی ئێرلەنـدی ئەو دیـمەنەی بینـی، ئەو ئـافرەتە نەیـدەتوانی گوتار بنووسێت و کتێب دابنێت، کەچی بەلایەنی کەمەوە، لەم بوارەدا شـارەزایی زیـاتری لە ***ئیمێرسـن*** هەبـوو، بیـری لەوە کـردەوە کە ئـاخۆ ئەو گۆلکە چی دەوێت، بەمەیـش هـات پەنـجەی خسـتە دەمـی گۆلکەوە بۆ ئەوەی بیمژێت، ئیدی بەو شێوەیە گۆلکەکەی بردە ناو تەویلەکەوە.

هەر ڕەفتارێکت نواند بێت، هەر لەو ڕۆژەی کە چاوت بە دونیان هەڵهێناوە، لەبەرانبەر ئەوەدا بووە کە تۆ شتێکت ویستووە، ئەی چی دەربارەی ئەو کاتەی کە کۆمەکییەکی باشت پێشکەش بە خاچی سوور کرد؟ بەڵێ، تەنانەت کردنی ئەم کارەیش لە چوارچێوەی ئەم یاسایەدا سەروەدەر نانێت. تۆ ئەو کارە خۆبەخشییەت، پێشکەش بە خاچی سوور کردووە، چونکە تۆ ویستووتە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەی، ویستووتە کارێکی ئاسمانی دوور لە ئەمانی و جوان بکەی. "ڕاستیتان پێ دەڵێم، هەرچییەکتان بۆ یەکێک لەم برا بچووکانەم کردووە، بۆ منتان کردووە."

ئەگەر تۆ ئەو هەستەت، زیاتر لە ویستی پارە نەبووایە، ئەوا هەرگیز ئەو کۆمەکییەت نەدەکرد. بە دڵنیاییەوە دەکرێت ئەو کارەت کردبێت، چون هەستت بە شەرمەزاریی کردووە ئەگەر ڕەتت بکردایەوە یاخود لەبەر ئەوە بووە، کڕیارێک داوای لێ کردووی بۆ ئەوەی ئەوە بکەی. بەلام شتێکی دڵنیایی بوونی هەیە، تۆ ئەو کۆمەکییەت کردووە لەبەر ئەوەی شتێکت ویستووە.

***هاری***، ئەی، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی "کاریگەری خستنەسەر ڕەفتاری مرۆڤ" دەڵێت: "هەموو ڕەفتارێک لە قووڵایی حەزی ئێمەوە سەرچاوە دەگرێت، باشترین ئامۆژگاریش بۆ ئەو کەسانەی کە هەوڵی قەناعەتپێکردن دەدەن جا لە کار، ماڵ، خوێندنگە و سیاسەتدا بێت ئەوا یەکەم جار، لە ناخی کەسی بەرانبەردا ئارەزوو و ویستێک دروست بکە، ئەو کەسەی کە دەتوانێت ئەمە بکا، ئەوا تەوای جیهان لەگەڵ ئەودا ڕێ دەکات، خۆ ئەوەی کە ناتوانێت لەگەڵ ئەمەدا ڕێ بکات ئەوا بە تەنایی ملی ڕێگا دەگرێتەبەر.

***ئەندرو کارنگی*** گەنجێکی نەداری سکۆتلەندی، دەستی بە کارکردن کرد، بۆ ماوەی نیو کاتژمێر و دواجار ٣٦٥ ملیۆن دۆلاری لە دەست چوو. هەر لە سەرەتای ژیانییەوە فێر ببوو کە تاکە ڕێگەیەک بۆ

ئەوەی پێیەوە بچیە ناو دڵی خەڵکەوە ئەوەیە، لە لە دیدگای کەسی بەرانبەرەوە بدوێیت، کە چی دەوێت. تەنیا بۆ ماوەی چوار ساڵ ڕۆیشتە قوتابخانە لە کاتێکدا فێر بوو کە چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکات.

بۆ ئەوەی کورت و ڕوونی بکەمەوە: براژنی زۆر نیگەران و نەخۆش بوو، بەدەم دوو کوڕەکەیەوە، ئەوانە لە یەل بوون و، زۆر سەرقاڵی کاروبارەکانی خۆیان بوون، ئیتر لەبیریان کرد، کە نامە بۆ ماڵەوە بنێرنەوە و، هیچ گرنگییان بە نامەکانی دایکیان نەدەدا.

***کارنگی*** گرەوی لەسەر سەد دۆلار کرد بەوەی، کە دەتوانێت وەڵام بەدەست بخات لەڕێگەی پۆستەوە هەر بەبێ ئەوەی داواشی بکات. بەمەیش نامەیەکی بۆ ئامۆزاکانی نووسی و، تێیدا ئاماژەی بەوە کردبوو، کە وا بەنیازە سەر و پێنج دۆلاریان بۆ بنێرێت.

لەبیری چووبوو کە پارەکە بخاتە ناوی.

هێندەی پێنەچوو، لە ڕێگەی پۆستەکەوە، وەڵامی نامەکە گەڕایەوە و، تێیدا نووسرابوو: "مامە ***ئەندریو*** گیان، سوپاست دەکەین بۆ ناردنی ئەو نامە جوانەیە، خۆت دەتوانی کۆتایی بە ڕستەکە بهێنیت.

نموونەیەکی دیکە لەبەرانبەر قایلکردنی خەڵکدا، لە ***ستان نۆڤاکی کلیڤلاند***، ئۆهایۆوە سەرچاوە دەگرێت، بەشداربوویەک لە خوولەکەی ئێمەدا بەشداری کردووە. ***ستان*** ئێوارەیەکیان لە کار گەڕایەوە، بۆ ئەوەی منداڵە بچکۆلانەکەی بدۆزێتەوە، بەناوی ***تیم***، کە لە ژووری دانیشتندا هاواری دەکرد. کە دەبووایە بچێت بۆ باخچەی ساوایان و ئەویش شین و ڕۆڕۆی دەکرد و دەیگوت ناچم.

کاردانەوەی ئاسایی ***ستان*** ئەوە بوو، کە منداڵەکەی لە ژوورەکەی دەربکات و، پێی بڵێت کە وا باشترە بڕیار بدات بۆ ئەوەی بڕوات، هیچ بژاردەیەکی لە بەردەستدا نییە. بەڵام ئەم شەو، دەیزانی کە لە ڕاستیدا

ئەمە یارمەتیدەر نابێت، کە **تیم** بچێت بۆ باخچەی ساوایان لە کەشێکی ئەوهای دەروونیدا، ***ستان*** دانیشت و بیری کردووە، "ئەگەر من لە جێگەی **تیم** بوومایە، بۆچی دەبووایە دڵخۆش بم بە چوونم بۆ باخچەی ساوایان؟" خۆیی و خێزانەکەی تەواوی ئەو شتە باشانەیان بەدەست خست، کە **تیم** حەزی پێ دەکردن، وەکوو بۆیە، گوتی گۆرانی و پەیداکردنی هاورێ، پاشان ئەمانەیان خستنە بواری جێبەجێکردنەوە.

"هەموومان بەیەکەوە لەسەر مێزی چێشتخانەکە دەستمان بە وێنەکێشان کرد – خێزانەکەم ***لیل***، کورەکەم **بۆب** و خۆشیم، هەموومان کاتێکی خۆشمان بەسەر دەبرد. ئەوەندەی نەبرد کە **تیم** بەدزیەوە لە گۆشەیەکەوە سەیری دەکردین، بۆ جاری داهاتوو لەبەریان دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی بەشداریمان لەگەڵ بکات.

"ئای، نەخێر! تۆ سەرەتا دەبێت بچی بۆ باخچەی ساوایان، بۆ ئەوەی فێری وێنەکێشان بیت." بەجۆش و خرۆشێکەوە تەواوی هەوڵی خۆمدا و، لە دیدگای ئەو شتانەوە قسەم بۆی دەکرد کە دەیتوانی لێم تێ بگات، پێم گوت کە دەتوانێت تەواوی ئەو خۆشییانە لە باخچەی ساوایان بەدەست بهێنێت.

بەیانی داهاتوو، پێم وابوو، من یەکەم کەس بووم کە خەبەرم بوویەوە، ئیتر ڕۆیشتمە خوارەو و ، بینیم وا تیم لە ژووری نووستن، لەسەر کورسی پرخەی خەوی دێت. پرسیم، "چی دەکەی لێرە؟"

– چاوەڕێ دەکەم، بۆ ئەوەی بچم بۆ باخچەی ساوایان و، نامەوێت دوابکەوم.

ئەو جۆش و خرۆشە گەرمەی خێزانەکەی ئێمە، لە ناخی **تیم**دا ڕەنگی دابوویەوە، هەستێکی پڕ لە پەرۆشی، کە هیچ گفتوگۆیەک یاخود ترسێک نەیدەتوانی لە ناخی ئەودا بەم شێوەیە دروستی بکات

بەیانی دەکرێت بتەوێت کەسێک قایل بکەی، بۆ ئەوەی شتێکت بۆ بکات، بەر لەوەی قسە بکەی، بوەستە و لە خۆت بپرسە: "چۆن دەتوانم وا لەو کەسە بکەم، کە ویستی کردنی ئەو کارەی هەبێت؟"

ئەم پرسیارە وامان لێ دەکات کە بوەستین لەوەی کە بە شێوەیەکی لاسار خۆمان بە دۆخێکدا بکەین بە جۆرە قسە کردنێک کە خاڵی بێت لە حەز و ویستەکانی خۆمان.

ماوەیەک ڕاهاتبووم کە ئوتێلێک بە کرێ بگرم لە شاری نیو یۆرکدا، لە هەر وەرزێکدا بۆ ماوەی بیست شەو، هۆڵێکی سەرنجڕکێشم بەکرێ دەگرت، بۆ ئەوەی وانەکانی خۆمی تێدا بڵێمەوە.

لەسەرەتای وەرزێکدا، هەر کتوپڕ ئاگادار کرامەوە، کە دەبێت سێ ئەوەندەی پێشتر کرێ بدەم، ئەم هەواڵەم لەدوای ئەوەی بلیتەکان ڕاکێشرابوون و، دابەشکرابوون و، ڕیکلام لەهەموو لایەکەوە کرابوو پێگەیشت.

بە شێوەیەکی سروشتی من نەم دەویست ئەو کرێ زیادەیە بدەم، بەڵام چ سوودێک لەمەدا بوونی هەیە ئەگەر بچمە لای خاوەن هۆتێلەکە و، باسی ئەو حەز و ویستەی خۆمی بۆ بکەم؟ ئەو تەنیا چێژی لەوە دەبینێت کە خۆی دەیویست، لەبەر ئەوە لەدوای دوو ڕۆژ ڕۆیشم بۆ ئەوەی بەڕێوەبەرەکە ببینم.

گوتم: "کە نامەکەتم خوێندەوە کەمێک سەرسام بووم، وەلێ بە هیچ شێوەیەک لۆمەی تۆ ناکەم، ئەگەر من لە جێگەی تۆ بوومایە، ئەوا خۆم نامەیەکی لەو شێوەیەم دەنووسی، ئەرکی تۆ وەکوو بەڕێوەبەری هۆتێل ئەوەیە، ئەوەندەی دەکرێت سوود بۆ هۆتێلەکە بەدەست بخەیت. خۆ ئەگەر ئەوە نەکەیت، ئەوا لەو کارە لادەدرێیت و، دەردەکرێیت. ئێستایش، با لەسەر پارچە کاغەزێک، لایەنە ئەرێینی و

نەرێنییەکان بنووسین کە ڕووبەڕوویان دەبینەوە، ئەگەر تۆ لەسەر بەرزکردنەوەی نرخی هۆتێلەکە پێداگیری بکەیت."

پارچە کاغەزێکم هێنا و، لە ناوەندەوە کردم بە دوو بەشەوە، لەلایەک نووسیم لایەنە باشەکان و، لەلایەکەی دیکەش نووسیم لایەنە خراپەکان.

لەژێر لایەنە باشەکاندا ئەم وشانەی خوارەوەم نووسین: "هۆڵی ئاهەنگێڕان بەبێ بەرانبەر،" پاشان بەردەوام بووم بۆ ئەوەی بڵێم ئەمە شتێکی باشە چونکە دەتوانیت ئەو هۆڵە بەکرێ بدەی بۆ سەماکردن و کۆڕوکۆبوونەوە. ئەوەیش لایەنێکی باشی گەورەیە، بۆ جۆرە کاروبارانێک، کە پارەی زۆر زیاتر دەدەن لەوەی کە لە وانەگووتنەوە دەستت دەکەوێت. ئەگەر من ئەو هۆڵە، بۆ ماوەی بیست شەو لەو وەرزەدا بگرم ئەوا تۆ قازانجێکی ئەوتۆ گەورەت بەر ناکەوێت.

"ئێستا، بە لەلایەنە نەرێنی و خراپەکانی وردبینەوە، یەکەمیان، لەجیاتی ئەوەی ئەو کرێیە بەرز بکەیەوە ئەوا کەمی دەکەیەوە، لەڕاستیدا تۆ ئەو داهاتە هەر دەبڕیت، چونکە من ناتوانم ئەو بڕە پارەیە بدەم، کە تۆ دەتەوێت و، ناچار دەبم وانەکانم لە شوێنێکی دیکە بڵێمەوە.

"لێرەدا، لایەنێکی دیکەی خراپ بوونی هەیە، لەم وانانەدا کەسانی ڕۆشنبیر و تێگەیشتوو بەشدار دەبن و ئاشانی هۆتێلەکەی تۆ دەبن. ئەمەیش لایەنێکی بەسوود و باشە بۆ تۆ، مەگەر وا نییە؟ لە ڕاستیدا، ئەگەر پێنج دۆلار خەرج بکەیت، بۆ ڕیکلامکردن لە ڕۆژنامەکاندا، ئەوا ئەوەندەی من ناتوانی خەڵک بهێنییە ناو هۆتێلەکە. ئەمەیش بایەخێکی زۆری هەیە بۆ هۆتێلەکە، مەگەر وا نییە؟"

هەر وەکوو گوتم، ئەو دوو خاڵە نەرێنییانەم لەسەر پارچە کاغەزێک نووسین و ئاراستەی بەڕێوەبەرەکەم کرد، گوتم: "خوازیارم بە وردە و درشتی لە هەردوو خاڵە باش و خراپەکان ورد ببیەوە، کەوا لە بەردەمی تۆدان و، پاشان دوابڕیاری خۆتم پێ بگەیەنە."

بۆ ڕۆژی دواتر، نامەیەکم پێ گەیشت، کە تێیدا نووسرابوو، کرێکە تەنیا سەدا پەنجای بەرز دەبێتەوە لەجیاتی ئەوەی لە سەدا سێ سەد زیاد بکات.

دەبینی، ئەم نرخ کەمبوونەوەیەم، بە دەست خست هەر تەنیا، بەبێ ئەوەی یەک وشە دەربارەی ویستی خۆم بڵێم. هەردەم قسەم دەربارەی ئەوە دەکرد، کە ئاخۆ خەڵکی دیکە ویست و حەزیان چییە و چۆن دەتوانن بە دەستی بهێنن.

با وا دابنێین، کە منیش کارێکی مرۆیی و سروشتیم بکردایە، وا دابنێ کە منیش خۆمم تورە بکردایە و گوتبام "مەبەستت لەوە چییە، ئەگەر ئەو کرێیە بەڕێژەی سەدا سێ سەد بەرز بکەیەوە، لە کاتێکدا دەزانی کە بلیتەکان ڕاکێشراون و ڕیکلامکراوە؟ سەدا سێ سەد! شتێکی هیچ و بێمانایە! جێگەی پێکەنینە، من ئەو برە پارەیە نادەم!"

ئێ ئەو کاتە چی ڕووی دەدا؟ دەمەقاڵێ سەری هەڵدەدا، خۆشت دەزانی کە مشتومڕ بە چ دەردێک کۆتایی دێت. تەنانەت ئەگەر ئەوم قایلکردبایە کە هەڵەیە، ئەوا هەستی خۆبەزلزانی ڕێگەی پێ نەدەدا لە بڕیارەکەی پەشیمان بێتەوە و دەستبەرداری بێت.

لێرەدا باشترین ئامۆژگاری لە هونەری پەیوەندییە مرۆییەکاندا بەرجەستەکراوە، ***هێنری فۆرد*** دەڵێت: "ئەگەر نهێنییەک بوونی هەبێت بۆ سەرکەوتن، لەوەدایە کە بتوانی لە دیدگای کەسی بەرانبەر و خۆشتەوە شتەکان ببینیت."

ئەمە زۆرباشە، دەمەوێت دووبارەی بکەمەوە: "ئەگەر نهێنییەک بوونی هەبێت بۆ سەرکەوتن، لەوەدایە کە بتوانی لە دیدگای کەسی بەرانبەر و خۆشتەوە شتەکان ببینیت."

ئەمەر زۆر سادەیە، زۆر ڕوونە، بە جۆرک هەموو کەسێک دەتوانێت تەنیا بە یەک نیگا لەو ڕاستییە تێبگات لە کاتێکدا سەدا نەوەدی خەڵک، لەسەر ڕووی ئەم زەویەدا، لە سەدەدا نەوەدی کاتەکاندا لەبیری دەکەن و فەرامۆشی دەکەن.

نموونەیەک وەرگرین، سەیری ئەو نامانە، بکە کە لە سبەینێ بەیانییدا دەڕژێنەر سەر مێزەکەت، دەکرێت درک بەوە بکەیت، کە زۆرێک لەو نامانە هەست و بنەمایەکی گرنگ لە دەست دەدەن. ئەمەیان لە بەرچاو بگرە، نامەکە سەرۆکی بەشی ڕادیۆ ئاراستەی ئاژانسێکی کردووە، کە نوسینگەکەی لە هەموو کیشوەرەکەدا هەیە. ئەم نامەیە ئاراستەی تەواوی بەڕێوەبەرەکانی وێستگەکانی ڕادیۆ کراوە، لەناو خۆی وڵاتدا "من لەنێو کەوانەکەدا تێڕوانینی خۆمم لەسەر هەر بڕگەیەکی نامەکە نووسیووە."

بەڕێز *جۆن بلانک*، بلانکڤیل، ئیندیانا

بەڕێز *بلانکی* ئازیز:

"کۆمپانیای ..... حەز دەکات پێگەی خۆی لە ڕابەرایەتیکردنی ڕیکلامی ڕادیۆیی بەدەست بهێنێتەوە."

(کێ بایەخ بە حەز و ویستی کۆمپانیاکەی تۆ دەدات؟ من نیگەرانی کێشەکانی خۆمم، بانک خانووەکەم دەخاتە ڕەهنەوە، دوێنێش بازاری بۆرسە دابەزانینی بە خۆیەوە بینی. شەمەندەفەرەکەی هەشت و چارەگی بەیانییشم لە دەست چوو، شەوی ڕابردوویش بانگێشتی ئەو سەمایەش نەکرام، کە خێزانی *جۆنس* ئامادەیان کردبوو و، لەو لاوە

دکتــۆریش پــێم دەڵێــت کە فشـــاری خـــوێنم بەرزە و دەمارەکــانم هەڵاوساون. ئێ چی دیکە دێتەبوون؟ ئەم بەرە بەیانییە، بە هەستێکی پڕ لە نیگەرانییەوە هاتمە نوسینگە، ئیمەیڵەکەمم کردووە و، دەبینم ئەو بەفیز و لەخۆبایی، لە نیو یۆرکدا داوای ئەوە دەکات، کە خواست و ویستی کۆمپانیا چییە. بەهبەها ئەگەر ئەو کابرایە تەنیا درک بکات، کە ئاخۆ نامەکەی چ کاریگەرییەک دروست دەکات، ئەوا وازی لەکاری ڕیکلامکردن دەهێنا و، دەبوو بە شوانی مەڕان.)

"حساباتی ئێمە، هەردەم پارێزەری تۆڕی ڕادیۆ بووە، باجیشمان داوە و، ساڵ بە ساڵیش ئاژانسەکەمان لە بەرەو پێشچووندایە."

(تۆ کەسێکی گەورە و دەوڵەمەندی و لە ترۆپکە دایت، وا نییە؟ ئێ چی دیکە؟ بەلامەوە گرنگ نییە ئەگەر تۆ هێندەی ژەنەڕاڵ ***مۆتۆر*** و ***ئێلێکتریک*** و دەستەی گشتی سوپای ئەمریکا گەورە بیت، تەنانەت ئەگەر ژێری بولبولیشت هەبێت، خۆت درک دەکەیت، کە چەندێک چێژ لە گەورەیی خۆم دەبینم، نەک ئەوەی کە تۆ چەندە گەورەیت. تەواوی قسەکانت دەربارەی سەرکەوتنە مەزنەکەت وام لێ دەکات هەست بە بچووکی و بێبایەخی خۆم بکەم.)

"ئێمە حەز دەکەین، کە حسابەکانمان لە کۆتایی دێڕ هەرە گرنگەکانی زانیارییەکانی ئێستگەکەدا دابنێرن."

(تۆ حەز دەکەیت! تۆ دەتەوێت. هەی گەوجی نەفام، من هیچ گرنگی بە ئەوە نادەم، کە تۆ چیت دەوێت و حەزت لە چییە یاخود سەرۆکی

نەتەوەیەکگرتووەکان چی دەوێت و حەزی لە چییە. ڕێگەم پێ بدە، با پێت بڵێم من ئەوەم دەوێت کە تۆ یەک تاکە وشەت لە نامە هیچوپووچەکەتدا بەیان نەکردووە.)

"ئایا دەتوانیت ناوی کۆمپانیاکەمان بیخەیە ناو زانیاری هەفتانەی ویستگە، هەر وردەکاریەکیش بڵاو ببێتەوە، لە بەرژەوەندی ئاژانسەکەدا دەبێت."

("لیستێکی دڵخواز." حەوسەڵەت هەیە! بە جۆرێک دەربارەی کۆمپانیاکەت دەدوێیت، کە وام لێ دەکات هەست بەبێ بایەخی و ناگرنگی خۆم بکەم، کەچی دوایی داوام لێ دەکەی بتخەمە ناو لیستێکی دڵخوازەوە، تەنانەت لە میانەتی داوا کردنیشت وشەی "تکایە" بەکار ناهێنیت.)

"بۆ یادخستنەوەیش، لە کۆتایی نامەکەدا، ئەوا دواکارەکانی ئێوەمان پێ دەبەخشێت و، ئەمەیش یارمەتیدەر دەبێت."

(ئەی گەمژە! نامەیەکی هیچوپووچم بۆ دەنێریت، بێنرخ هێندەی گەڵا هەڵوەریوەکان لە پایزدا، لەو سەریشەوە داوام لێ دەکەیت، لە کاتێکدا من نیگەرانی کێشەکانی خۆمم هەر لە ڕەهەن و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنم، ئەوجا بێم و دابنیشم بۆ ئەوەی نامەیەک پڕ بکەمەوە دەربارەی گەورەیی کۆمپانیاکەت، داوای ئەوەیش دەکەیت، هەر بە خێرایی ئەو کارەت بۆ بکەم، مەبەستت لەمە چییە "بەخێرایی؟" مەگەر نازانیت، منیش ئەوەندەی تۆ سەرقاڵم یان بەلایەنی کەمەوە حەز دەکەم وا بیر بکەمەوە کە سەرقاڵم. کاتێک ئێمە دەربارەی ئەم بابەتە دەدوێین، کێ ئەو فەرمانە شاهانەی پێداویت، کە

فەرمـــان بەســـەر منـــدا بکەیـــت؟ تـــۆیش دەڵێیـــت "زۆر ســـوودێکی دوولایەنەی دەبێـــت." وا خەریـــکە هەر لە دیـــدگای مـــنەوە شـــتەکان دەبینیت، بەڵام تۆ زۆر ناڕوون و نەزانیت دەربارەی ئەمە، کە چۆن دەکرێت بۆ من سوودی هەبێت.)

لەگەڵ ڕێزمدا.

*جۆن دیۆی* بەڕێوەبەر

وێستگەی ڕادیۆ.

"تێبینی: گوتارێک لە گۆڤاری بلانکڤیلدا هەیە، کە دەکرێت چێژ بە تۆ ببەخشێت، دەکرێت بتەوێت لە وێستگەکەتدا پەخشی بکەیت."

(لەکۆتاییدا، تـۆ تێبینییەکـت بـۆ مـن بەرجەسـتە کـردووە، کە تێییدا ئاماژەت بە شتێک کردووە کە یارمەتیدەرم دەبێت بۆ چارەسەرکردنی کێشـەکانم. بـۆچی نـامەکەت بەم شـێوەیە دەسـت پـێ نەکـردووە بەڵام چـی سـوودێک لەمەدا هەیە؟ هەر پیاوێـک تاوانبـار بێـت بە کردنـی شتێکی لەم شێوەیە لەوەی کە بۆ منت ناردووە شـتێکی هەڵەی تێدایە، تـۆ پێویسـتت بە نـامەیەک نیـیە کە تێیـدا بـاس لە دواکارەکـان و دەستکەوتەکانی ئێمە بکات، بەڵکو ئەوەی تۆ پێویستت پێیەتی بریتییە لە یەک پەرداخ لە دەرمانی ئایۆدین بۆ ڕژێنە دەرەقییەکەت.)

ئێسـتا، ئەگەر مـرۆڤ ژیـانی خـۆی بـۆ بـواری ڕیکلامکـردن تەرخـان کردبێت و، کەسـێکی شـارەزا بێت، لەوەی کە کـاریگەری بخاتەسـەر خەڵـک، بـۆ ئەوەی شـتی لـێ بکـڕن، ئەگەر نـامەیەکی لەو شـێوەیە بنووسن، ئەی دەبێت چی لە قەساب و نانەوا و ئامێرساز، چاوەڕێ بکەین؟

نــامەیەکی دیــکە بــوونی هەیە، کە سەرپەرشــتیاری کۆمپانیــایەکی گەورەی بازاڕکردن بۆ ***ئێدوارد ڤێرمیلین***ی نووسیویەتی کە یەکێکە لە قوتابییەکانی پەیمانگاکەم، چ کاریگەریەکی خستە سەر ئەو کەسەیەی کە ئەو نامەیەی ئاراستە کرابوو؟ بیخوێنەوە پاشان پێت دەڵێم.

ئەی. کۆمپانیای منداڵەکانی زێریگا،

شەقامی فرۆنت ۲۸

برۆکلین، ئێن، وای. ۱۱۲۰۱

بۆ بەڕێز: ***ئێدوار ڤێرمیلن***

بەڕێزان:

"زۆربەری پرۆســەکانی بــارکردن، لە کۆمپانیاکەمانــدا دووچــاری کۆســپ و تەگەر بــوون، چــونکە ڕێژەیەکــی زۆری کەلوپەلەکانمــان، لەدوای نیــوەڕۆدا بــۆ دەنێــرن، ئەمەیــش کــاریگەری لەســەر جەنجــاڵی دەبێــت و، ئــێمە دەبێــت کــاری زیــاتر بکەیــن، ئەمەیــش دەبێــتە هــۆی دواکەوتنــی بارهەڵگرەکــان و، هەر لە هەنــدێک حاڵەتــدا دەبێــتە هــۆی دواکەوتنی گواستنەوە. لە ۱۰ی تشرینی دووەم، لە کۆمپانیای ئێوە، لە کاتژمێر ٤:۲۰ ئێوارەدا بارێکمــان پــێ گەیشت کە لە ٥١۰ پــارچە پێک هاتبوو.

خۆشحاڵ دەبین بە هاوکاریتان، بۆ زاڵبوون بەسەر هەر ڕووداوێکی نەخــوازراودا، لەبەرانــبەر دواکەوتنــی کەلولەپەکانــدا. ئایــا دەکرێــت داواتــان لــێ بکەیــن، بــارێکی گەورەی هاوشــێوەی ئەو ڕۆژەمــان بــۆ بنێرن، کاریگەریەکەشــی ئەوە دەبێت، کە بــارهەڵگرەکە زووتــر بگــاتە ئێرە یان لە بەرەبەیانییدا بەشێکمان لەو بارە بە دەست بگات.

ئەو سـوودەی، کە تـۆ دەسـتت دەکەوێـت لەبەرانـبەر ڕێکەوتنێکـی لەم شـێوەیەدا، ئەوا بارەکـان بەخێرایـی خـاڵی دەکـرێن و، کارەکانتـان بە خێرایی جێبەجێ دەبن."

دڵسۆزتان

***جەی. بی. سویت***

لەدوای خوێندنەوەی ئەم نـامەیە، بەڕێز ***ڤێرمیلن*** بەڕێوەبەری بەشـی فرۆشتن، لە کۆمپانیای کوڕەکانی ئەی. زیریگا، نامەیەکی بۆ نـاردم کە ئەم توانجانەی لە خۆ گرتبوو:

"ئەم نـامەیە ئەنجـامێکی پێچەوانەی مەبەسـتەکەی خـۆی پێکـا، هەر لە سـەرەتاوە باسـی ئەو کۆسـپ و تەگەرانە دەکـات، کە دێنەڕێـی کۆمپانیـاکە، ئـێ ئـێمە حەز بە ئەوە نـاکەین، بە گشـتی بـدوێین، داوای یارمەتی لە ئێمە دەکات، هەر بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، ئـاخۆ ئەو یـارمەتییە بـۆ ئـێمە گونجـاوە یـان نـا. لە کۆتاییـدا لە دوابـڕگەدا، ڕاستییەکە بەیانکراوە ئەگەر گیـانی هاوکـاری پیشـەکەش بکەیـن، ئەوا بارەکانمان زوو خاڵی دەبن و، بە خێرایی کارەکانمـان جێبەجێ دەبـن. بە شـێوەیەکی دیکە، لە دوادێڕەکانی نـامەکەدا باسـی ئەوە دەکـات، کە لە دیـدگای ئـێمەوە گرنگە، بە گشـتی دەبێتە هـۆی نـانەوەی هەسـتێکی دووژمنکارانە، وەکوو لە بەرپاکردنی گیانێکی پڕ لە هاوکاری.

با بڕوانین، کە ئێمە ناتوانین دووبارە ئەو نامەیە بنووسینەوە و بەرەو پێشـەوەی بـبەین، بـا هـیچ کاتێـک بە هەدەر نەدەیـن لە قسـەکردن دەربـارەی کێشـەکانی خۆمـان. هەر وەکوو ***هێنـری فـۆرد*** ئامۆژگـاری دەکـات: 'ئەگەر نهێنییەک بـوونی هەبێت بـۆ سـەرکەوتن، لەوەدایە کە بتوانیت لە دیدگای کەسی بەرانبەر و خۆیشتەوە شتەکان ببینیت."

شێوازێک بۆ دارشتنەوەی نامەکە بوونی هەیە، دەکرێت باشترین ڕێگا نەبێت، بەڵام خۆ بەرەو پێش چوونێک هەر دەبێت؟

بەڕێز *ئێدوارد ڤێرمیلین*

کۆمپانیای کوڕەکانی زیریگا

شەقامی فۆرت ٢٨، برۆکلین ئێن وای ١١٢٠١

بەڕێز *ڤێرمیلین* گیان

کۆمپانیایەکەی بەڕێزتان، لەماوەی چواردە ساڵی ڕابردوودا یەکێک بووە، لە هەرە کڕیارە باشەکانی ئێمە. بە شێوەیەکی سروشتی، زۆر سوپاسی پشتگیری ئێوە دەکەین و، بەپەرۆشین بۆ ئەوەی خزمەتگوزارییەکی خێرا و باش و کارامەتان پێ بدەین، کە شیاوی ئێوە بێت. لەگەڵ ئەوەیشدا، جێگەی داخە، کە دەڵێین ناتوانین ئەو خزمەتگوزارییانەتان پێشکەش بکەین، چونکە بارهەڵگرەکانی ئێوە لە کۆتایی دوای نیوەڕۆدا بارەکانیان بە ئێمە دەگەیەنن، هەر وەکوو لە ١٠ی تشرینی یەکەمدا ڕووی دا. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی چەندین کڕیاری دیکە، هەر وەکوو ئێوە درەنگ شتەکانیان دەگەیەنن. بە شێوەیەکی ئاسایی، ئەمەیش دەبێتە هۆی جەنجاڵی و قەرەباڵغی. ئەمەیش بە مانای ئەوە دێت، کە داگرتن و بارکردنی بارهەڵگرەکانتان درەنگ دەکەوێت.

ئەمە شتێکی خراپە، بەڵام دەیشکرێت خۆمانی لێ بەدوور بگرین، ئەگەر ئێوە بتوانن لە بەیانییدا بارەکانتان بنێرن، ئەگەر دەکرێت، بەمەیش لۆریەکانتان دەتوانن بە ئاسانی جووڵە بکەن و ئێمەیش بایەخ بە بارکردنیان دەدەین و، کرێکارەکانی ئێمەیش ئێواران زوو دەڕۆنەوە و لە خوانی ئێوارەدا چێژ لە مەعکەڕۆنی دەبینن، کە ئێوە دروستی دەکەن.

گرنگ نییە چ کاتێک، بارەکانتان دەگەن، خۆشحاڵ دەبین ئەوەندەی بکرێت بە خێرای و بەهێزی خۆمانەوە هاوکاریتان بکەین.

ئێوە سەرقاڵن، تکایە خۆتان ئەزیەت مەدەن بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم نامەیە بدەنەوە.

دڵسۆزتان

***جەی. بی. سویت***

***باربارا ئەندێرسۆن،*** کە لە بانکێکدا کاری دەکرد لە نیو یۆرک، حەزی دەکرد بۆ فیۆنیکس و ئەریزۆنا جووڵە بکات لەبەر تەندروستی کوڕەکەی. ئەو بنەمایانەی بەکار دەهێنا، کە لە پەیمانگەکەی ئێمەدا فێر ببوو، ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ دوازە بانک نووسی لە فیۆنێکس:

بەڕێزەکەم:

"ئەزموونی دە ساڵەی کارکردنم لە بانکدا، دەکرێت جێگەی بایەخ بێت بۆ بەرەو پێشچوونێکی خێرای بانکەکەی تۆ.

لەچەندین بواری جیاوازدا لە بانکدا لەگەڵ هاوپیشەکانم، لە کۆمپانیای ترست لە نیو یۆرک و، ڕێکردنم وەکوو بەڕێوەبەری لق لە ئێستادا، لە هەموو ڕوویەکانی بانکدا توانا و شارەزاییم هەیە هەر لە ڕووی پەیوەندییەکان و، قەرز و، کارتی متمانە و کاری ئیداری.

لە مانگی ئازاردا لە فیۆنێکس جێگیر دەبم، دڵنیام کە دەتوانم هاوبەشی بکەم، لە سوود و بەرەوپێش چوونی ئێوە. لە هەفتەی سێیەمی نیسان لە فیونێکس دەبم و ئەو دەرفەتەیش بەرز دەنرخێنم، کە چۆن دەتوانم نیشانی ئێوەی بدەم، کە بانکەکەتان بە ئاواتی ئامانجەکانی دەگات."

دڵسۆزتان

***باربارا ئێل. ئەندێرسن***

ئایا پێت وایە خاتوو *ئەندێرسن* هیچ وەڵامێکی پێگەیشتووە؟ یازدە لە دوازدە بانـک بانگهێشـتیان کردبـوو بـۆ ئەوەی چـاوپێکەوتنی لەگەڵ بکەن، ئەویش ئەو بژاردەیەی لەبەردەست دابوو ئاخۆ پێشنیازی کام بانکە قبوڵ بکات؟ بۆچی، خـاتوو *ئەندێرسـن* باسـی ئەوەی نەکردبوو کە ئەو چی دەوێت، بەڵکو لە نامەکەدا نووسیبووی کە چۆن دەتوانێت پارمەتیان بدات و سەرنجی لەسەر خواسـت و ویسـتەکانی ئەوان بوو نەک هی خۆی.

لە ئەمڕۆدا هەزاران فرۆشیاری دەستگێڕ، بەسـەر شۆسـتەکاندا دێن و دەڕۆن شەکەتن، بێورەن و کەس نییە پارەیان پێ بدات. ئەمە بۆچی؟ ئەوانە بەردەوام بیـر لەوە دەکەنەوە، کە خۆیـان دەیانەوێـت، درک بە ئەوە نـاکەن، کە نە مـن و نە تـۆ نامانەوێـت هـیچ شـتێک بکڕین، خـۆ ئەگەر بشـمانەوێت، ئەوا دەچـین و دەیکـڕین. بەڵام هەردووک لە ئێمە بایەخ بە چارەسەرکردنی کێشەکانمان دەدەن. ئەگەر فرۆشیار بتوانێت کاڵاکـانی یـان کەلوپەلەکـانی نیشـانمان بـدات ئەوا ئەمە یارمەتیـدەر دەبێـت بـۆ چارەســەرکردنی کێشــەکانمان، پێویســت بە ئەوە ناکـات کاڵاکانمان پێ بفرۆشـن بەڵکو ئێمە خۆمـان دەیـانکڕین. کڕیارەکـانیش دەیانەوێت وا هەسـت بـکەن کە خۆیـان شـت دەکڕن، نەک وا هەسـت بکەن، کە شتیان پێ دەفرۆشرێت.

لەگەڵ ئەوەیشـدا، زۆرێـک لە فرۆشـیاران لە ژیانیـادا شـت دەفرۆشـن، هەر بەبێ ئەوەی لە دیدگای کڕیارەکەوە لە شتەکە بنواڕن. بۆ نمـوونە بۆ مـاوەی چەندین سـاڵ لە فۆرێسـت هیلز دەژیـام، کە کۆمەڵگەیەکی بچووک بوو، لە ناوەندی نیو یۆرکی مەزنـدا. ڕۆژێکیـان بە پەلە بەرەو وێسـتگە دەڕۆیشـتم، بەڕێـکەوت چـاوم بە کـابرایەک کەوت کە چانـد ساڵێک لەو ناوە کاری کڕین و فرۆشـتنی زەوی دەکـات، زۆر بـاش لە فۆرێسـت هیلز شـارەزا بـوو، لەبەر ئەوە بە پەلە لێم پرسـی، کە ئـاخۆ

خانووەکەم لە کۆنکرێت یان لە دار یاخود لە خشت دروست کراوە. لە وەلامدا پێی گوتم، کە نازانم، بەلام لە دواییدا شتێکی پێ گوتم کە خۆشم دەمزانی – دەتوانی لە ڕێگەی پەیوەندیکردن بە کۆمەڵەی گاردن فۆرێست هیلزەوە، بزانیت.

بۆ بەیانی داهاتوو، لەو کابرایە نامەیەکم بە دەست گەیشت، ئایا ئەو زانیارییەی تێیدا بەرجەستە کردبوو، ئەوە بوو کە خۆم دەمویست؟ ئەو کابرایە دەیتوانی تەنیا لە ماوەی یەک خولەکدا وەلامەکە بەدەست بخات، تەنیا لەڕێگەی پەیوەندیکردنەوە. بەلام وای نەکرد، دووبارە پێی گوتمەوە، کە دەتوانم لە ڕێگەی تەلەفۆنکردنەوە، ئەو زانیارییە بە دەست بهێنم، لەدواییدا داوای لێ کردم کە لەگەڵ بیمەی خۆمدا ڕێ بکەم.

ئەو کابرایە، خۆی حەزی لەوە نەبوو یارمەتی من بدات، تەنیا حەزی دەکرد و چێژی لەوە دەبینی کە یارمەتی ئەو بدات.

*جەی. هۆوارد لوکاسی* بیرمینگام، ئەلاباما، ئەوەمان بۆ بەیان دەکات کە چۆن دوو فرۆشیار لە هەمان کۆمپانیاندا لەگەڵ هەمان دۆخدا ڕێیان کردووە، دەڵێت:

"چەندین ساڵ لەمەوبەر، بەڕێوەبەری تیمێکی بچووک بووم، لە کۆمپانیایەکدا. بنکەی سەرەکی لە نزیک ئێمە بوو، نووسینگەی کۆمپانیایەکی بیمەکردن بوو. بریکارەکانیان بەسەر ناوچەکاندا دابەش ببوون، کۆمپانیاکەی ئێمەیش، دوو بریکاری هەبوو، کە ئەوانیش *کارل* و *جۆن* بوون.

بەیانییەکیان، *کارل* سەردانی نووسینگەکەی ئێمەی کرد و، بە شێوەیەکی ئاسایی ئاماژەی بەوە کرد، کە کۆمپانیاکەی ئەو ڕووی بەلای سیاسەتی ژیانێکی بیمەیی تازەدا کردووە بۆ بەڕێوەبەرەکان و،

پێشیان وایە، کە ئێمە لە داهاتوودا چێژ لەوە دەبینین و حەزمان پێی دێت و، ئەویش دێتەوە لامان و کاتێک زانیاری نوێی دەستکەوت."

"لە هەمان ڕۆژدا، *جۆن* ئێمەی لەسەر شۆستە بینی کاتێک لە وچانێکی قاوەخواردنەوەدا دەگەڕاینەوە، هاواری کرد: 'هێی *لووک*، بوەستە، هەواڵێکی خۆش و باشم بۆ هاوڕێکانت هەیە.' هەر بە ڕاکردن هات و بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە پێی گوتین، دەربارەی سیاسەتی بەڕێوەبەرێکی بیمەی ژیان، کە ئەو ڕۆژە کۆمپانیاکەی ناساندبووی. 'ئەمەیشیان هەمان سیاسەتبوو کە *کارل* بە ڕێکەوت باسی کردبوو.' دەیویست زانیاریمان دەربارەی هەبێت، چەند ڕاستییەکی گرنگی بە ئێمەدا، دەربارەی ئەوە و کۆتایی قسەکانی بە ئەمە هێنا، 'ئەو سیاسەتە هەر زۆر نوێیە، دەمەوێت کەسێک بەیانی لە نوسینگەدا سەروەدەر بنێیت و ڕوونی بکاتەوە. ئێستا، لەم کاتەدا، با ئەو بڕیارانە ئیمزا بکەین و، بەو بۆنەیەوە زانیاری زیاتری دەبێت بۆ ئەوەی بە دەمیانەوە کار بکات. ئەو جۆش خۆشەی ئەو بە جۆرێک لە ناخی ئێمەدا گڕێ گرت بۆ ئەوەی پەرۆشی ئەو سیاسەتە بین، وەلێ هێشتا زانیاری ورد و درشتمان دەربارەی نەبوو، کاتێک کاتیان بۆ ئێمە ڕەخساند، ئەوانیش زانیاریی سەرەتایی *جۆن*یان پشتڕاست کردەوە، نەک هەر سیاسەتێکی بە هەر کامێک لە ئێمە فرۆشت، بەڵکو بگرە بیمەکەی دوو ئەوەندە کرد.

"*کارل* دەیتوانی ئەو جۆرە فرۆشتنانەی هەبوایە، بەڵام ئەو هیچ ڕەنج و ماندووبوونێکی نەکێشا، بۆ ئەوەی ئەو هەست و حەز لە دڵی ئێمەدا بهێنێتە جۆش بۆ ئەو پلانە."

جیهان پڕە لە کەسانێک، کە قومار دەکەن و، بەدوای خۆیاندا وێڵن. لەبەر ئەوە ساتێک کە تاکە کەسێک بێ فیزانە هەوڵ دەدات خزمەتی ئەوانی دیکە بکات ئەوا سوودێکی بێ شوماری هەیە. کەوتووەتە ناو پێشبڕکێیەکی بچکۆلانەوە.

گیـانه، زۆر کەس بەدوای بەختەوەریـدا ویڵـن، تـامەزرۆن بـگەن بەم دۆخە و تێیدا هەناسـەیەکی بڕ لە ئاسـوودەیی هەڵبکێشـن. ئازیزەکەم، خۆ بەختەوەری سێو نییە، سێو بگرێت و، تۆیش لە سێبەرەکەیدا بە هەسـتێکەوە بیخۆیـت. بەخـتەوەری، لەسـەر لێـواری تەپـۆلکەیەک مەنزڵگەی دانەناوە، تۆ پێیدا هەڵگەڕێیت و پێی بگەیت.

*ئێوون دی. یەنگـ*ی پارێزەر و، یەکێک لە ڕابەرە مەزنەکانی بازرگانی ئەمریکا، جارێکیـان گوتی: "ئەو کەسـانەی کە دەتـوانن خۆیـان بـخەنە جێگەی خەڵکی دیکە، ئەوانەی کە تێدەگەن لە کار و ویسـتەکانی بیر و هـزری خۆیـان، ئەوا هەرگیـز نـیگەران نـابن، ئاخۆ داهـاتوو شـتێکی لە هەگبەدا بۆ هەڵگرتوون."

ئەگەر لە میانەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا، تەنیا تـاکە شـتێک بەدەسـت دەخەی، مەیلێـک کە هەردەم لە دیـدگای خەڵـکەوە بیـر بـکەیەوە و، بە تێڕوانینی ئەوان لە شتەکان بنواڕی، ئەگەر تەنیـا ئەم شـتە لەم کتێبەدا فێـر بیـت، ئەوا دەکرێـت بە ئاسـانی بسـەلمێنردرێت، کە تـۆ دەبیـت بە کەسێکی سەرکەوتوو لە پیشەکەی خۆتدا.

سـەیرکردن و تێـڕوانین، لە دیـدگای کەسـی بەرانـبەر و، هەبـوونی تـامەزرۆیی بـۆ شـتێک ئەوە نیـیە وەکـوو شـتێک شـیتەڵ بکرێـت، کە کەسێک شتێکت بۆ بکات، تەنیـا لە بەرژەوەنـدی و سـوودی تـۆدا بێـت، یـان پە پـێچەوانەوە یـاخود بـۆ ئەو مـایەی ئازارێـک بێـت. هەردوو لا دەبێـت لەو گفتوگـۆیەدا شـتێک بەدەسـت بـخەن، لەو نامـانەی، کە بـۆ بەڕێز *ڤێرمیلن* نێردران، هەردوو لا هەر یەک لە نامەنێر و نـامەوەرگر، خواستی خۆیان لەو پشنیارەی کە بەرجستەکرابوو بەدەست خست.

هەردوو لا هەم خـاتوو *ئەندێرسـن* و بانـک، شـتێکی بەسـوودیان بە دەسـت خسـت، بەوەی کە ئەو بـانکە کارمەنـدێکی بـڕ بەهـای دەسـتکەوتووە و، خـاتوونیش کـارێکی گونجـاوی دەسـت کەوتـووە.

هەروەها لە نموونەی ***جۆن***ی فرۆشیاری بیمە، بۆ بەڕێز ***لووکاس***، هەردوو لا سوودمەند بوون لەو مامەڵەیەدا.

نموونەیەکی دیکە، کە هەموو کەسێک هەر چییەکی بوویت بە دەستی دەخات لەژێر چەتری ئەم بنەمایەدا ئەوەیە کە، ***مایکل ئی. ویدن***ی وۆڕویک، ڕۆدی ئایلاند، کە فۆرشیارە لە کۆمپانیای شێڵ ئۆیلدا. ***مایک*** دەیویست ببێت بە فۆرشیارێکی ژمارە یەک لە ناوچەکەیدا، بەڵام خزمەتگوزارێکی وێستگەیەک، دەستی لە کار کێشایەوە و، پیرە پیاوێک بەڕێوەی دەبرد کە نەدەتوانرا هان بدرێت بۆ ئەوەی وێستگەکە پاک بکاتەوە. لە حاڵەتێکی ئاوا داماودا، بڕی فرۆشتنەکان بە شێوەیەکی زۆر ڕوویان لە کەمی دەکرد.

کاکی بەڕێوەبەر گوێی بۆ هیچ کامێک کە قسەکانی ***مایک*** نەدەگرت، لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی وێستگەکە. لەدوای چەندین ئامۆژگاریی و کردنی قسە لە دڵەوە، هیچ کامێکیان کاریگەری نەبوو، ئیتر ***مایک*** بڕیاریدا، بۆ ئەوەی بەڕێوەبەر بانگهێشت بکات بۆ ئەوەی سەردانی نوێترین وێستگەی شێڵ بکات لە ناوچەکەدا.

بەڕێوەبەر بە شوێنی دامەزراوەی نوێ زۆر کایگەر بوو، کاتێک جاری دواتر ***مایک*** بانگهێشتی کردەوە، وێستگەکەی پاک و خاوێن بوو، بڕێکی زۆری ئەشیا فرۆشرابوو. هەر ئەمەیش بوو وای لە ***مایک*** کردبوو، کە ببێت بە فۆرشیارێکی ژمارە یەک لە ناوچەکەدا.

تەواوی قسەکانی و، گفتوگۆکانی یارمەتیدەر نەبوون، بەڵام بە هێنانە جۆشی حەزی ویستن لە بەڕێوەبەردا، بە نیشاندای وێستگەیەکی هاوچەرخ، ***مایک*** ئامانجەکەی پێکا، بەمەیش هەردوو لا هەم ***مایک***، هەم بەڕێوەبەر سوودیان بەرکەوت.

زۆر کەس کۆلێژ تەواو دەکات و، فێر دەبن چۆن ڤێرجل بخوێننەوە و، شارەزایی لە نهێنییەکانی جیاکاریی و تەواوکاریی بەدەست دەخەن،

هەر بەبێ ئەوەی بزانن، کە چۆن مێشک و هزریان کار دەکات و فرمانی چییە. بۆ نموونە جارێکیان خولێکم کردەوە لە "کاریگەری قسەکردن" بۆ لاوانی دەرچووی کۆلێژ، کە دەچوون بۆ کارکردن لە کۆمپانیا، بەر لە پیشەگەری فێنککەرەوەدا. یەکێک لە بەشداربووەکان دەیوست ئەوانی دیکە قایل بکات بۆ ئەوەی یاری باسکە بکەن لە کاتی دەست بەتاڵیدا، ئەمەیش ئەوە بوو کە ئەو گوتی: "دەمەوێت بێنە دەرەوە و یاری باسکە بکەن، من خۆم حەز دەکەم، یاری باسکە بکەم، بەڵام ئەو چەند جارەی کۆتایی کە چووم بۆ وەرزش، ژمارەیەکی خەڵکی ئەو تۆ لەوێ نەبوو بۆ ئەوەی یاری بکەین. ئەو شەوە تەنیا دوو سێ کەس بوون بۆ ئەوەی تۆپەکە هەڵبدەن، منیش بۆکسێکم بەرچاوم کەوت. هیوادارم، سبەی شەو هەمووتان بێن، حەز دەکەن یاری سەبەتە بکەین."

ئایا دەربارەی هیچ شتێک قسەی کرد، کە تۆ بتەوێت؟ ناتەوێت بچیت بۆ جۆرە وەرزشێک، کە کەسی دیکە بۆی ناچێت، وایە؟ تۆ بەلاتەوە گرنگ نییە، کە ئاخۆ ئەو چی دەوێت؟ وەڵێ، ناتەوێت بۆکسێکت بەرچاوت بکەوێت؟

ئایا هیچ شتێکی پێ نیشاندایت، کە دەتوانیت لە ڕێگەی وەرزشەوە بەدەستیان بهێنیت؟ بە دڵنیاییەوە، زیاتر چوست و چالاک دەبیت، ئارەزووی خواردنت زیاتر دەبێت، مێشکت ساف و ئاسایی دەبێتەوە، کەیف و خۆشی دەبینیت و یاری دەکەیت.

ئامۆژگارییەکانی پرۆفیسۆر ***ئۆڤەرستریت***، دووبارە بکەینەوە کە دەڵێت: "سەرەتا، لە ناخی کەسی بەرانبەردا ئارەزوویەکی حەز و ویست بخولقێنە، ئەوەی کە دەتوانێت ئەمە بکات ئەوا تەوای جیهان لەگەڵ ئەوە، خۆ ئەوەی کە ناتوانێت ئەمە بکات ئەوا تەنیا هەر خۆی ملی ڕێگا دەگرێتە بەر."

یەکێک لە قوتابییەکانی پەیمانگاکەم، نیگەرانی کوڕە بچکۆلەکەی بوو، منداڵەکە کێشی دابەزی بوو و خواردنیشی بە شێوەیەکی گونجاو نەدەخوارد. بەمەیش سەرزەنشتیان دەکرد و لۆمەیان دەکرد، "دایکت دەیەوێت تۆ ئەمە و ئەوە بخۆیت،" "بابە دەیەوێت گەورە بییت بۆ ئەوەی ببیت بە پیاوێکی گەورە."

ئایا ئەو منداڵە هیچ گرنگی بەو تکایە و ڕەجایەدا؟ هەر بە هەمان شێوەی، ئەوەی کە تۆ هیچ بایەخێک بەو گەردیلە خۆڵانە نادەی کە لە کەنار دەریا بوونیان هەیە.

هیچ پیاوێک بە شوێن پێی ئەسپەوە، ناتوانێت پێشبینی ئەوە بکات کە منداڵێکی تەمەن سێ ساڵان لەگەڵ تێڕوانینەکانی باوکی ڕێ بکات، لە کاتێکدا تەمەنی سێ ساڵە، ئەمەیش لە کاتێکدایە، کە باوکەکە چاوەڕێی ئەوەی کردبوو، ئەی کە چ شتێکی هیچوبێمانایە! لە کۆتاییدا درکی بەمە کردوو و بە خۆی گوت: "ئەو منداڵە چی دەوێت؟" چۆن دەتوانم شتێک بکەم، کە هەم ویست خۆم بپێکم و هەمیش ئەو ویستی لەسەر کردنی هەبێت؟"

شتێکی ئاسان بوو بۆ باوکەکە، هەر کە دەستی کرد بە بیرکردنەوە دەربارەی ئەوە، کوڕەکەی پاسکیلێکی هەبوو، کە حەزی بە سواربوونی دەکرد لە سەرشۆستەکانی بەردەم ماڵەکە لە بڕۆکلین. چەند ماڵێک لەوسەری ماڵەکەی خۆیان کوڕێکی ئیزعاج و گەورەتر لەو دەژیا کە کوڕە بچکۆلانەکەی لەسەر پاسکیلەکە دەهێنایە خوارەوە و خۆی سواری دەبوو.

بە شێوەیەکی ئاسایی، کوڕە بچووکەکە بەدەم گریان و ناڵەوە دەگەڕایەوە لای دایکی و، ئەویش دەبووایە هاتبایە دەرەوە و ئەو منداڵە هاروهاجەی لەسەر پاسکیلەکە دابەزاندبا و، دووبارە کوڕە بچووکەکەی سواری پاسکیلەکە کردبایەوە، نزیکەی هەموو ڕۆژێک ئەمە دووبارە دەبوویەوە.

ئەو کوڕە بچووکە چی دەویست؟ ئەم پرسیارە پێویستی بە *شێرلۆک هۆلمز*، نەبوو بۆ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، هەستی شانازییەخۆکردن، تووڕەیی و حەز و ویستی، وای لێ کردبوو بۆ ئەوەی هەست بە گرنگی بکات –تەواوی هەست و سۆزدارییە بە هێزەکانی– وای لێ دەکرد بۆ ئەوەی تۆڵە بکاتەوە، بۆ ئەوەی لە دەمی ئەو هاروهاجە بدات.

کاتێک باوکی بۆی ڕوون کردەوە کە، دەتوانێت ڕۆژێک خۆی لەو منداڵە هاروهاجە بدات، ئەگەر ئەو شتانە بخوات کە دایکی پێی دەڵێت –کاتێک باوکی پەیمانی ئەمەی پێدا– ئیتر هەموو کێشە خۆراکییەکان بوون بە بڵقی سەرئاو. ئیدی منداڵەکە دەستی کرد بە خواردنی سپێناغ و، تەرەساز و ماسی دەریا، هەر شتێک کە پێویست بکات بیخوات لەپێناو ئەوەی ڕووبەڕووی ئەو کوڕە هاروهاجە بێتەوە کە سووکایەتی پێ دەکات و لێی دەدات.

لەدوای تیمارکردنی ئەم کێشەیە، دایک و باوکە ڕووبەڕووی دانێکی دیکە بوونەوە: منداڵەکە خوێکی خراپی هەبوو، شەوانە میزی بە خۆیدا دەکرد.

منداڵەکە لەگەڵ داپیرەی دەخەوت، لە بەیانییاندا، کاتێک داپیری لەخەو هەڵدەستا و جێگەکەی بە تەڕی دەبینی و دەیگوت: "سەیر بکە، *جۆنی* بزانە دیسان چیت کردووە، وەکوو شەوی ڕابردوو جێگەکەت تەڕ کردووە."

*جۆنی*یش وەڵامی دەدایەوە: "نەخێر، من وام نەکردووە، تۆ وات کردووە."

سەرزەنشتکردن و زللەلێدان، مانای ئەوەیان دەگەیاند، کە دایک و باوکەکە نەیان دەویست منداڵەکەیان ئەوە بکات، هیچ کام لەم ڕەفتارانە وایان نەدەکرد، منداڵەکە میز بە خۆیدا نەکات، بەمەیش دایک

و باوکەکە پرسیان: "چی بکەین بۆ ئەوەی ئەو منداڵەی ئێمە لە شەواندا میز بە خۆیدا نەکات؟"

ویستەکانی منداڵەکە چی بوون؟ یەکەمیان، دەیویست وەکوو باوکی بیجامە لەبەر بکات نەوەکوو، وەکوو داپیرەی جلی شەوانەی ئافرەتان لەبەر بکات. جا لەبەر ئەوە، داپیری بەم شێوە ڕەفتارەی ئەو منداڵە بێزار دەبوو، ئیتر بە خۆشحاڵییەوە پێشنیازی کرد، بۆ ئەوەی بیجامەی بۆ بکڕێت و ئەو ڕەفتارە دووبارە نەکاتەوە. دووەمیان، منداڵەکە دەیویست جێگەی خودی خۆی هەبێت، داپیرەشی لەمەیاندا پشتگیری کرد.

دایکی دەستی منداڵەکەی گرت و بردی بۆ دوکانەکانی بڕۆکلین، چاوێکی لە کچە فرۆشیارەکە داگرت و پێی گوت: "ئەو کەڵە پیاوە بچووکە، خۆی دەیەوێت بازاڕکردن بکات."

ئیدی کچە فرۆشیارەکەش وای لە منداڵەکە کرد، هەست بە گرنگی بکات بە گوتنی: "کاکە، دەتەوێت چیت نیشان بدەم؟"

منداڵەکە بە شانازییەوە وەستا و گوتی: "دەمەوێت جێگەی نووستن بۆ خۆم بکڕم."

کاتێک ئەوەیان نیشاندا، کە دایکی دەیویست بۆی بکڕێت، دایکی چاوێکی لە کچەکە داگرت و منداڵەکەی قایل کرد بۆ ئەوەی بیکڕێت.

بۆ ڕۆژی دواتر، جێگەکە گەیشت، هەر ئەو شەوە کاتێک باوکەکە گەڕایەوە ماڵەوە، منداڵە بچووکەکە بە هاوار کردنەوە ڕای کرد بەردەرگاکە: "باوکە! باوکە! وەرە نهۆمی سەرەوە و ئەو جێگەیە ببینە کە کڕیوومە!"

باوکەکە سەیری جێگەکەی دەکرد و، گوێڕایەڵی قسەکانی ***چارلز شکواب***یان کردبوو کە دەڵێت: "گەرموگوڕ لە پەسندکردندا و، دەست بڵاو لە ستایشکردندا."

باوکی منداڵەکە گوتی: "خۆ لەسەر ئەم جێگەیەش میز بەخۆتدا ناکەی، وا نییە؟"

"نا، نەخێر، نا! ئەو کارە ناکەم." ئیدی منداڵەکەی پەیمانەکەی خۆی بردە سەر، چونکە کەرامەتی ڕێگەی نەدەدا بۆ ئەوەی سەرپێچی پەیمانەکەی بکات، ئەوە جێگەی ئەو بوو، خۆی بە تەنیا کڕیبووی. ئێستا هاوشێوەی باوکی بیجامەی لەبەر دەکرد و، دەیویست وەکوو پیاو ڕەفتار بنوێنێت و، هەرواشی کرد.

باوکێکی دیکە ***کەی. تی. دەچمان***، ئەندازیاری تەلەفۆن، قوتابیەک لە پەیمانگەیەکی خۆمدا، نەیدەتوانی وا لە منداڵە سێ‌ساڵانەکەی بکات، بۆ ئەوەی نانی بەیانی بخوات، ئیدی سەرزەنشتکردنی ئاسایی و، قسەکردن و شێوازەکان هەموویان هیچیان لێ شین نەبووبوو. لەبەر ئەوە دایکە و باوکەکە لە خۆیان پرسی: "چۆن دەتوانین وا لە کچەکەمان بکەین نانی بەیانییان بخوات؟"

ئەو کچە بچکۆلانە، دەیویست لاسای دایکی بکاتەوە، هەست بە گەورەی بکات و وا هەست بکات، کە کەسێکی پێگەیشتوویە، بۆیە بەیانییەکیان کچەکەیان لەسەر کورسییەک داناو، لێی گەڕان بۆ ئەوەی خواردنی بەیانی دروست بکات. هەر لەو ساتەدا، کە باوکەکە ڕۆیشتە چێشتخانەکە، کیژەکی چاوی لە خواردنەکە بڕیبوو و گوتی: "ئۆو، باوکە سەیر بکە، وا من ئەم بەیانییە نان ئامادە دەکەم."

بەبێ هیچ قسە و گوفتارێک، کچەکە نانی بەیانی خوارد، لەبەر ئەوەی چێژی لێ دەبینی و حەزی لێ بوو. هەستی گرنگی بەدەست خستبوو، تەنانەت لە خواردنی نانی بەیانی بە دەربڕینی خود لێی تێگەیشتبوو.

***ولیەم وینتەر***، جارێکیان ئاماژەی بەمە کرد: "دەربڕینی خود، هەستێکی پێویستی زاڵە لە سروشتی مرۆڤدا." ئەی کەوایە، بۆچی ئەم ڕاستییە لە جیهانی کارکردندا پەیڕەو نەکەین؟ کاتێک بیرۆکەیەکی

ناوازەمان هەیە، لەجیاتی ئەوەی وا لە خەڵکی دیکە بکەین، کە وا بیر بکەنەوە کە ئەو بیرۆکەیە هی ئێمەیە، بۆچی وایان لێ نەکەین خواردن دروست بکەن و خۆیان چاو لە بیرۆکەکە ببڕن و لێی وردببنەوە؟ پاشان ئەو بیرۆکەیە هەر بە هی خۆیان هەژمار دەکەن، حەزیان لێی دەبێت و، دەکرێت هەر هەندێکیش لەو نانە بخۆن.

لە بیرت بێت: "هەوڵ بدە لە ناخی کەسی بەرانبەردا حەز و ئارەزوویەکی ویستن بخولقێنی، ئەوەی کە دەتوانێت بیکات هەموو جیهان لەگەڵیەتی، خۆ ئەوەی کە ناتوانێت بیکات هەر خۆی بە تەنیا ملی ڕێگا دەگرێتەبەر."

**"لە ناخی کەسی بەرانبەردا، حەز و ئارەزوویەکی ویستن بخولقێنە."**

## تەکنیکی چوارەم

### ئەمە بکە و، لە هەموو لایەکەوە پێشوازیت لێ دەکرێت

بۆچی ئەم کتێبە دەخوێنیەوە، بۆ ئەویە فێری ئەوە بیت، کە چۆن هاوڕێ پەیدا بکەیت؟ باشە بۆچی لە تەکنیکی گەورەترین براوەی پەیداکردنی هاوڕێدا وردنەبینەوە، کە لە جیهاندا ناسراوە؟ ئەو کابرایە کێیە؟ دەکرێت بەیانی چاوت پێی بکەوێت، کە بەسەر شەقامەکەدا ڕێ دەکات، کاتێک لێی نزیک دەبیەوە، ئەویش دەست دەکات بە جولاندنی کلکی. ئەگەر بوەستی و بە نەرمی دەستی لێ بدەیت، ئەوا ئەویش لە پێستی خۆی دێتە دەرەوە و نیشانت دەدات، کە چەندێک تۆی خۆش دەوێت. تۆش دەزانی، کە لە دیوی پشتەوەی ئەو خۆشەویستییەدا، هیچ پاڵنەر و هاندانێک خۆی حەشارنەداوە: نایەوێت هیچ ماڵ و موڵکێکت پێ بفرۆشێت، ناشیەوێت هاوسەرگیریت لەگەڵ بکات.

ئایا هەرگیز بیرت کردووەتەوە، کە سەگ تاکە ئاژەڵێکە، هیچ کارێک ناکات لەپێناو ژیانکردنیدا؟ مریشک دەبێت هێلکە بکات، مانگا دەبێت شیرمان بداتێ، بولبول دەبێت بخوێنێت، بەڵام سەگ هیچ شتێک بە تۆ نابەخشێت، تەنیا خۆشەویستی نەبێت.

کاتێک تەمەنم پێنج ساڵان بوو، باوکم تووتکەیەکی بە پەنجا سەنت بۆ کڕیم، ئەو تووتکەیە ببویە سەرچاوەی هەموو خۆشی و شادییەکانی سەردەمی منداڵیم. هەموو دوای نیوەڕۆیەک، دەوروبەری کاتژمێر چوارونیو، لەناو حەوشەکەدا پاڵ دەکەوتوو و، چاوە جوانەکانی لە ڕێگاکە دەبڕین. هەر کە گوێ بیستی دەنگی من دەبوو وەکوو گوللە دەردەپەڕی و دەهاتە سەر تەپۆلکەکە بۆ ئەوەی بەو پەڕی خۆشی و شادی سڵاوم لێ بکات.

بۆ ماوەی پێنج ساڵ، **تیپی** هاوڕێی بەردەوامم بوو، پاشان لە شەوێکی پڕ لە تراژیدیادا –کە هەرگیز لە بیرم ناچێت– تەنیا دە پێ لە من دوور بوو بە هەورە بروسکە کۆچی دوایی کرد. ئیدی مەرگی تیپی کارەساتێکی سەردەمی منداڵی من بوو.

**تیپی** تۆ هەرگیز هیچ کتێبێکی دەروونناسی ناخوێنییەوە، هەر پێویستت بە خوێندنەوەی نەبوو، تۆ بە هۆی بوونی غەریزەیەکی سروشتی کە تێتدا هەبوو، دەیتوانی لە ماوەی دوو مانگدا هاوڕێگەلێک پەیدا بکەیت، بە بوونت بە کەسێکی تامەزرۆ لە هەگبەی کەسانی دیکەدا، لەوەی کە لە میانەی دوو ساڵدا، هەوڵی پەیداکردنی هاوڕێ بدەیت، بەوەی کە هەوڵ بدەیت ئەوان تامەزرۆی خۆت بکەیت. لێی گەڕێ با ئەوە دووبارە بکەمەوە، دەتوانیت لە ماوەی دوو مانگدا هاوڕێگەلێک پەیدا بکەی بە بوونت بە کەسێکی تامەزرۆ لە هەگبەی کەسانی دیکەدا، لەوەی کە لە میانەی دوو ساڵدا هەوڵی پەیداکردنی هاوڕێ بدەیت، بەوەی کە هەوڵ بدەیت ئەوان تامەزرۆی خۆت بکەیت.

لەگەڵ ئەوەیشدا، من و تۆیش کەسانێک دەناسین، کە لە ژیانیدا هەڵە دەکەن بەوەی کە هەوڵ دەدەن دڵی بەرانبەرەکانیان کەمەندێش بکەن، بۆ ئەوەی تامەزرۆی خۆیان بکەن و بایەخیان پێ بدەن.

بە دڵنیاییەوە، ئەمە هیچ کاریگەریەکی نابێت، خەڵک گرنگی و بایەخ بە تۆ نادات و تامەزرۆی تۆ نییە، ئەوانە حەزیش بە من ناکەن، بەڵکو ئەوانە حەز بە خۆیان دەکەن و گرنگی و بایەخ بە خۆیان دەدەن، لە بەرەبەیانی و نیوەڕۆدا و لە ئێوەرانیشدا.

کۆمپانیایەکی تەلەفۆنی نیو یۆرک، لێکۆڵینەوەیەکی ورد و درشتی ئەنجامدا، بۆ ئەوەی بزانرێت ئاخۆ، کام وشەیە لە کاتی گفتوگۆکردندا زۆر دووبارە دەبێتەوە. دەتوانیت پێشبینی چ وشەیەک بکەی: ئەو وشەیە بریتییە، لە جێناوی "من" لە ٥٠٠ پەیوەندیی تەلەفۆنییدا ٣٩٠٠ جار بەکار هاتووە.

کاتێک سەیری، کۆمەڵێک وێنەی فۆتۆگرافی خۆت دەدەیت، ئەوا یەکەم جار سەیری کام وێنەیە دەکەیت؟

ئەگەر ئێمە تەنیا بمانەوێت بچینە دڵی خەڵکەوە و، وا بکەین خەڵک حەزی بە ئێمە بێت و بایەخمان پێ بدات ئەوا هیچ پێویست بەوە ناکات چەندین هاوڕێی ڕاستگۆ و دڵسۆزمان هەبن. هاوڕێ، هاوڕێی ڕاستەقینە، بەم شێوەیە دروست نابن و نادۆزرێنەوە.

***ناپلیۆن*** ئەمەی تاقی کردەوە، لە دواکۆبوونەوەی لەگەڵ ***جۆسیفن*** گوتی: "***جۆسیفن*** ئەوەندەی پیاوەکانم لەسەر زەویدا بەختەوەر و دڵخۆش بووم، لەگەڵ ئەوەیشدا، لەم ساتەدا تۆ تاکە کەسێکی لەم جیهانەدا کە دەتوانم پشتت پێ ببەستم." مێژوونووسان بەگومانن لەوەی کە توانیویەتی پشتی پێ ببەستێت یان نا.

***ئەلفرێد ئەدلەر***، دەروونناسی بەناوبانگی ڤینس، کتێبێکی نووسیوە، لەژێر ناونیشانی "ژیان چ مانایەک لە دیدی تۆوە دەگەیەنێت." لەو کتێبەدا دەڵێت: "ئەوە تاکە کەسە، کە حەزی لە هاوڕێکانی نییە و بایەخیان پێ نادات، ژیانێکی پڕ نارەحەتیان هەیە و، ئازارێکی زۆریان بۆ فەراهەم دەهێنێت. هەر لەنێو ئەو تاکە کەسانەیشدایە کە تەواوی شکتست و نەهامەتییەکانی مرۆڤ لەدایک دەبن."

دەتوانیت چەندین کتێب لەسەر دەروونناسی بخوێنییەوە بەبێ ئەوەی لە ئاستی یەک دەربڕینەوە بێت، کە گرنگی بۆ تۆ و، من هەبێت. ئەو گوتەیەی ***ئەدلەر*** لە مانادا هەر زۆر دەوڵەمەندە کە وا من ئەوها بەلاری دووبارەی دەکەمەوە:

*"ئەوە تاکە کەسە، کە حەزی لە هاوڕێکانی نییە و بایەخیان پێنادات، ژیانێکی پڕ نارەحەتیان هەیە و، ئازارێکی زۆریان بۆ فەراهەم دەهێنێت. هەر لەنێو ئەو تاکە کەسانەیشدایە کە تەواوی شکتست و نەهامەتییەکانی مرۆڤ لە دایک دەبن."*

جارێکیان خولێکم لەسەر ئەدای نووسینی کورتە چیرۆک کردەوە، لە زانکۆی نیو یۆرکدا، لەو ماوەیەدا پاکنووسێکی گۆڤار قسەی دەربارەی خولەکەی ئێمە کرد، دەتوانێت چەندین چیرۆک کە لەسەر مێزەکەی کەڵەکە بوون هەڵبژێرێت و، لەدوای خوێندنەوەی چەند بڕگەیەک دەتوانێت هەست بەوە بکات، ئاخۆ نووسەرەکە حەز و خولیایی بۆ خەڵک هەبووە. گوتی: "ئەگەر نووسەر حەزی لە خەڵک نەبێت، ئەوا خەڵک حەزی لە چیرۆکەکانی ئەو نابێت."

ئەم هەڵەبڕە، دوو جار لە خولەکەدا وەستا لە نووسینە خەیاڵییەکانی و پۆزشی هێنایەوە بەوەی کە ئامۆژگاری کردووە، گوتی: "من هەمان ئەو شتانەت پێ دەڵێم کە ئامۆژگاریکارەکەت بە تۆ دەڵێت، بەڵام لە بیرت نەچێت، تۆ دەبێت حەزت لە خەڵک بێت و بایەخیان پێ بدەیت، ئەگەر بتەوێت ببیت بە نووسەرێکی سەرکەوتووی چیرۆک نووسین." ئەگەر بۆ نووسینی چیرۆکی خەیاڵی ئەم قسەیە دروست بێت، ئەوا دڵنیا بە لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا ڕووبەڕوو، هەر ڕاست و دروستە.

لە ژووری پۆشاکەکانی ***هۆوار سێرستۆن***دا، ئێوارەیەکم بەسەر برد لە برۆدوەی، ***سێرستۆن*** جادووگەرێکی شارەزابوو. بۆ ماوەی چل ساڵ بە هەموو جیهاندا گەشتی کردبوو، دووبارە و دووبارە، کەشی تەمومژاوی وای خولقاندووە، کە خەڵکی سەرسام کردووە. نزیکەی شەستملیۆن کەس پارەی داوە بۆ ئەوەی کارەکانی ببینن، ئەویش لەبەرانبەردا نزیکەی دوومليۆن دۆلاری قازانج کردووە.

لە بەڕێز ***سێرستۆنم*** پرسی ئاخۆ نهێنی سەرکەووتنی چی بووە، بێگومان لە قوتابخانەدا هیچ شتێک دەربارەی ئەم کارانە فێر نەبووە و، هەر بە منداڵیش لە ماڵەوە ڕای کردووە و، بووە بە سواڵکەر و لەسەر شەقامەکان خەوتووە، ماڵ بە ماڵ گەڕاوە و سواڵی خواردنی خۆی کردووە، لە هێماکانی سەر شەقامیش فێری خوێندنەوە بووە.

ئایا ئەو کابرایە شارەزاییەکی زۆری هەبوو، لە جادووکردندا؟ نەخێر، خۆی پێی گوتم کە کتێبگەلێکی زۆر بوونیان هەیە، دەربارەی فێڵبازی و جادووکردن و، خەڵکی زۆریش دەزانن کە ئەو جۆرە کتێبانە بوونیان هەیە. وەلێ ئەو دوو شتی هەبوو کە کەسانی دیکە لێی بەری بوون: یەکەمیان، ئەو توانایەی هەبوو، کە کەسایەتی خۆی بخاتە ژێر ڕۆشنایی و، کەسێکی شارەزایە لە سروشتی مرۆڤدا. هەر شێک کە دەیکرد، هەر ئاماژەیەک، هەر بەرز و نزمییەک لە ئاوازی دەنگیدا، هەر جووڵە و بەرزبوونەوەیەکی برۆی جێگەی خۆی دەگرت. بەڵام سەرباری هەموو ئەوەیش، *سێرستۆن* بایەخێکی زۆری بە خەڵک دەدا، پێی گوتم کە زۆرێک لە جادووبازان سەیری جەماوەر دەکەن و، بەخۆیان دەڵێن: "زۆرباشە، زۆر هەست بە گەورەیی دەکەم، کە ئەو خەڵکانە سەیری من دەکەن، ئیدی منیش ئەوانە دەگەمژێنم و بژێوی خۆمیان پێ پەیدا دەکەم."

بەڵام شێوازی *سێرستۆن* تەواو جیاواز بوو، خۆی بۆی باسکردم، کە هەر جارێک دەڕۆیشتە سەر تەختی شانۆ، بە خۆی دەگوت: "من سوپاسگوزارم، چونکە ئەو خەڵکانە هاتوون من ببینن، وام لێ دەکەن، کە بە شێوەیەکی باشتر بژێوی ژیانی خۆم پەیدا بکەم و، منیش هەرچی لە توانامدا بێت بۆیان بەرجەستە دەکەم."

هەروەها باسی ئەوەیشی بۆ کردم، کە هیچ هەنگاوێکی نەناوەتە سەر تەختی شانۆ، هەتا دووبارەودووبارە بە خۆی نەگوتبێت: "جەماوەری خۆمم خۆش دەوێت، جەماوەری خۆمم خۆش دەوێت." ئایا ئەمە شتێکی گاڵتەجارییە؟ شتێکی هیچوپووچە؟ مافی خۆتە بیر لە هەر شتێک بکەیەوە، کە خۆت حەزت لێیەتی، منیش بەبێ هیچ لێدوانێک ئەمرەفتارەی جادووگەرێکی بەناوبانگ بۆ تۆ دەنووسمەوە.

*جۆرج دیکی*ـی باکووری وارن، پێنسیلڤانیان، ناچار کرا بۆ ئەوەی خانەنیشن بێت لەدوای سێ ساڵ لە خزمەتکردنی لە ئێسگەیەکی

کارکردنـدا، کاتێـک ڕێگـایەکی گشـتی نـوێ بنیـاتنرا لەسـەر سـایتی وێسـگەکەی. ئەوەنـدەی نەبـرد بەر لەوەی ڕۆژانـی خانەنیشـنبوون دەست پێ بکەن بۆ ئەوەی بەرگەی بگرێت.

لەبەر ئەوە دەستی بە پڕکردنەوەی کاتەکەی خۆی کرد، بە ژەنینی کەمانە کۆنەکەی. دەستبەجێ سەیری ئەو شوێنەی دەکرد، بۆ ئەوەی گـوێ لە میوزیـک بگرێـت و، قسـە لەگەڵ زۆرێـک لە کەمـان ژەنە کارامەکانـدا بکـات. بە شـێوازە خـاکی و دۆسـتانەکەی بە گشـتی تامەزرۆی فێربوونی باگراوند بوو و، بایەخی بە هەر میوزیک ژەنێک دەدا، کە چاوی پێ دەکەوت. وەلێ هەرچەنـدە خۆی کەمـان ژەنێکی لێـزان نەبـوو، کەچـی هـاوڕێگەلێکی زۆری پەیـدا کـرد. بەشـداری لە پێشـبڕکێکردن دەکـرد و، هەر زوو هەوادارێکـی زۆری لە بەشـی خـۆرهەڵاتی ویلایەتەیەکگرتووەکـان پەیـدا کـرد وەکـوو، ***مـامە جـۆن،*** نەخشسازی کەمان لە کینزوا کەنتری. کاتیک گوێبیستی ***مامە جۆرج*** بووین، تەمەنی بیستودوو ساڵ بوو، چێژی لە هەر خولەکێکی ژیانی خـۆی دەبینـی. لە ڕێـگەی هەبـوونی حەز و بایەخـدانی بە خەڵـک، ژیـانێکی نـوێی بـۆ خـۆی دروسـت کردبـوو لە کاتێکدا هەمـوو خەڵـک دەستیان لە ساڵانی پڕبەها شۆرد بوو.

ئەمەیشیان یەکێک بوو، لە نهێنییە سەرسامکەرەکانی ناوبانگی ***سیدۆر ڕوسـێفێلت،*** تەنـانەت خزمەتکارەکـانی ئەویـان خـۆش دەویسـت. خزمەتکارە تایبەتەکەی، ***جەیمز، ئـی، ئامۆس*** کتێبێکی دەربارەی ئەو نووسـیوە لەژێـر ناونیشـانی ***سـیدۆر ڕوسـێفێلت*** پـاڵەوانەی خزمەتکارەکەی.

لەو کتێبەدا، ***ئیمۆس*** ئەو ڕووداوە بەیان دەکات:

خێـزانەکەم جارێکیـان داوای لە سـەرۆک کـرد، دەربـارەی قەتـێ، کە هەرگیـز باڵندەیەکی لەم شـێوەیەی نەبینیبـوو، ئەویـش بەوردودرشـتی وەسـفی ئەو باڵنـدەییەی بـۆ خێـزانەکەم کـرد. لەدوای مـاوەیەکی کەم

زەنگی تەلەفۆن لە کۆختێک لێیدا، *ئامۆس* و خێزانەکەی لە کۆختێکدا دەژین لە ناوچەی ڕوسیڤێلت لە ئۆیستەر بەی، خێزانەکەم وەڵامی ئەو تەلەفۆنەی دایەوە و، بەڕێز *ڕوسیڤێلت* خۆی بوو، پێی گوتبوو، وا قەتێیەک لە دەرەوەی پەنجەرەکەیە و ئەگەر حەز دەکات ببینێت با سەیری دەرەوە بکات. ئەم شتە وردانە ئەم سەرۆکەیان لە هەر کەسێکی دیکە جیا دەکردەوە و سیفەتی ئەوبوون. هەر کاتێک بەلای ماڵەکەی ئێمەدا گوزەری بکردایە، وەلێ لە بەرچاوانیش نەبووین، بەڵام گوێمان لێی دەبوو، "ئۆو ئۆو ئانی؟" یاخود دەیگوت: "ئۆ ئۆ ئۆ جەیمز!" ئەمە تەنیا سڵاوێکی هاوڕێیانە بوو، کە ئاڕاستەی ئێمەی دەکرد.

چۆن کارمەندەکان دەتوانن پیاوێکی لەم شێوەیان خۆش نەوێت؟ چۆن مرۆڤ دەتوانیت پیاوێکی ئەوهای خۆش نەوێت؟

ڕۆژێک *ڕوسیڤێلت* سەردانی کۆشی سپی دەکات، کاتێک سەرۆک و خاتوو *تافت* لەوێ نین، لەو سەردانەیدا خۆشەویستییە خاکییەکەی خۆی بۆ خەڵکی ئەوێ دەربڕی، بە هۆی ئەو ڕاستییەی کە سڵاوی لە هەموو خزمەتکارە بەتەمەنەکانی کۆشکی سپی دەکرد بە ناوی خۆیان، تەنانەت سڵاوی لە ئاشپەزانیش دەکرد.

*ئارچی بەت* دەنووسێت: "کاتێک *ئەلیس*ـی بینی، خزمەتگوزاری چێشتخانە، لێی پرسی ئاخۆ هێشتا نانی خەلە دروست دەکات. ئەویش وەڵامی دایەوە کە هەندێک جار بۆ خزمەتکارەکان دروستی دەکات، بەڵام هیچ کامێک لە ئەوانەی نهۆمی سەرەوە نایخۆن."

*ڕوسیڤێلت* گوتی: "ئەوانە ئارەزووی خواردنیان نییە، هەر کە چاوم بە سەرۆک کەوت باسی ئەمەی بۆ دەکەم."

"*ئەلیس* لەسەر دەورییەک کەرتە نانێکی بۆ هێنا، بەدەم خواردنییەوە بەرەو نوسینگەکە ڕۆیشت و، هەر کە ڕۆیشت سلاوی لە باغەوانەکان و کرێکارەکان کرد."

"هەر بە شێوەی جاران ناوی کەسەکانی دەبرد، *ئایک موڤەر* کە بۆ ماوەی چل ساڵ سەرۆکی ڕێنیشاندەر بوو، بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە گوتی: 'لەماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا، تاکە ڕۆژێکی پڕ لە خۆشی و شادیی بوو، هیچ کەسێک لە ئێمە نەبوو بە بڕی دوو سەد دۆلار ئەو ڕۆژە بگۆڕێتەوە.'"

هەمان شتییش یارمەتی *ئێدوارد ئێم سیکسی*دا، جی‌ئاڕ، کاسام، نیو جێرسی پارێزگاری لە حسابێک کرد، گوتی: "چەند ساڵێک لەمەوبەر، بانگی کڕیارانم کرد بۆ جۆنسۆن و، جۆنسۆن لە ناوچەی ماساچووسێتس بوو. یەکێک لەوانە کۆگای دەرمان بوو لە هینگهام. هەر کاتێک ڕۆیشتبام بۆناو ئەو کۆگایە، ئەوا هەردەم قسەم لەگەڵ کاتب و کاتبی فرۆشتندا دەکرد، بەر لەوەی لەگەڵ خاوەنەکەیدا بدوێم بۆ ئەوەی لە داواکانی تێبگەم. ڕۆژێکیان ڕۆیشتم بۆلای خاوەنی کۆگاکە و، داوای لێ کردم کە بەجێی بهێڵم لەبەر ئەوەی چی دیکە حەزی بە کڕینی بەرهەمەکانی *جەی‌وجەی* نەبوو، چونکە لەو باوەڕادا بوو، کە ئەمە تەرکیزیان لەسەر چالاکییەکانی خواردن و داشکاندن چڕ دەکاتەوە بۆ دوکانەکان. هەستم بە نیگەرانی و شەکەتی کرد و، بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک بە ئۆتۆمبێلەکەم لەو دەوروبەرە سوڕامەوە. لە کۆتاییدا، بڕیارمدا بگەڕێمەوە و، هەر بەلایەنی کەمەوە هەوڵی ڕوونکردنەوەی پێگەی خۆمان بدەم بۆ خاوەنی کۆگاکە.

"کاتێک گەڕامەوە، ڕۆیشتمە ژوورەوە و، هاوشێوەی جاران، سلاوم لە کاتبی سۆدە و فرۆشتن کرد. کاتێک گەیشتمە لای خاوەنەکە، بەڕووی مندا بزەی کردوو و بەخێرهاتنی لێ کردم. لەدوای ئەوە دوو ئەوەندەی جاران فەرمانی بەسەردا کردم. ئیدی منیش هەر سەرسام

بـــووم و داوام لێــی کـــرد کە ئـــاخۆ چـــی ڕووی داوە بە بەراورد بە سـەردانەکەی چەند کاتژمێرێک لەمەو بەر. ئەویش ئاماژەی بە پیاوە لاوەکەی کاتبی سۆدە کرد و، گوتی لەدوای ئەوەی من ئەوێم بە جێ هێشت، ئەو لاوە هاتە لای من و پێی گوتم، کە من یەکێک لەو کەسە کەمانەم، کە سەردانیان دەکەم و هەواڵی ئەو و، ئەوانی دیکە دەپرسم. ئەو لاوە لە خـاوەنەکەی پرسـی بوو، ئەگەر هەر فرۆشـیارێک شـیاوی ئەو کـارە بێـت، ئەوا مـنم. بەمەیـش خـاوەنەکە ڕازی بـوو وەکـوو کڕیـارێکی دڵسـۆز مـایەوە، هەرگیـز بیـرم لەوە نەکردبـوویەوە کە بایەخـدان بەخەڵکـی کـاریگەری لەســەر فرۆشـتن دەبێـت، بـۆ هەر کەسێک، بۆ هەر کێشەیە."

لە میانەی ئەزمـوونی خـودی خـۆمەوە، بـۆم دەرکەوتـووە کە کەسێک دەتوانێـت سـەرنج و کـات و هاوکـاری لە زۆربەی خەڵـک بەدەسـت بهێنێت، تەنیا بەوەی کە بایەخ بە ئەوان بدەیت و حەزت لێیان بێت. با ڕوونی بکەمەوە:

چەند ساڵێک لەمەوبەر، لە پەیمانگای بڕۆکلین بۆ هونەر و زانستەکان، وانەی نووسـینی چیرۆکـی خەیـاڵم دەگـوتەوە، دەمانویسـت بانگێشـتی هەندێک نووسـەری دیـار و ناسـراو بکەیـن، ***کاسـترین نۆریس، فـانی هێرست، ئیدا تاربێڵ، ئەلبێرت پایسن تێرهوون*** و، ***ڕوپێرت هـوگز***، بۆ ئەوەی بێنە بڕۆکلین و ئەزمـوونی خۆیان بۆ ئێمە بەیـان بکەن. لەبەر ئەوە نامەمان بۆ نوویسن و تێیدا گوتمان: "ئێمە ڕێز لە کارەکەی ئێوە دەگـرین و، لە قـووڵایی دڵمـانەوە حەز دەکەیـن لە ئامۆژگـاری ئێـوە بەدەرنەبین و نهێنییەکانی سەرکەوتنتان فێر بین."

هەر کامێـک لەو نامـانە، لەلایەن نـزیکەی سـەدوپەنجا قوتـابی ئیمـزا کرابـوون، ئەوەیشـمان گـوت کە درکمـان کـردووە، ئەو نووسـەرانە سـەرقاڵن، زۆر سـەرقاڵن بـۆ ئەوەی وانە ئامـادە بـکەن. بەمەیـش هەستاین بە پڕکردنەوەی لیستێک بە کۆمەڵێک پرسیارەوە بۆ ئەوەی

دەربارەی خۆیان و، شێواز و ئەدای کارکردنیان وەڵاممان بدەنەوە. ئەوانیش حەزیان بەوە دەکرد، مەگەر کێ حەزی لەمە نەبوو؟ بەمەیش ماڵەکانی خۆیان بەجێ هشت و بەرەو برۆکلین بەڕێ کەوتن، بۆ ئەوەی دەستی یارمەتی بە ڕووی ئێمەدا درێژ بکەن.

بە بەکارهێنانی هەمان شێواز، ***لیسلی ئێم شاوم*** ڕازی کرد، سکتێری خەزێنەی کابینەی ***سیدور ڕوسیڤێلت***، ***جۆرج دەبلیو ویکەرشام***، پارێزەری گشتی کابینەی ***تافت***، ***ولیەم جێنگز براین***م ***فرانکلین دی ڕوسیڤێلت***، چەندین کەسانی دیاری دیکە، بۆ ئەوەی بێن و قسە بۆ قوتابییەکان بکەن لە پەیمانگەکەی مندا، لە ڕێگەی گوتارەوە.

هەموومان کرێکار نین لە کارگەدا، کاتب نین لە نووسینگەدا یاخود تەنانەت شای سەر تەخت بین، هەموومان ئەو کەسانەمان خۆش دەوێت کە ڕێزمان دەگرن. قەیسەری ئەڵمانیا بۆ نموونە لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، یەکێک بوو لە هەرە پیاوە خۆویستەکان لەسەر ڕووی زەویدا. تەنانەت هەر نەتەوەکەی خۆیشی لەدژی ڕاپەڕین و پشتیان تێ کرد، بەمەیش بەرەو هۆڵەندا بەڕێ کەوت، بۆ ئەوەی ژیانی خۆی ڕزگار بکات. ڕقوقینەی خەڵک بەرانبەر بەو کابرایە ئەوەندە بوو، کە ملیۆنان کەس حەزیان دەکرد پارچەپارچەی بکەن و بیسوتێنن.

لەنێو ئەم دۆخە پڕ لە ڕقوقینەدا، منداڵێکی بچووک نامەیەکی بۆ قەیسەر نووسی، نامەیەکی سادە و دڵسۆزانە، پڕ لە میهرەبانی و ئەندێشە "هەردەم ***ویلهێلم*** خۆش دەوێت وەکوو ئیمپراتۆرێک." ئیتر ئەم نامەیە هەر بە تەوای کاری لە قەیسەر کردوو و بانگهێشتی منداڵەکەی کرد بۆ ئەوەی بیبینێت. ئیدی منداڵەکە و دایکی هاتن و لەدواییدا قەیسەر هاوسەرگری لەگەڵ دایکی منداڵەکەدا کرد، ئەو منداڵە بچکۆلانە پێویستی بەوە نەبوو، کە کتێب بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی

کاریگەری لەسەر خەڵک دابنێت و بچێتە دڵی خەڵکەوە، بەڵکو ئەو هەر بە شێوەیەکی غەریزەیی ئەمەی دەزانی.

ئەگەر دەمەنانەوێت هاوڕێ پەیدا بکەین، ئەوا با خۆمان تەرخان بکەین، بۆ کردنی شتانێک بۆ ئەوان، شتانێک کە پێویستیان بە کات، وزە، بێفیزی و ئەندێشەیی دەبێت. کاتێک ***دووکی ویندسۆر***، شازادەی وێلز بوو، نەخشەی دانابوو، بۆ ئەوەی گەشت بەرەو باشووری ئەمریکا بکات، بەر لەوەی دەست بە گەشتەکە بکات، بۆ ماوەی چەند مانگێک خۆی سەرقاڵی فێربوونی زمانی ئیسپانی کرد، بۆ ئەوەی لەوێ بە زمانی ئەو وڵاتە گوتار بدات، بەمەیش دانیشتوانی باشوری ئەمریکا، ئەویان زۆر خۆش دەوێت.

بۆ چەند ساڵێک هەوڵم دا، بۆ ئەوەی ڕێکەوتی لەدایکبوونی هاوڕێکانم بزانم، چۆن؟ هەرچەندە من زانستی غەیب و ئەستێرەناسی نازانم. ئەو ڕۆژە، لە یەکێک لە هاوڕێکانم پرسی ئایا ڕێکەوتی لەدایکبوونی مرۆڤ، هیچ پەیوەندیی بە کەسایەتی و پلەوپایەوە هەیە؟ پاشان داوام لێ دەکرد بۆ ئەوەی بەروار ورۆژی لە دایک بوونیم پێ بدات، بۆ نموونە، ئەگەر گوتبای ٢٤ی شترینی دووەم، ئەوا بەردەوام بەخۆمم دەگوت: "٢٤ی شترینی دووەم، ٢٤ی شترینی دووەم،" هەر کە هاوڕێکانم ڕوویان تێ دەکردم، ناوەکەی و بەرواریم دەنووسی، پاشانیش، لە دەفتەری لە دایکبووندا تۆمارم دەکرد.

لە دەستپێکی هەر ساڵێکی نوێدا، بەروارەکانم لە خشتەیەکدا لای خۆم تۆمار کردبوو و، هەر بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە بەرچاوانم بوون. هەر کە ڕۆژی لە دایکبوون دەهاتە پێشەوە، نامە یان بروسکەیەم بۆی دەنارد. دەبێت ئەم هەڵوێستە چ کاریگەرییەکی لەسەر ئەو کەسە دروست کردبێت!

ئەگەر بمانەوێت هاوڕێ بۆ خۆمان پەیدا بکەین، ئەوا با بە هەستێکی پڕ لە گەرموگوڕییەوە سڵاو لە خەڵک بکەین. کاتێک کەسێک

پەیوەندیت پێوە دەکات، ئەوا هەمان یاسا پەیڕەو بکە، بڵێ سڵاو، بە ئاوازێکی ئەوتۆ قسە بکە، کە وا هەست بکات، خۆشحاڵی بە قسەکردنت لەگەڵ ئەودا. زۆرێک لە کۆمپانیاکانی پەوەندیکردن مەشق بە کارمەندەکانیان دەکەن بۆ ئەوەی بە هەست و ئاوازێکی پڕ لە گەرموگوڕییەوە وەڵامی پەیوەندییەکان بدەنەوە. کەوایە با ئەمەمان لەبیر بێت، کاتێک بەیانی وەڵامی پەیوەندی دەدەینەوە.

بەرجەستەکردن و نیشاندانی هەستێکی پڕ لە بایەخ و تامەزرۆ، هەر نابێتە هۆی ئەوەی هاوڕێ پەیدا بکەیت، بەڵکو دەکرێت هەستێکی دڵسۆزی لە کڕیارەکاندا بخولقێنێت بەرانبەر بە کۆمپانیاکەت. لە دۆزێکی بڵاوکردنەوە لە بانکی نودەوڵەتی باشووری ئەمریکا لە نیو یۆرکدا، ئەم نامەیەی خوارەوە لە ***مەیلاین ڕۆوزدەیل***، یەکێک لەوانەی حساباتی بانکیان هەبوو، ئەمەی بڵاو کردبوویەوە: "حەز دەکەم بزانن، کە چەندێک سوپاس و دەست خۆشیم هەیە بۆ ستافە ڕەنگینەکەی ئێوە، هەموویان زۆر بە ڕەفتارن، بەڕێزن، یارمەتیدەرن. ئەمە چ خۆشی و شادییەکە، لەدوای نۆرە گرتنێکی زۆر، کەچی ئەوان بە ڕوویەکی خۆشەوە سڵاومان لێ دەکەن."

"ساڵی ڕابردوو، دایکم بۆ ماوەی پێنج مانگ لە نەخۆشخانە خەوێندرابوو، جاروبار دەچووم بۆ ماری پێتروسێلۆ، هەواڵنێر، ئەویش نیگەرانی دایکی من بوو و، داوای چاکبوونەوەی دەکرد."

ئایا هیچ گومانێک بوونی هەیە، کە خاتوو ***ڕۆوزدەیل*** بەردەوام دەبێت بۆ ئەوەی ئەم بانکە بەکار بهێنێت؟

***چارلز ئار والتەرز***، بەڕێوەبەری یەکێک لە بانکە گەورەکانی شاری نیو یۆرک، داوای لێ کرا بۆ ئەوەی ڕاپۆرتێک دەربارەی کۆمپانیایەکی تایبەت ئامادە بکات، ئەم بەڕێوەبەرە پیاوێکی دەناسی کە هەموو زانیارییەکانی لا دەست کەوت، هەر کە بەڕێز ***والتەرز*** ڕۆیشتە

نووسینگەکەی سەرۆک، کچە سکتێرەکە لەبەردەم دەرگا بەرۆکی گرت و پێی گوت کە ئەمڕۆ هیچ پولێکی لا نییە.

سەرۆک بۆ بەڕێز *والتەرزی* ڕوون کردەوە، "من ئەو پولانە بۆ کوڕە دوازدە ساڵانەکەم کۆ دەکەمەوە."

بەڕێز *والتەرز* دەستی بەڕوونکردنەوەی پامەکەی کردوو و، دەستی بە پرسیارکردن کرد. بەڵام وەڵامەکانی سەرۆک زۆر تاریک و لێڵ و نادیار بوون، نەیدەویست قسە بکات، وا دیار بوو شتێک نەبێت قەناعەتی پێ بکات و بیتەگۆ، بەمەیش چاوپێکەوتنە وشک و کورت بوو.

بەڕێز *والتەرز* کاتێک، ئەم چیرۆکەی لە پۆلدا گێڕایەوە: "بەڕاشکاوی بدوێم، نەم دەزانی چی بکەم، پاشان ئەوەم بیر کەوتەوە، کە سکتێرەکە چی پێ گوتبوو دەربارەی، پولەکان، کوڕێکی تەمەن دوانزە ساڵان،، بیرم کەوتەوە کە بەشی بیانی بانکەکەمان پول کۆ دەکاتەوە، ئەو پولانەی کە لە هەموو کیشوەرەکانەوە، بۆی هاتوون و بە ئاوی حەوت دەریا شۆردراون."

"پاش نیوەڕۆی دواتر، دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ دیدەنی ئەو پیاوە، پێیم گوت کە پولم هێناوە بۆ کوڕە دوانزە ساڵانەکەی، ئایا بە هەستێکی پڕ لە جۆش‌وخرۆشەوە ڕۆیشتمە ژوورەوە؟ بەڵێ گەورەم. ئەگەر بە پەلەپەل ڕۆیشتبایە بۆ کۆنگرێس ئەوا بەم شێوەیە گەرم‌وگوڕەوە تۆقەی لەگەڵ نەدەکردم. بزەی دەکرد و هیوای باشی دەخواست. بەدەم دەستلێدان لە پولەکانەوە دەیگوت: "*جۆرجی* کوڕم حەزی لەمەیانە، سەیری ئەمە بکە! ئەمەیان گەنجینەیە."

"نیو کاتژمێرمان دەربارەی سەیرکردنی پولەکان بەسەر برد و، سەیری وێنەی کوڕەکەمان دەکرد، ئەویش نزیکەی کاتژمێرێکی تەرخان کرد و، کاتی پێدام و، هەر زانیارییەکم ویست پێی دام، هەر

بەر لەوەی خۆشم داوا بکەم، ئەو پێی دەدام. هەموو ئەو شتانەی کە ئەو دەیزانین پێی گوتم، پاشان فەرمانبەرەکانی بانگ کردن و، پرسیاری لێ کردن، لەدوای ئەمەیش، پەیوەندی بە یاریدەدەرەکانی کرد هەندێک راپۆرت و راستی پێدام، ئیتر وام لێهاتبوو ئەوەندەی رۆژنامەنووسێک زانیاریم لا گەڵاڵە ببوو."

لێرەدا نموونەیەکی دیکە بوونی هەیە:

***سی ئێم، کناڤل***، جری فیلادیلفا، بۆ ماوەی چەند ساڵێک هەوڵی دابوو، پێترۆڵ بە زنجیرە کۆگای رێکخراوێک بفرۆشێت، بەڵام کۆمپانیاکە هەوڵەکانی ئەمی رەت کردەوە و نەیدەویست سوتەمەنی لەو بکڕێت. شەوێکیان بەڕێز ***کناڤل*** وتاری بۆ یەکێک لە پۆلەکانمدا، ئاگری تورەیی خۆی بەسەر کۆمپانیاکەدا ڕشت و بەوە ناوزەندی کردن، کە ئەوانە نەفرەتن بەسەر نیشتیمانەوە."

هێشتا هەر سەرسامی ئەوە بوو، کە بۆچی ناتوانێت پێیان بفرۆشێت؟

منیش پێشنیازم بۆی کرد، کە تاکتیکی جیاواز بەکار بهێت، لە کورتی بیبرێنەوە، بزانە چی رووی دا. گفتوگۆیەکمان لەنێوان ئەندامەکاندا بەرجەستە کرد، لەژێر ناونیشانی، بڵاوبوونەوەی زنجیرەکان و لقەکانی کۆمپانیا، ئایا زیانی زیاتر دەبێت وەکوو لە سوود."

***کناڤل*** لەژێر رۆشنایی پێشنیاری مندا، لایەنە نەرێنییەکەی وەرگرت، رازیبوو، بۆ ئەوەی بەرگیری لەو کۆمپانیایە بکات، لەدواییدا پێی نایەسەر سەرپەرشتیاری جێبەجێکاری زنجیرەکانی کۆمپانیان و سووکایەتی پێکردن و گوتی: "بوونی من لێرەدا هەوڵدان نییە بۆ فرۆشتنی سوتەمەنی، من بۆ ئەوە هاتوومە ئێرە، بۆ ئەوەی یارمەتیم بدەن." پاشان دەربارەی گفتوگۆکەی دوا و، گوتی: "من هاتووم داوای یارمەتیتان لێ بکەم چونکە ناتوانم بیر لە هیچ کەسێکی دیکە بکەمەوە، کە توانای لە ئێوە زیاتر بێت، بۆ ئەوەی ئەو راستیانەم بۆ بخاتە روو

كه مــن دەمەویـن. مــن زۆر بەپەرۆش و نـیگەرانم، بـۆ ئەوەی ئەو گفتوگۆیە ببەمەوە، لە قووڵایی دڵمەوە سوپاسـتان دەكەم، ئەگەر هەر پارمەتییەكم پێشكەش بكەن."

ئەمەیە پاشكۆی، چیرۆكەكەی بەڕێز *كنافل* لەسەر زووبانی خۆی:

"داوام لەو پیاوە كرد، بۆ ئەوەی خولەكێكم لە كاتی خۆی پێ بدات، هەر لەسـەر بنەمـای ئەم تێگەیشـتنە نەبـوو، كە ڕازیبـوو بـۆ ئەوەی چاوی بە من بكەوێت، لەدوای ئەوەی حاڵەتەكەی خۆمم بۆی بەیان كرد، ئاماژەی پێ كـردم، بۆ ئەوەی لەسـەر كورسـییەك دابنیشـم، و بیزەبت یەك كاتژمێر و چلوحەت خولەك قسەی بۆ كردم. دوایـی بانگی بەڕێوەبەرێكی كرد كە دەربارەی زنجیرەی كۆگاكانی نووسـی بـوو، پاشـان نووسـراوێكی نووسـی بـۆ كـۆمەڵەی نیشـتیمانی كۆگـا زنجیرەییەكان، بۆ ئەوەی ڕێنووسـێكی گفتوگۆم لەسـەر گفتوگۆی ئەو بـابەتە بـۆ ئامـادە بـكەن، وا هەسـت دەكـات كە كۆگـا زنجیرەییەكـان خزمەتێكـی ڕاسـتەقینە بە مرۆڤـایەتی دەكەن، شـانازیش بەو كـارەوە دەكـات كە لەپێنـاو چەنـدین كـۆمەڵگەدا دەیكـات. لە كـاتی قسـەكردندا چاوەكـانی دەبریسـكانەوە، دەبێـت دان بە ئەوەدا بنـێم، كە چاوەكـانی منـی بە ڕووی شــتانێكدا كــردنەوە، كە هەرگیــز خەونــم پێیــانەوە نەبینیبوو. تەواوی دیدگا و تێڕوانینی منی گۆڕی بوو."

"كاتێك بەجێم هێشت، تا بەردەرگا لەگەڵـم هـات، باوەشـی پێدا كردم، هیـوای سـەركەوتنی لە گفتوگۆكەمـدا بـۆ خواسـتم و، داوای لـێ كـردم جـارێكی دیـكە، سـەردانی بـكەمەوە و ئاگـاداری بـكەمەوە ئـاخۆ چـیم كردوو و بەچـی گەیشـتووم. كۆتـا وشـەكانی بریتیبـوون لە: "هیـوادارم دواتر لە بەهاردا سەردانم بكەیت، چونكە حەز دەكەم ڕێكەونت لەگەڵ بكەم بە مەبەستی كڕینی سوتەمەنی."

"لە دیـدگای مـنەوە ئەوە شـتێكی نائاسـاییبوو، لێـرەدا داوای كڕینـی سـوتەمەنی، لە مـن دەكـرد هەر بـێ ئەوەی مـن داوای لـێ بـكەم، لە

ماوەی دوو کاتژمێردا شتێکی ئەو تۆم کرد، بەوەی کە بایەخم بە خۆی و کێشەکانی دا، کە دەشێت بە جۆرێک لەماوەی دە ساڵدا، نەم توانیبایە شتێکی ئەو تۆ بکەم کە ئەو بایەخ و گرنگی بە من بدات."

بەڕێز ***کنافل*** ئەمە دۆزینەوەی نهێنییەک و ڕاستییەکی نوێ نییە، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، سەد ساڵ بەر لە زایین و بەر لەوەی مەسیح لەدایک بێت، هۆزانڤانێکی ڕۆمانی، ***پەبلیلوس سایروس*** گوتوویەتی: "ئێمە عاشق بە خەڵک دەبین و بایەخیان پێ دەدەین، کە ئەوان ئەمە بەرانبەر بە ئێمە دەکەن."

نیشاندانی هەست و بایەخ، هاوشێوەی بنەماکانی دیکەی پەیوەندییە مرۆییەکان، دەبێت هەست و سۆزی تێدا بەدی بکرێت، دەبێت لە دیدی هەر دوو لادا بەدی بکرێت، ئەمە ڕێگایەکی دوولایەنەیە، هەردوو لا سوود دەبینن.

***مارتین گینزبێرگ***، کە لە لۆنگ ئایلەند، نیو یۆرک بەشداری خولەکەی ئێمەی کردبوو، گوتی کە بە هۆی ئەوەی پەرستارێک بایەخێکی تایبەتی پێداوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ژیانی هەبووە.

"ئەمە ڕۆژی ستایشکردن بوو، منیش دە ساڵان بووم. لە قاوشێکی چاودێری بووم لە نەخۆشخانەی شارێک، پلان وا بوو کە ڕۆژی دواتر، نەشتەرگەریم بۆ بکرێت، تەنیا ئەوەم دەزانی کە دەبێت چەند مانگێک بنوارم لە ژان و بووژانەوە و ئازاردا. باوکم کۆچی دوایی کردبوو، من و دایکیشم لە باڵەخانەیەکی بچووک دەژیاین و، لە خۆشی و بەختەوەری خۆماندا بووین، لەو ڕۆژەدا دایکم نەیدەتوانی سەردانم بکات.

"هەر کە ڕۆژەکان گوزەریان کرد، ئیدی بەسەر هەستی تەنیایی، نائومێدی و ترسدا زاڵ بووم. ئەوەیشم دەزانی کە دایکم وا لە

ماڵەوە نیگەرانی منە، بە تەنیایە و هیچ کەسێکی لەگەڵ نییە، هیچ کەسێکی لەگەڵ نییە، بۆ ئەوەی نانی لەگەڵدا بخوات، پارەیەکی ئەوەندەی نییە بۆ ئەوەی خوانی ئێوارەی لەم ئێوارەیەدا پێ بکڕێت."

"چاوەکانم پڕ لە ئەسرین بوون، سەرم خستە سەر سەرینەکەم و، سەری خۆم داپۆشی. لە ناخی خۆمدا دەگریام و دەکولام، بەلام زۆر تاڵ و تفت بوو، بە جۆرێک کە جەستەم کەوتبوویە ژانەوە."

"پەرستارێکی قوتابی لاو گوێبیستی هەنسکی من بوو و، هاتە لای من. سەرچەفەکەی لەسەر لادام و، دەستی بە سڕینی فرمێسکەکانی من کرد، بۆی باسکردم، کە چۆن تەنیا بووە و دەبێت ئەو ڕۆژە کار بکات، لەبەر ئەمە نەیتوانیووە لەگەڵ خانەوادەکەیدا بێت. ئیتر داوای لێ کردم کە ئاخۆ دەتوانم خوانی ئێوەرە لەگەڵ ئەو بخۆم، دوو سینییە خواردنی هێنا، پارچە گۆشتی قەل و پەتاتەی ورد کراو، لەگەڵ ساسی تووترک و ئایسکرێمدا، بۆ ئەوەی پێش نان بیخۆین. ئیدی قسەی بۆ دەکردم و هەوڵی دەدا ترسەکانم بڕەوێنێتەوە. وەلێ دەبووایە بەدەم ئەرکی خۆیەوە بڕوات، لە کاتژمێر چواری ئێوارەوە، لەسەر کاری خۆی مایەوە هەتا کاتژمێر یانزەی شەو، یاری لەگەڵ من دەکرد و قسەی بۆ دەکردم، هەتا خەوم لێ کەوت لەگەڵمدا مایەوە.

"لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە، چەندان ساڵیادی سپاسکردن گوزەریان کردووە، بەلام ئەو دانەیەم هەرگیز لە بیر ناچێتەوە، هەستەکانم لە بێهیوای، ترس، تەنیاییدا هەروەها مەیل و هەستگەرمی کەسێکی نامۆ کە وای لێ کردم بەرگەی ئەو ئازارانە بگرم."

ئەگەر دەتەوێت خەڵک حەزی، لە تۆ بێت و تۆی خۆش بوێت، ئەگەر دەتەوێت پەرە بە پەیوەندییەکی ڕاستەقینە بدەیت، ئەگەر دەتەوێت یارمەتی خەڵک بدەیت و لە هەمان کاتیشدا یارمەتی خودی خۆت بدەی ئەوا ئەم بنەمایەت لە بیر و هزردا بێت:

**"سەرشیتانە گرنگی و بایەخ بە خەڵک بدە."**

## تەکنیکی پێنجەم

## چۆن وا دەکەی، خەڵک دەستبەجێ تۆیان خۆش بوێت

لە نۆرەدا وەستابووم، بۆ ئەوەی نامەیەک لە ڕێگەی بەریدەوە بەڕێ بکەم لە شەقامی سیوسێ، ڕێگای هەشتەم لە نیو یۆرکدا. تێبینی ئەوەم کرد، کە فەرمانبەرەکە لە کارەکەی خۆی بێزار بووە – کاغەزەکانی ئامادە دەکرد، پولەکانی ڕادەست دەکردن، گۆڕانکاری دەکرد و پسولەکانی بڵاو دەکردەوە– ساڵ بە ساڵ، لەسەر هەمان ڕەوت ڕێی دەکرد، لەبەر ئەوە بە خۆمم گوت: "کارێکی ئەو تۆ دەکەم ئەو فەرمانبەرە کەیفی بە من بێت. بە ڕوونی بدوێم، بۆ ئەوەی وا بکەم ئەو کەیفی بە من بێت، ئەوا دەبێت شتێکی جوان دەرببڕم، نەک دەربارەی خۆم بەڵکو دەربارەی ئەو. بەمەیش لە خۆمم پرسی، "دەبێت چ شتێک لە ئەودا بوونی هەبێت بۆ ئەوەی لە ستایشکردن و پیاهەڵداندا ڕاستگۆ بم؟" هەندێک جار ئەمە پرسیارێکی قورسە، بۆ ئەوەی وەڵامی بدرێتەوە، بە تایبەتیش لەگەڵ کەسانێک، کە نەیانناسی و نامۆن بن، بەڵام لەم حاڵەتەدا، وا ڕێکەوت کە زۆر ئاسان بێت، چونکە دەستبەجێ، شتێکم لەو کابرایەدا بینی، کە بەلامەوە جوان و جێگەی ستایش بوو.

لەبەر ئەوە کاتێک کاغەزەکەی منی لە بەردەستدا بوو، بە هەستێکی پڕ لە جۆشوخرۆشەوە پێم گوت: "چەندم حەز دەکرد، کە پرچی منیش هاوشێوەی تۆ بوایە."

سەری هەڵبڕی و کەمێک ڕاچڵەکی، ڕووخساری بزەی لێ دەباری، بە سادەییەوە گوتی: "باشە، ئێستا ئەوەندەی جاران جوان نییە." دڵنیام کردووە، هەرچەندە هێندەی جاران جوان نەماوە بەڵام هێشتا هەر جوان و قەشەنگە. ئیدی بەم قسەیەی من هەر زۆر خۆشحاڵ بوو،

کەوتینە ناو گفتوگۆیەکی بچکۆلانەوە و، دواشت کە پێی گوتم ئەوە بوو: "زۆر کەس قژی من بە شتێکی جوان دەزانن."

زۆر دڵنیام، کە ئەو ڕۆژە ئەو کابرایە، ڕۆیشت نانی نیوەڕۆ بخوات هەر لە خۆشی و شادیدا خەنی بووە. دڵنیام ئەو شەوە ڕۆیشتووەتەوە و بە خێزانەکەی گوتووە. بێگومانم سەیری ئاوێنەی کردووە و گوتوویەتی: "قژم هەر زۆر جوانە."

جارێکیان ئەم چیرۆکەیەم لەبەردەم جەماوەردا گێڕایەوە و لەدوای ئەوە کابرایەک لێی پرسیم: "مەبەست و ئامانجت لەو قسەیە چی بووە؟"

من چ مەبەست و ئامانجێکم هەبوو و، چیم لەو کابرایە دەویست!!! من چیم لەو کابرایە دەویست!!!

ئەگەر ئێمە ئەوەندە خۆپەرست و ئەنانی بین، لە توانامانادا نەبێت چۆرێک بە ختەوەری و ستایشێکی ڕاستگۆیانە بۆ کەسی بەرانبەر، بەیان بکەین بەبێ ئەوەی چاوەڕێی شتێک بکەیت، بۆ ئەوەی لەبەرانبەر ئەمەدا شتێکت دەست بکەوێت، ئەگەر ڕۆحیشمان لە قەبارەی سێوێک گەورەتر نەبێت، ئەوا بە دڵناییەوە ڕووبەڕووی ئەو شکستە دەبینەوە، کە شیاوی خۆمانە.

ئەها، بەڵێ، شتێکم لەو کابرایە دەویست، شتێکی پڕبەهاو بەنرخم لێی دەویست و بە دەستیشم خست. ئەو هەستەم بە دەست خست، کە من شتێکم بۆ ئەو کابرایە کردووە، بەبێ ئەوەی ئەو بتوانێت شتێک لەبەرانبەردا بۆ من بکات. ئەم ڕووداوە لە بیر و زەینیدا دەمێنێتەوە، تەنانەت لەدوای ئەوەی کە ڕووداوەکەیش گوزەری کرد.

یاسایەکی زۆر گرنگ بوونی هەیە، لەبیر و ڕەفتاری مرۆڤدا، ئەگەر گوێڕایەڵی ئەو یاسایە بکەین، ئەوا هەرگیز دووچاری کێشە نابینەوە. لە ڕاستیدا، ئەگەر پەیڕەوی ئەو یاسایە بکەین، هاوڕێگەلێکی زۆر و

بەختەوەرییەکی هەمیشەییمان بۆ فەراهەم دەهێنێت. بەڵام هەر لەو ساتەی ئەو یاسایە پێشێل دەکەین، ئەوا پێمان دەکەوێتە زەلکاوی کێشەوە.

یاساکەیش ئەمەیە: "هەردەم وا لە کەسی بەرانبەر بکە هەست بە گرنگی بکات. هەر وەکوو پێشتر باسمان کرد، *جۆن دیو* دەڵێت، هەستی حەزکردن بە گرنگی، قووڵترین پاڵنەری سرووشتی مرۆڤە، *ولیەم جەیمز* دەڵێت: 'قووڵترین بنەما لە سروشتی مرۆڤدا، بریتییە لە بەدەستخستنی هەستی گرنگی و، ستایش و پێزانین.'" هەر وەکوو پێشتریش ئەمەم بەرجەستە کردووە، هەر ئەو هەستەیە، کە مرۆڤەکان لە ئاژەڵەکان جیا دەکاتەوە. هەر ئەم هەستەیشە بەرپرسیارە لە بەرقەرارکردنی شارستانییەت.

بۆ ماوەی هەزاران ساڵ، فەیلەسووفەکان سەرنجی ڕێساکانی پەیوەندییە مرۆییەکانییان داوە، لە میانەی تەواوی ئەو وردبوونەیەوەدا، پەرەیان تەنیا بە یەک فەرمانی گرنگ داوە. ئەمەیش شتێکی نوێ نییە، بەڵکو بگرە ئەوەندەی کۆنی مێژوو کۆنە. زۆر ڕاستە، بیستوپێنجهەزار ساڵ لەمەو بەر، ئەمەی فێری شوێنکەوتووانی کردووە. *لیۆتس*، دامەزرێنەری ئایینی تاوی، ئەمەی فێری شوێنکەوتووانی کردووە، لە دۆڵی هان بە ماوەیەکی زۆر لەمەو بەر.

هەروەها، *بوزا*، لەسەر لێواری ڕووباری پیرزۆی گانگز، بە پێنجسەد ساڵ بەر لە مەسیح ئەمەی فێری شوێنکەوتووانی کردووە، کتێبە پیرۆزەکانی هیندۆسی، هەزاران ساڵ لەمەوبەر ئەمەیان تێیدا بەرجەستەکراوە. عیسایش، بە نۆزدە سەدە لەمەو بەر، لەسەر بەرزاییەکانی جودیی ئەمەی فێری شوێنکەوتووانی کردووە. تەواوی ئەو یاسایانەی لە یەک دێڕدا کۆکردووەتەوە، دەشێت گرنگترین

یاسای سەر ڕووی زەوی بێت: "بە جۆرێک مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە، بەو شێوەیەی کە خۆت حەز دەکەی مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت."

دەشێت ڕەزامەندی ئەو کەسانەت بوێت، کە ڕەفتاریان لەگەڵ دەنوێنیت، دەتەوێت سوپاس و پێزانینیان بەرانبەر بەهای ڕاستەقینەی تۆ هەبێت. جۆرە هەستێکت دەوێت، کە لەو جیهانە بچکۆلانەی خۆتدا هەست بە گرنگی بکەیت. ناتەوێت گوێ بۆ ماستاوێکی کەم و بێبایەخ و بێنرخ شل بکەی بەڵکو وێڵی بەدوای سوپاس و ستایشێکی پڕبەهاو واقیعی. تۆ دەتەوێت هاوڕێی و یاریدە دەرەکانت وەکوو ئەوە بن، هەر وەکوو ***چارلز شواب*** دەڵێت: "ڕاستگۆبوون لە وەسفکردن و دەستبڵاوبوون لە ستایش و پێزانیندا." ئێمە هەمووومان ئەوەمان دەوێت.

کەوایە، با پەیڕەوی ئەو یاسا زێڕینە بکەین، بە جۆرێک ڕەفتار و ئەفکار دەگەڵ خەڵک بنوێنین، کە خۆمان دەمانەوێت بەو شێوەیە لەگەڵماندا بجووڵێنەوە.

چۆن؟ کەی؟ لە کوێ؟ وەڵامەکە ئەوەیە: هەموو کاتێک، لە هەموو شوێنێک.

***دەیڤد جی سمیس***ی ئۆو کلێیەر، ویکۆنسن، لە پۆلدا بە قوتابیەکانی ئێمەی گوت، کە چۆن ڕێ لەگەڵ دۆخێکی بچکۆلانەدا بکەن، کاتێک داوامان لێ کرا، بۆ ئەوەی ئەرکی بەرپرسیارییەتی لە ئەستۆ بگرین لە کۆنسێرتی خێرخوازیدا.

"لە شەوی کۆنسێرتەکەدا گەیشتمە پارکەکە و، دوو ئافرەتی بە تەمەنم بینی، لە کەشێکی زۆر خراپدا بوون، لەلای ستاندەکە وەستابوون. هەر بە شێوەیەکی ئاسایی، هەر یەکێک لە ئەوان پێی وا بوو کە ئەوی دیکە بەر پرسە لەو پرۆژەیە. هەر کە لەوێ وەستام و سەرسام بووم بەوەی، کە دەبێت من چی بکەم، یەکێک لە ئەندامانی

لیژنەکە دەرکەوت و بۆکسێکی کاشی پێدا و سوپاسی کردم، بەوەی کە پڕۆژەکە لە ئەستۆ بگرم، **ڕۆز** و **جەینی** وەکوو یارمەتیدەری من پێیان ناساندم و پاشان دەستبەکار بووین.

"بێدەنگییەکی گەورە باڵی کێشا، وا درکیان کرد، کە ئەو بۆکسە پارە ڕەمزی دەسەڵاتە، سندوقەکەم دا بە **ڕۆز** و ئەوەم ڕوون کردەوە، کە دەکرێت توانای ئەوەم نەبێ پارێزگاری لەو پارەیە بکەم و، ئەگەر ئەو چاودێری بکات ئەوا من هەست بە باشتر دەکەم. دواتر، بۆ **جەین** پێشنیارم کرد، کە ڕێ نیشانی دوو هەرزەکارەکە بدات بۆ ساردەمەنییەکە، بۆ ئەوەی ئامێری سۆدەکە بخەنە گەڕ. داوایشم لێی کرد، بۆ ئەوەی بەرپرسیاریەتی ئەو بەشەیەی پڕۆژەکە لە ئەستۆ بگرێت.

"ئەو ئێوارەیە پڕ لە خۆشی و شادی بوو، بە شادمانییەوە لەگەڵ **ڕۆز**دا پارەکەمان دەژمارد و، **جەین**یش سەرپەرشتی هەرزەکارەکانی دەکرد، منیش وەکوو خۆم چێژم لە کۆنسێرتەکە دەبینی."

پێویست ناکات چاوەڕێ بکەیت، بۆ ئەوەی ببی بە نوێنەر لەو وڵاتی فەرەنسا یاخود ببی بە سەرۆکی لیژنەی کڵامبەیکی لۆج، بەر لەوەی فەلسەفەی سوپاس و ستایش بەکار بهێنیت. بەمەوە دەتوانی هەموو ڕۆژێک بە شێوەیەکی نائاسایی کار بکەیت.

بۆ نموونە، ئەگەر گارسۆن پەتاتەیەکی تێکەڵوپێکەڵمان بۆ بهێنیت، لە کاتێکدا داوای پەتاتەی فەرەنسیت کردووە. بابڵێین: "داوای لێبوودن دەکەم، ئەگەر ئەزیەت دەدەم، بەس من حەزم لە پەتاتەی فەرەنسییە." ئەویش دەکرێت بەم شێوەیە وەڵام بداتەوە: "بە هیچ شێوەیەک ئەزیەت نییە." بەمەیش بە خۆشحاڵییەوە دەیانگۆڕێت، ئەمەیش لەبەر ئەوەی، ڕێزمان بەرانبەر بە ئەو بەرجەستە کردووە.

دەستەواژە بچووکەکانی وەکوو، "داوای لێبوردن دەکەم، کە ئەزیەتت دەدەم،" "ئەگەر بەلاتەوە ئەرک نەبێــت؟" "ئەگەر دەکرێــت؟" "ئەگەر بەلاتەوە ئاسـاییە؟" "سوپاسـت دەکەم،" نوانـدی ئەم جـۆرە ڕەفتـارانە بێزاریی و بێتاقەتی لە ژیاندا کەم دەکەن و دەیڕەوێننەوە، لەولایشـەوە دەبێتەوە هۆی بەرهەمهێنای هەستی باش.

بـا نمـوونەیەکی دیـکە بەرجەسـتە بکەیـن، ڕۆمانەکـانی ***مـۆل کەیـن*** مەسـیحییەت، دیمسـتەر، مانکسـمان، ئەوانەی دیکەیشـی هەموویـان پڕفرۆشـترین کتێـب بـوون، لە سـەرەتای بەشـێکی ئەم سـەدەیەدا. ملیۆنان خەڵک ئەوانەی خوێندووەتەوە، هەر ژمارەیەکی زۆری خەڵک. ئەو ڕۆماننووسە، کوڕی ئاسنگەر بوو، زیاتر لە هەشت ساڵی ژیانی لە قوتابخـانەدا بەڕێ نەکـردووە؛ لەگەڵ ئەوەیشـدا، کاتێـک کە کـۆچی دوایی کرد، دەوڵەمەندترین پیاوی ئەدەبی سەردەمی خۆی بوو.

چیرۆکەکە بەم شێوەیەیە: ***مۆل کەین***، حەزی لە غەزل و هەڵبەستی ئەفسانەیی بوو، هەموو شیعرەکانی ***دانتی گابریل ڕۆسێتی*** هۆنینەوە، هەروەهـا تەنـانەت گوتارێکیشـی نووسـی وەکـوو پیاهەڵـدانێک بە دەستکەوتەکانی هونەری ***ڕۆسێتی***، خۆشی ڕێنووسێکی بۆ ***ڕۆسێتی*** نارد، و ئەویش دڵخۆش بوو، ***ڕۆسێتی*** بە خۆی گوت: "ئەگەر لاوێک تێڕوانینی ئەوتۆی دەربارەی توانای من هەیە، ئەوا کەسێکی بلیمەتە."

بەمەیش ***ڕۆسێتی*** کوڕی ئاسنگەری بانگهێشی لەندەن کرد و، وەکوو سکتێری خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرد. ئەمەیش خاڵێکی وەچەرخـان بـوو لە ژیـانی ***مـۆل کەیـن***دا، لەو پـێگەیە نوێیەییـدا، چـاوی بە هونەرمەنـدانی ئەدەبی کەوت، سـوودی لە ئامۆژگـاری ئەوان بینـی و، کەوتە ژێر کـاریگەری هانـدانی ئەوانەوە، پیشـەیەکی گرتە دەسـت، کە ناوی بەرەو پانتایی ئاسمان بەرز کردەوە.

مـاڵەکەی، کۆشـکی گریبـا، لە دوورگەی پیـاودا، بـوو بە مەکـکەی گەشتیاران لەسەرتاپای جیهاندا، ملیۆنان دۆلاریشی بۆ مـایەوە. لەگەڵ

ئەوەیشدا کێ دەزانێت دەکرا هەر بە نەداری مردبایە و کەس هەر نەشی ناسیبایە، ئەگەر گوتارێکی پڕ لە ستایش و پێزانینی بۆ پیاوێکی بەناوبانگ نەنووسیبایە.

هێزێکی لەم شێوەیە، هێزێکی سەرسووڕهێنەر، دڵسۆز، سوپاس و پێزانینێک کە لە قووڵایی ناخەوە سەرچاوەی گرتووە.

***ڕوسێتی*** خۆی بە کەسێکی گرنگ لە قەڵەمدا، ئەمەش شتێکی نامۆ نییە، نزیکەی هەموو کەسێک خۆی بە کەسێکی گرنگ هەژمار دەکات، هەر زۆر گرنگ.

ژیانی چەندین کەس دەکرێت، بگۆڕدرێت ئەگەر کەسێک، هەبێ وایان لێ بکات هەست بە گرنگی بکەن. ***ڕۆناڵد جەی ڕۆلاند*** کە یەکێکە لە مامۆستاکانی پەیمانگەکەمان لە کالیفۆرنیا، هەروەها مامۆستای هوونەر و فەن بووە، دەربارەی قوتابیەکی بە ناوی ***کریس*** نووسی، لە دەسپێکی وانەکەدا:

"***کریس*** یەکێک بوو لە قوتابییە هێمن و شەرمنەکان و باوەڕێکی کەمی بە خۆی هەبوو، ئەو قوتابییە، هەرگیز ئەو سەرنجە بەرەو خۆی کەمەندیش ناکات کە شیاوی بێت. هەروەها وانە بە پۆلێکی پێشکەوتووتر دەڵێم، ئەو قوتابیەیش مافی هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەواندا بێت."

"لە ڕۆژی چوار شەممەدا، ***کریس*** سەرشێتانە خەریکی مێزەکەی بوو، لە ڕاستیدا هەستم کرد، کە شتێکی شاراوە لە ناخی ئەودا بوونی هەیە. داوام لە ***کریس*** کرد، ئەگەر حەز دەکات بێتە پۆلێکی ئاست بەرز و پێشکەوتوو. چەندێک خوازیار بووم، کە وەسفی ڕووخساری ***کریس*** بکەم، هەست و خواستە شەرمنییەکانی کوڕێکی چواردە ساڵان، وا هەوڵ دەدات فرمێسکەکانی بسڕێت."

"کێ؟ من، بەڕێز ***ڕۆلاند***؟ ئایا من ئەوەندە باشم؟"

"بەڵێ، ***کریس***، تۆ زۆر باشیت."

"دەبوایە لەو خاڵەدا وەستابام، چونکە فرمێسکەکان لە چاوەکانمدا جۆگەلەیان بەستبوو، هەر کە ***کریس*** ئەو ڕۆژە لە پۆلەکە ڕۆیشتە دەرەوە، هەر لە خۆشی و شادیدا گەشکەی گرتبوو، بە چاوێکی شینی پڕ گەشاوە سەیری دەکردم و، بە دەنگێکی ئەرێنییەوە گوتی: "سوپاست دەکەم بەڕێز ***ڕۆلاند***."

"***کریس*** وانەیەکی فێر کردم، کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، حەزی قووڵی ئێمە، بۆ ئەوەی هەست بە گرنگی بکەین، یارمەتیدام بۆ ئەوەی هەرگیز ئەو یاسایە لە بیر نەکەم، شتێکم پەخش کرد کە دەڵێت، 'تۆ گرنگی،' ئەمە لەبەردەم پۆلەکەدا هەڵواسرابوو، بۆ ئەوەی هەموو قوتابییەکان ببینن و، بیری منیش بهێنێتەوە، کە هەر تەلەبەیەک کە ڕووبەڕووی دەبمەوە زۆر گرنگە."

ئەمە ڕاستییەکی تاڵە کە هەموو ئەو کەسانەی کە تۆ دەیانبینیت، بە جۆرێک لە جۆرەکان وا هەست دەکەن کە لە تۆ بەرزترن، و ڕێگەیەکی دڵنیاییش بۆ دڵی ئەوان ئەوەیە، کە ڕێگەیان بدەی کە بە جۆرێک لە جۆرەکان تۆ هەست بە گرنگی ئەوان دەکەیت و بە دڵسۆزییەوە ستایش و پێزانیان بکەیت.

لەبیرت بێت کە ***ئیمێرسن*** چی گوتووە: "هەر پیاوێک کە ڕووبەڕووی دەبمەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە من باشترە، لەمەدا لێیەوە فێر دەبم."

ئەو بەشەی کە هەستی بەزەیی دروست دەکات، بریتییە لەوەی کە زۆربەی ئەو کەسانەی، کە کەمترین شایستەبوونیان هەیە بۆ سەرکەوتن، خودی خۆیان لە ڕێگەی شێوازی لە خۆباییبوونەوە بەرەو پێشەوە دەبەن کە لە ڕاستیدا ئەمە شتێکی قێزەون و بێزارکەرە. هەر وەکوو ***شکسپیر*** دەڵێت: "مرۆڤ، مرۆڤی شانازیکەر،

بە دەسەڵاتێکی کەمەوە، لەژێر پانتایی ئەم ئاسمانەوە فروفێڵ دەکات و، دەبێتە هۆی ئەوەی فریشتەکان فرمێسک بڕێژن."

بۆت باس دەکەم، کە چۆن کەسانی بازرگان لە خولەکەی مندا، ئەم بنەمایەیان پەیڕەو کردووە و ئەنجامێکی باشیان بە دەست خستووە.

با لە بازرگانی یەکەمەوە دەست پێ بکەین، پارێزەری کۆنێکتیکەت، کە خۆی حەزی نەکرد لەبەر خزمەکانی ئاماژە بەناوی بکرێت، بە ماوەیەکی کەم لەدوای ئەوەی پەیوەندیی بە خولەکەمەوە کرد، بەڕێز. *ئار* لەگەڵ خێزانەکەیدا بەرەو لۆنگ ئایلەند ڕۆیشت، بۆ ئەوەی سەردانی خزمەکانی بکات، هاوژینەکەی بەجێی هێشت بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ پورە بەتەمەنەکی خێزانیدا بکات و خۆشی بۆی دەرچوو، بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ خزمە لاوەکانی خۆی بکات. هەر زوو دەستی بە قسەکردن کرد دەربارەی ئەو بنەمایانەی کە پەیڕەوی کردبوون لەبەرانبەر ستایشکردندا، لەو باوەڕەدا بوو، کە دەتوانێت شتێک ئەزموون بکات، لە ڕێگەی قسەکردنی لەگەڵ ئەو پیرەژنەدا. بەمەیش چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا، بۆ ئەوەی شتێک بدۆزێتەوە و پێیدا هەڵبدا.

پرسی: "ئەم خانووە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠ دروسکراوە، وا نییە؟"

ئەویش وەڵامی دایەوە؛ "بەڵێ، ڕێکاوڕێک لەو ساڵەدا دروستکراوە."

پیاوەکە گوتی: "ئەو ماڵەم بیر دەخاتەوە کە تێیدا لەدایک بووم، ماڵێکی جوانە، زۆر باش دروستکراوە، دەزانیت لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا، خانووەکان بەم شێوەیە دروست ناکرێن."

خانمە پیرەکە هاوڕابوو، "ڕاست دەکەیت، گەنجەکانی ئەمڕۆ، بایەخ بە خانووی جوان نادەن، ئەوەی کە دەیانەوێت ماڵێکی بچکۆلانەیە و، حەز دەکەن بە ئۆتۆمبێلەکانیان بگەڕێن."

پیـــرەژنەکە ئەم قســـەییەی بە دەنگێکـــی پـــڕ لە مەیـــل و ســـۆزی یادگـــارییەوە کـــرد، "ئەمە خـــانووی خەونەکـــانە، ئەم خـــانووە بە خۆشەویستی بنیاتنراوە، من و مێردەکەم بەر لەوەی دروستی بکەین بە چەندین ساڵ خەونمان پێیەوە بینیووە. بانگی تەلارسازمان نەکرد بۆ دروستکردنی، بەڵکو خۆمان نەخشە و پلانمان بۆیدانا."

خانمەکە بەڕێز *ئاڕی*، بەماڵەکەدا دەگێڕ و ئەویش ئەو شتانەی بەرز دەنرخاند، کە لە گەشتەکانیدا لەگەڵ خۆی هەڵیگرتبوون و بە تەواوی ژیانی چاودێری کردبوو و پاراستبوونی، شاڵ و، تاقمی چای کۆنی ئینگلیـزی و کـوپی سـینی و پـێخەف و کورسـی فەڕەنسـی، تـابلۆ و وێـــنەی ئیتـــاڵی و پـــارچە قوماشـــی فەڕەســـنی کە لە کۆشـــکێدا هەڵواسرابوون.

لەدوای ئەوەی سـەری هەمـوو مـاڵەکەی کرد، پاشـان خـانمەکە بـردیە ناو گەراجەکە، ئۆتۆمبێلێکی نیشاندام نوێ بوو.

خـــانمەکە بە هێواشـــی گـــوتی: "مێـــردەکەم بە مـــاوەیەکی کەم بەر لە مردنـی، ئەم ئۆتـۆمبێلەی بـۆ کـڕیم، لەدوای مەرگی ئەو هەرگیـز لـێم نەخوڕیـووە، تـۆ شـتە باشـەکان بەرز دەنرخێنـی، لەبەر ئەوە مـن ئەم ئۆتۆمبێلە پێشکەش بە تۆ دەکەم."

پیـاوەکە گـوتی: "بـۆچی پـوری، دەتەوێـت مـن شـەرمەزار بکەیـت، بەخشندەیی تۆ بەرز دەنرخێنم، بە دڵنیـاییەوە، بەڵام نـاتوانم هەر ئـاوا بە ئاسـانی ئەوە قبـوڵ بـکەم، تەنـانەت مـن هەر خزمـی تـۆیش نـیم. دانەیەکی نوێم هەیە، تۆش چەندین خزمت هەیە، کە حەز دەکەن ببن بە خاوەنی ئەو ئۆتۆمبێلە،

بەسەرسـوورمانەوە گـوتی: "خـزم! بەڵـێ، جـۆرە خزمـانێکم هەیە کە چـاوەڕێی مەرگی مـن دەکەن تـا ئۆتـۆمبێلەکە، بەدەسـت بهێـنن، بەڵام ناشیـخۆن."

پیاوەکە گوتی: "ئەگەر حەز ناکەی بیدەیت بە ئەوان، ئەوا دەتوانی بیفرۆشیت."

هاواری کرد: "بیفرشم! پێت وایە ئەو ئۆتۆمبێلە دەفرۆشم؟ ئایا پێتوایە هەر وا ڕێگە دەدەم کەسێکی نەناسرا، ئەو ئۆتۆمبێلە بەسەر شەقامەکاندا لێ بخورێت، ئەو ئۆتۆمبێلەی کە مێردەکەم بۆی کڕیووم؟ هەرگیز خەونم بە فرۆشتنیەوە نەبینیووە، من نیازم وایە پێشکەش بە تۆی بکەم. تۆ ڕێز لە شتی جوان دەگریت."

هەوڵی دا خۆی دەرباز بکات، لە وەرگرتنی ئۆتۆمبێلەکە، بەڵام نەیدەتوانی بەبێ بریندارکردنی هەستی ژنەکە ئەو کارە بکات.

ئەم خانمە، کە لە ماڵێکی گەورەدا، لەگەڵ یادەوەرییەکانی بەجێ مابوو، برسی کەمێک سوپاس و پێزانین بوو. ڕۆژگارانێک لاو بووە و جوانبووە و چەندین داواکاری هەبووە. ڕۆژگارانێک ماڵێکی بە هەستێکی پڕ لە خۆشەویستی دروست کردووە و شتی لە سەرتاپای ئەورووپادا کۆردووەتەوە، بۆ ئەوەی جوانییان پێ ببەخشێت.

ئێستایش، لە تەمەنێکی پیری، پڕ لە تەنیاییدا، پێویستی بە کەمێک گەرموگوڕی مرۆڤ بوو، سوپاس و پێزانین و ستایشێکی بلیمەتانە، هیچ کەسێک ئەمەی بۆ بەیان نەکردبوو. کاتێک هەستی بە سوپاس و پێزانین کرد، وەکوو کانییەک وا بوو لە بیاباندا، نەیدەتوانی ئەو خۆشی و شادییەی بە هیچ شتێک بەیان بکات، تەنیا ئەوە نەبێت، کە ئۆتۆمبێلێک بکات بە دیاری.

با سەیری نموونەیەکی دیکە بکەین: *دۆناڵد ئێم. مکماهۆن* کە بەڕێوەبەری لویس و، ڤالانتاین و خاوەن کێڵگەی کشتوکاڵی و تەلارسازبوو لە ڕیی نیو یۆرکدا، بەم شێوەیە ڕووداوەی خۆیمان بۆ بەیان دەکات:

"بەماوەیەکی کەم لەدوای ئەوەی بەشداریم لە خولی 'چۆن هاوڕێ پەیدا دەکەیت و دەچییە دڵی خەڵکەوە' کرد، دیزانی خانوویەکم دەکرد بۆ دادوەرێکی بەناوبانگ، خاوەنەکەی لەماڵەکەدا سەری وەدەرنا، بۆ ئەوەی زانیاری پێ بدات دەربارەی گوڵی ئەزەلیا و ڕۆدێندرۆن، کە خوازیارە بیانچێنێت."

گوتم: "دادوەر، تۆ خولیایەکی ڕەنگینت هەیە، زۆر سەرسامم بە سەگە جوانەکانت، لەوەیش تێدەگەم کە هەموو ساڵێک شریتی شین بە دەست دەهێنیت، کە لە مەیدانی مادیسۆن گاردن بەڕێوەدەچێت."

"ئەم ستایشکردنە جێگەی خۆی گرت."

دادوەر وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، خۆشی و شادیەکی زۆر لە سەگەکانم بە دەست دەخەم، حەز ناکەیت کولانەکەیان ببینیت؟"

"نزیکەی یەک کاتژمێری پێچوو، هەتا وەکوو سەگەکانی نیشاندام و، ئەو دیاریانەی کە بردبوویەوە، تەنانت بنەچەشیان هەبوون و خەتە سوورەکانی بۆ ڕوون دەکردمەوە، کە زیرەکی و جوانی سەگەکەیان نیشان دەدا."

لەکۆتاییدا، ڕووی لە من کردوو و، پرسی: "منداڵی بچووکت هەیە؟"

منیش وەڵامم دایەوە: "بەڵێ، هەمە، کوڕێکم هەیە."

دادوەرەکە پرسی: "زۆر باشە، حەزی لە توڵە سەگ نییە؟"

"ئاهـ بەڵێ، هەر زۆر حەزی لێیە."

دادوەرەکە گوتی: "زۆر باشە، دانەیەکی دەدەمێ."

"دەستی کرد بەوەی، کە پێم بڵێت چۆن خواردن بە توڵە سەگەکە بدەم،" پاشان وەستا "ئەگەر پێت بڵێم لە بیری دەکەیت، دەبێت بۆت بنووسم." لەبەر ئەوە دادوەرەکە ڕۆیشتە ماڵەوە، تەواوی زانیارییەکانی نووسی، بە چەندین دۆلارەوە توڵەسەگەکەی پێشکەش

کردم و، کاتژمێرێک و پازده خوولەک لە کاتی پڕ بەنرخی خۆی پێدام، چونکە من پێزانین و ستایشێکی ڕاستگۆیانەم بەرجەستە کردبوو، بۆ خولیاکەی و دەستکەوتەکانی."

***جۆرج ئیستمان***ی کۆداکی بەناوبانگ، فیلمێکی دەرهێنا کەوێنەی جووڵاوی تێدابوو، بڕی ملیۆنان دۆلاری کۆ کردەوە، بوو بە یەکێک لە دەڵەمەندترین بازرگانەکان لە سەر ڕووی زەویدا. هێشتا سەرباری هەموو ئەو دەستکەوت و کامەرانییانە، کەچی هێندی من و تۆ حەزی بە پێزانین و ستایش کرد و سوپاسکردن بوو.

بۆ ئەوەی کورتی بکەمەوە، کاتێک ***ئیستمان***، بینای قوتابخانەی ئیسمانی میوزیکی و هۆڵی کیبۆرن بوو لە ڕۆچێستەر، ***جەیمز ئادەمسۆن*** سەرۆکی کۆمپانیای سوپەریەر سیتینگ لە نیو یۆرکدا، هەولی دا فرمانی دابینکردنی کورسییەکانی ئەم بینایانە بەدەست بخات، پەیوەندیی بە تەلارسازەوە کرد، بەڕێز ***ئادەمسۆن*** وادەیەکی لێوەرگرت، بۆ ئەوەی بەڕێز ***ئیستمان*** ببینێت لە ڕۆچێستەر.

کاتێک ***ئادەمسۆن*** گەیشت، تەلارسازەکە گوتی: "دەزانم تۆ دەتەوێت ئەو فرمانە بەدەست بخەیت، بەڵام لە ئێستاوە دەتوانم پێت بڵێم، کە تۆ ناتوانیت زیاتر لە پێنج خولەک لە کاتی ***جۆرج ئیستمان*** بگریت، چونکە ئەو زۆر بە پلان و سەرقاڵە. لەبەر ئەوە مەبەستەکەت بە خێرایی ڕوون بکەوە و لێرە بڕۆ دەرەوە."

***ئادەمسۆن*** ئامادە بوو بۆ ئەوەی، وا بکات.

کاتێک ڕێگەی پێدرا، بۆ ئەوەی بچێتە ژوورەوە، بەڕێز ***ئیستمان***ی بینی، کە بەسەر دنیایەک کاغەزدا لەسەر مێزەکەدا شۆڕببویەوە. بە شێوەیەکی ئاسایی، بەڕێز ***ئیستمان*** سەری هەڵبڕی و چاویلکەکانی لە چاوی لادان و بەرەو ئەندازیارەکە ڕێی کرد و ، بەڕێز ***ئادەمسۆن*** دەیگوت: "بەیانییتان باش بەڕێزان، دەتوانم چ کارێکتان بۆ بکەم؟"

خانووسازەکە بەڕێز ***ئادەمسۆن***ی بە ئەوان ناساند، پاشان ***ئادەمسۆن*** گـوتی: "لەو کـاتەی چـاوەڕوانیم دەکردیـت بەڕێـز ***ئیسـتمان***، بە نووسـینگەکەی تۆمـدا هەڵا دەگـوت، بەلامەوە ئاسـاییە ئەگەر خـۆم لە ژوورێکی لەم شێوەیەدا کار بکەم، بایەخم بە کارەکەیی خـۆم دەدا و، وەلێ لە ژیانمدا ژوورێکی لەم شێوەیە جوانم نەبووە."

***جـۆرج ئیسـتیمان*** وەلامـی دایەوە: "شـتێکت بیـر هێنـامەوە، کە هەر خەریـک بـوو لە بیـرم دەچـوویەوە، جـوانە، وا نیـیە؟ کاتێـک سـەرەتا دروسـت کـرا، زۆرم چێـژ لێـی دەبینـی، بەڵام ئێسـتا بە ئەنـدازەیەک سـەرقاڵ بـووم، کە جـاری وا هەیە بە هەفـتە چـاوم بەم نووسـینگەکە ناکەوێت."

***ئادەمسـۆن*** بە ژوورەکەدا گەڕا و، پاشـان دەسـتی بەسـەر مێـزەکەدا هێنا، "ئەمە بەڕووی ئینگلیزییە، وا نییە؟ کەمێک لە ڕووی پێکهاتەوە لە بەڕووی ئیتاڵی جیاوازە."

***ئیستمان*** وەلامـی دایەوە؛ "بەڵـێ، بەڕووی ئینگلیـزییە و هـاوردەکراوە، هاوڕێیەکم کە دارناسێکی پسپۆڕە بۆی هەڵبژاردووم."

لەدواییـدا، ***ئیسـمان*** ژوورەکەی نیشـاندا و، دەربـارەی بەشـەکانی ژوورەکە، ڕەنگەکـان، هەڵکـۆڵینە دەسـتکردەکان و، تەواوی شـتەکانی دیکە، کە لە پلان و جێبەجێکردنی ژوورەکە یارمەتیدەربوون.

لە کاتێکی گەڕان، لە ژوورەکەدا و، سەیریکردنی کەلوپەلە دارینەکان، لەبەردەم پەنجەرەیەک وەستان، ***جۆرج ئیستیمان*** بەو پەڕی خاکییەوە و، بە شێوەیەکی نەرمونیان، ئاماژەی بەو دامەزراوانە کرد، کە لەپێناو مرۆڤایەتییدا دروسـتی کردبـوون: زانکـۆی ڕۆچسـتەر، نەخۆشـخانەی گشـتی، نەخۆشـخانەی چارەسـەرکردن، خـانەی هـاوڕێیەتی و نەخۆشـخانەی منـدالان. ***ئادەمسـۆن*** زۆر بە گەرمـی دەستخۆشـی لـێ کرد لەبەرانبەر ئەو شێوازە نموونیەدا، کە پارە و پولی بەکار دەهێنێت

بۆ ئەوەی ئازارەکانی مرۆڤایەتی کەم بکاتەوە. لەدوای ئەوە، ***جۆرج ئیستمان*** سندوقێکی شووشەیی کردەوە و کامێرایەکی هێنایە دەرەوە، داهێنانێک کە لە پیاوێکی ئینگلیزی کڕیبوو.

***ئادەمسۆن*** پرسیاری دەربارەی هەوڵەکانی، بەر دەست بەکاربوونی لە کاری بازرگانی لێ کرد، بەڕێز ***ئیستمان***-یش هەر زۆر ڕاستگۆیانە باسی سەردەمی هەژاری و نەداری منداڵی خۆی بۆ دەکرد، باسی ئەوەیشی کرد، کە دایکە بێوەژنەکەی، میوانخانەیەکی شەو و ڕۆژیی دروست کردبوو، ئەویش وەکوو کاتب لە نووسینگەی بیمەدا کاری دەکرد.

ترسی هەژاریی و نەداری بە شەو و ڕۆژ باڵی بەسەر گیانیدا کێشابوو، کەچی بڕیاریدا، کە دەست بە پەیداکردنی پارە بکات و ڕێگە نەدات دایکی پێویستی بە کارکردن بێت. بەڕێز ***ئادەمسۆن*** پەلێکشی کرد بۆ ئەوەی پرسیاری زیاتری لێ بکات و، گوێی شل کردبوو، کاتێک ئاماژەی بە چیرۆکی ئەزموونی خۆی دەکرد، لە جیهانی وێنەگرتندا، ئاماژەی بەوە کرد، کە چۆن بە درێژایی ڕۆژ سەرقاڵی کارکردن بووە لە نووسینگەکەیدا و، شەوانەیش تاقیکردنەوەکانی دەکات، ناوەناوەیش سەرەخەوێکی دەشکاند تا ماددە کیمیاییەکان کارێکیان دەکرد.

***جەیمز ئادمسۆن***، کاتژمێر دە و چارێک ڕۆیشتە نووسینگەکەی ***ئیستمان***ەوە و ئاگادار کرابوویەوە کە دەتوانێت تەنیا پێنج خولەک بمێنێتەوە، بەڵام وا یەک کاتژمێری ڕەبەق ڕێی کردووە، دووی دیکەیش گوزەریان کرد، کەچی هێشتا هەر قسەیان دەکرد.

لە کۆتاییدا، ***جۆرج ئیستمان***، ڕووی لە ***ئادەمسۆن*** کردوو و، گوتی: "دواجار، کە لە ژاپۆن بووم، هەندێک کورسیم کڕین و، هێنامنە ماڵەوە، لەبەر هەیوانی خۆردا دامنان. بەڵام تیشکی خۆر ڕەنگەکانی کاڵ کردبوویەوە، لەبەر ئەوە ئەو ڕۆژە ڕۆیشتم بۆ بازار و بۆیاخم

کڕی و ڕەنگمکردنەوە. حەز دەکەی ئەو کارەی کە کردوومە ببینی؟ زۆر باشە، لەگەڵ من وەرەوە ماڵەوە و، خوانی نیوەڕۆ لەگەڵ من بخۆ و، کورسییەکانیشت نیشان دەدەم."

لەدوای نانی نیوەڕۆ، بەڕێز ***ئیستمان*** ئەو کورسییانەی کە لە ژاپۆن کڕیبوونی نیشانی ***ئادەمسۆن***‌یدان، نرخی ئەو کورسییانە تەنیا لە چەند دۆلارێک تێپەڕی نەدەکرد، بەلام ***جۆرج ئیستمان*** ئێستا ملیۆنلەرە، شانازی بەو کورسییانەوە دەکرد، چونکە خۆی ئەو کورسییانەی ڕەنگ کردبوو.

نرخی جێگەکان دەگەیشتە نەوەدهەزار دۆلار، پێت وایە کێ ئەو تەندەرەی بۆ دەرچووە ***جەیمز ئادەمسۆن*** یاخود یەکێک لەو پێشبڕکێکارانە؟

لە ساتەوەختی ئەم چیرۆکەوە، هەتا وەکوو مەرگی بەڕێز ***ئیستمان*** ئەو و، ***جەیمز ئادەمسۆن*** بوون بە هاوڕێی گیانیبەگیانی.

***کلۆد ماریس*** خاوەن ڕێستورانی ڕۆین، لە فەڕەنسادا ئەم بنەماییەی بەکار دەهێنا و خواردنەگەکەی لە دەستی کارمەندی کاتی پاراست. ئەم ئافرەتە بۆ ماوەی پێنج ساڵ ئەمەی بەکار دەهێنا و پەیوەندییەکی پڕبایەخی هەبوو لە نێوان ئێم ماریس و ستافە بیستویەک کەسییەکەی. هەر سەرسام بوو، بەوەی کە ئەو کابرایە وازی لەو کارە هێناو بوو.

***ئێم ماریس*** گوتی: "هەر زۆر سەرسام بووم و بگرە زیاتر بێئوومێدتر بووم، چونکە من لە ژێر ئاستی ئەو کارتێکردنەدا بووم، کە بەرانبەر بە ئەو دادپەروەبووم و پێداویستییەکانی ئەوم قبوڵ کردووە. لە کاتێکدا ئەو هەم هاوڕێ هەم کارمەندی خۆم بووە، زۆر جار ڕێزم لێی گرتووە و دەشێت زیاتر لە کارمەندەکانی دیکە ڕووم بەلای ئەودا کراوە بووبێت."

"بە دڵنیاییەوە، ناتوانم ئەم دەست لە کار کێشانەوەیە بەبێ هیچ ڕوونکردنەوەیەک قبوڵ بکەم. ئیتر بردمە پەنایەک و گوتم: '*پۆڵت* تۆ دەبێت لەوە تێبگەیت، کە من هەروا ناتوانم ئەو دەست لەکارکێشانەیەوە قبوڵ بکەم، تۆ بۆ من و، بۆ ئەم کۆمپانیایە کەسێکی تایبەتی، تۆیش ئەوەندی من، بۆ سەرکەوتنی ئەم خواردنگە، گرنگیت.' ئەمەم لەبەردەم تەواوی ستافی خواردنگەکە دووبارە کردەوە، و بۆ ماڵەکەی خۆمم بانگهێشت کرد و باوەڕبەخۆبوونی خۆمم بەرانبەر بە ئەو دووبارە کردەوە، بە ئامادەبوونی خێزانەکەم.

"*پۆڵت*، لە دەست لە کارکێشانەوەکەی پەشیمان بوویەوە و، ئەوڕۆ بە جۆرێک دەتوانم پشتی پێ ببەستم کە جاران بەو شێوەیە نەبوو. زووزوویش هەستی پێزانین و ستایشم دووبارە دەکردەوە، لەبەرانبەر هەر کارێک کە ئەو دەیکرد و، نیشانم دەدا کە ئەو چەندێک بۆ من و خواردنگەکە گرنگە."

*دسرایل* یەکێک لە زیرەکترین ئەو کەسانەی، کە فەرمانڕەوای ئیمراتۆریەتی بەریتانیای کردووە، دەڵێت: "قسە دەربارەی خودی خەڵک خۆیان بکە، قسە دەربارەی خودی خەڵک خۆیان بکە و، ئەوانیش بۆ چەندین کاتژمێر گوێ دەگرن."

**"وا لە کەسی بەرانبەرت بکە،**

**هەست بە گرنگی بکات، و**

**ئەوەیش بە دڵسۆزی بکە."**

# بەشی سێیەم

## ڕێگاکانی کێشکردنی خەڵک، بەرەو ئەدای بیرکردنەوەی خۆت

***دەیل کارنگی*** دەڵێت: "زۆربەی مرۆڤەکان... ئەو توانایەیان نییە، بۆ ئەوەی دەست لەناو دەست بە قووڵایی بیر و باوەڕەکاندا شۆڕ ببنەوە."

لە میانەی بەرەوپێشبردنی، ئەم توانایە، کە نهێنییەک خۆی تێدا مەڵاسداوە، ئەوەیە کە تۆ فێر بیت: "چۆن خەڵک کێش دەکەیت، بەرەو ئەدای بیرکردنەوەی خۆت و گیانێکی پڕ لە هاوکاری گەرم بەدەست دەخەیت."

## ڕێگای یەکەم:

## ڕێگایەکی دڵنیایی بۆ دروستکردنی نەیار و چۆنیش خۆت لەو ڕێگایە بەدوور دەگریت

کاتێک سیدۆر ریسفێلت، لە کۆشکی سپیدا بوو، دانی بە ئەوەدانا ئەگەر بتوانێت لە ٧٥٪ی ڕاستی بپێکێت ئەوا ئەوپەڕی پێشبینییەکانی بەدەست خستووە.

ئەگەر ئەو ڕێژەیە، ئەو پەڕی هیوایەتی پیاوێکی بەناوبانگ بێت، لە سەدەی بیستەمدا، بۆ ئەوەی بەدەستی بهێنێت، ئەی دەبێت من و تۆ چۆن بین؟

ئەگەر دڵنیا بیت، لەوەی کە سەدا پەنجاوپێنج ڕاست و دروست بیت، ئەوا دەتوانی بچییە شەقامی واڵ و، ڕۆژانە یەک ملیۆن دۆلار پەیدا بکەیت، خۆ ئەگەر ناتوانیت بەو ئەندازەیەیش دڵنیا بیت، کە ئەوەندە ڕاست و دروستیت، ئەی کەوایە بۆچی بە خەڵکی دیکە دەڵێی کە ئەوان هەڵەن و ڕاست نین؟

دەتوانیت لە ڕێگەی سەیرکردنەوە، ئاوازی دەنگەوە یاخود ئاماژەوە بە کەسێک بڵێی، کە هەڵەیە هەروەکو دەتوانی لە ڕێگەی وشەوە پێی بڵێی، کە هەڵەیە – دەتەوێت پێی بڵێی، هەڵەیە و، دەشتەوێت لە هەمان کاتدا لەگەڵ تۆ هاوڕێ بێت؟ هەرگیز شتی وا نابێت! لەبەر ئەوەی تۆ گورزێکت لە زیرەکی و بڕیاردان و هەستی شانازی و ڕێزی ئەوت داوە، بەمەیش ئەویش دەیەوێت هەمان شت، بەرانبەر بە تۆ بکاتەوە، بەڵام ئەم گورزە هەرگیز، وا لە ئەو ناکات تیڕوانین و بیری ئەو گۆڕانکاری بەسەردا بێت. دەکرێت تەواوی فەلسەفەی ئەفلاتوون و ئیمانویل کانتی بگری و بەڕووی دا واڵا بکەیت، بەڵام

هێشتا تێڕوانین و دیدگەی ئەو ناگۆڕێ، چونکە تۆ ئازاری هەستەکانی ئەوت داوە.

هەگیز مەڵێ کە من "ئەمە و ئەوە بۆ تۆ چارەسەر دەکەم." ئەمە شتێکی خراپە، چونکە وەکوو ئەوە وایە بڵێی: "من لە تۆ زیرەکترم، یەک دوو شت دەڵێم و، بیر و هزری تۆ دەگۆڕم."

ئەمە بەرەنگارییە، هەستی تووڕەی فەراهەم دەهێنێت و، وا لە کەسی گوێگر دەکات، لەگەڵ تۆدا بکەوێتە جەنگەوە هەر بەر لەوەی تۆ دەست پێ بکەیت. ئەمە سەختە، جا لەژێر هەر بارودۆخێکدا بێت هەوڵی گۆڕینی تێڕوانینی خەڵکی دیکە بدەیت. ئێ کەوایە بۆچی تۆ قورستری دەکەیت؟ بۆچی دۆزەکە ئاڵۆز دەکەیی و، کۆسپ بە ڕووی خۆتدا والا دەکەیت؟

ئەگەر دەتەوێت هەر شتێک بسەلمێنیت، ئەوا ڕێگە بە کەسانی دیکە مەدە پێی بزانن، زۆر بە لێزانی و لەسەر خۆییەوە بیکە، بە جۆرێک کە هەر کەس نەزانێت تۆ ئەوەیش دەکەیت، ***ئەلیکساندە پۆپ*** ئەمەی بە کوتی و پوختی دەربڕیووە:

"پێویستە خەڵک بە شێوازێک فێر بکەیت، وەکوو بڵیی ئەوە تۆ نەبوویت شتە نادیارەکانت پێشنیار کردووە وەکوو ئەوەی لە بیر کرابن."

زیاتر لە سێسەد ساڵ لەمەوبەر ***گالیلۆ*** گوتوویەتی:

"ناتوانیت هیچ شتێک فێری مرۆڤ بکەیت، بەڵکو تەنیا دەتوانیت یارمەتی بدەیت و لە ناخی خۆیدا پێ بزانێت و بیدۆزێتەوە."

هەر وەکوو ***لۆرد چێستەرفیلد***، بە کوڕەکەی دەڵێت: "ئەگەر دەتوانیت لە خەڵکی دیکە داناتر بە، بەڵام پێشیان مەڵێ، کە لە ئەوان داناتریت."

بە بەردەوامی سوکرات لە ئەسینا بە شوێنکەوتووانی دەگوت: "تاکە شتێک کە من دەیزانم، ئەوەیە کە من هیچ شتێک نازانم."

باشە، ناتوانم خوازیاری ئەوە بم، کە لە سوکرات داناتر بم، ئیتر وازم لەوە هێنا، کە بە خەڵک بڵێم ئێوە هەڵەن. درکیشم بەوە کردووە، کە وازهێنانیشم سوودی هەبووە.

ئەگەر کەسێک قسەیەک دەکات و، تۆش پێت وایە هەڵەیە –بەڵێ، تەنانەت ئەگەر پێشت هەڵە بێت– لەمە باشتر نییە، ئەگەر بڵێی: "باشە، ئێستا سەیر بکە، منیش تێڕوانینێکم هەیە، بەس دەکرێت هەڵە بم، خۆ ئەگەر هەڵەیش بکەم، ئەوا دەمەوێت ڕاستی بکەمەوە، لەبەر ئەوە با سەرنجی ڕاستییەکان بدەین."

لێرەدا جادوویەک بوونی هەیە، جادوویەکی ئەرێنی، وەکوو لەم دەستەواژانەدایە: "دەکرێت هەڵە بم، جاروبار هەڵەم، با سەرنجی ڕاستییەکان بدەین."

لە ئاسمان و زەویدا کەسێک بوونی نییە، کە ڕێگری قسەیەکی ئاوات لێ بکات: "دەکرێت هەڵە بم، با سەرنجی ڕاستییەکان بدەین."

یەکێک لە قوتابیانی پۆلەکەم، کە ئەو شێوازەی لەگەڵ کڕیارەکانی بەکار هێنا، ***هارۆلد ڕێنکی*** بوو، مامەڵەکاری دۆج لە بیلینگز، مۆنتانا. ئەمەی لەبەر ئەو پەستانەی لەسەر بازرگانی ئۆتۆمبێل هەبوو، بەرجەستەی کرد، کەسێکی دڵڕەق و توند بوو، لە میانەی مامەڵەکردنی لەگەڵ گلەی و گازندەی کڕیارەکاندا. ئەمەیش گڕی تووڕەی و کەمبوونەوەی کار و بە گشتی ناخۆشی لێ دەکەوێتەوە.

بە قوتابییەکانی گوت: "درککردن بەوەی کە هەمە، من بە هیچ شوێنێک ناگەیەنێت، هەوڵی تاقیکردنەوەی ڕێگایەکی نوێم دا، شتێکی لەم شێوەیە دەڵێم: 'مامەڵەکردنی ئێمە هەڵەیەکی ئەوەندە زۆری لێ

کەوتـــووەتەوە، کە هەر شـــەرم لە خـــۆم دەکەم، لەو دۆزەی تـــۆدا هەڵەمان کردووە و دەربارەی ئەوە بۆم بدوێت.'"

"ئەم شێوازە پێویستی بە هیچ جۆرە چەک و ئەسڵەحەیەک نابێت، ئەو کاتەی کە کڕیار هەستەکانی ئازاد دەکات، ئەوا زیاتر شتێکی مەعقول دەبێت، کاتێک مەسەلەکە دێتە سەر کێشەکە. لە ڕاستیدا، هەزاران کڕیار سوپاسی منیان کردووە، بۆ هەبوونی بیرۆکە و دیدگایەکی لەو شێوەیە تێگەیشتوو. تەنانەت دوو لەوانە هاوڕێی نوێیان هێناوە، بۆ ئەوەی بێن و ئۆتۆمبێل لە من بکڕن. لەم کەشە پڕ لە پێشبڕکێیەدا، زیاتر پێویستمان بە کڕیاری لەم شێوەیە، لەو باوەڕەدام نیشاندانی ڕێز بەرانبەر بە تێڕوانین و دیدگای هەموو کڕیارەکان و مامەڵەکردن لەگەڵیاندا بە شێوەیەکی دیبلۆماسی و ڕێزەوە یارمەتیدەر دەبێت، بۆ ئەوەی پێشبڕکێیەکە بەریەوە."

هەرگیز دووچاری کێشە و نارەحەتی نابیەوە، بە قبوڵکردنی ئەوەی کە دەکرێت تۆ هەڵە بیت. ئەمەیش هەموو مشتومڕێک دەوەستێنێت و، وا لە ڕکابەرەکەت دەکات، بۆ ئەوەی ئەوەندەی تۆ دادگەر و، کراوە و بیرکراوە بێت. وای لێ دەکات کە ئەویش، ئەوە قبوڵ بکات کە دەکرێت ئەویش هەڵە بێت.

ئەگەر تۆ، بە شێوەیەکی ئەرێنییانە دەزانیت، کە کەسێک هەڵەیە، ئەوا ڕاشـــکاوانە پێـــی دەڵێـــی کە هەڵەیە، ئـــێ چـــی ڕوو دەدات؟ بـــا بە نموونەیەک بۆتی ڕوون بکەمەوە:

بەڕێز *ئێیس* پارێزەرێکی لاوی نیو یۆرکە، جارێکیان گفتوگۆی دۆزێکی گرنگـی کـرد، لەبەردەم دادگـای بـاڵای نەتەوە یەکگرتووەکـان. ئەم دۆزەیە دەربارەی بڕێک پارە و، پرسیارێکی گرنگ بوو دەربارەی یاسا. لە ماوەی مشتومڕەکەدا، یەکێک لە دادوەرانی باڵای دادگا پێی گوت: "ماوەی دەستوور تەنیا شەش ساڵە، وا نییە؟"

بەڕێز ئێیس وەستا، بۆ خولەکێک چاوی لە دادوەر بڕیبوو، پاشان کتومت گوتی: "دادەوەری خاوەنشکۆ، لە دەستووردا، هیچ ماوەیەک بوونی نییە."

بەڕێز ئێیس بەم شێوەیە ناوزەندی دۆخەکەی کرد، "بێدەنگییەک باڵی بەسەر دادگادا کێشا، پلەی گەرمایی ژوورەکەیش دابەزی بەرەو سفر. من ڕاست و دروست بووم، دادوەرەکەیش هەڵە بوو. ئەوەیشم پێی گوت. بەڵام ئایا ئەم کارەم وای کرد هیچ لە دادوەر نزیک ببمەوە؟ نەخێر. هێشتا لەو باوەڕەدام، کە یاسا پشتگیری منی دەکرد، دەیشزانم کە باشتر لە جاران قسەم دەکرد، بەڵام نەیشم توانی ئەو قایل بکەم. هەڵەیەکی زۆر گەورەم کرد، کە بە پیاوێکی ڕۆشنبیر و بەناوبانگم گوت، کە پێی کەوتووەتە چاڵی هەڵەوە."

تەنیا هەندێک لە مرۆڤەکان، کەسانێکی لۆژیکین، زۆرێک لە ئێمە قین لە دڵین و کوڵەوارین. زۆرێک لە ئێمە، هەگبەمان پڕ بووە لە هەستی ئیرەی، گومان، ترس، چاوتێبڕین و غرورییەت. زۆربەی هاوڵاتیان، نایانەوێت بیروباوەڕیان بگۆڕن دەربارەی ئایین یاخود قژچاکردن، کۆمەنیزم یانیش دەربارەی ئەستێرەی دڵخوازیان لە فیلمەکاندا. کەوایە، ئەگەر تۆ ڕێگە بە خۆت دەدەیت بە خەڵک بڵێی هەڵەن، ئەوا ئەم چەند دێڕەی خوارەوە هەموو بەرەبەیانییەک بخوێنەوە بەر لە نانی بەیانی، ***جەیمز هارڤی ڕۆبنسۆن*** لە کتێبی "بیر و هزر لەژێر باری بڕیارداندا" دەڵێت:

"ئێمە هەندێک جار بیروهزرمان دەگۆڕین، بەبێ بوونی هیچ بەرهەڵستییەک یان هەبوونی هیچ هەست و سۆزێکی سەخت بەسەرمانەوە، بەڵام هەر کە پێمان گوترا، هەڵەیەن، ئەوا ئێمە جارس دەبین و دڵمان دەکەین بە بەرد. لە باری ئاساییدا، هیچ گرنگی بە پێکەوەنانی باوەڕەکانمان نادەین، بەڵام کاتێک کەسێک بیەوێت لێمان قەدەغە بکات ئەوا ناخمان پڕ دەبێت لە تورەی، ئەمەیش ڕوونە کە

بیروباوەڕەکان، خۆییان نین لای ئێمە ئازیز بن بەڵام لەم ڕێگەوە ڕێز و حورمەتی ئێمە دەکەوێتە ژێربارەی هەڕەشەوە، وشەیەکی بچووکی وەکوو "من" گرنگترین وشەیە لە کاروبارەکانی مرۆڤایەتیدا، مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم وشەیەیشدا بە شێوەیەکی شیاو دەسپێکی داناییە."

هەمان هێزی هەیە چا "خوانی ئێوەی من" بێت، "سەگەکەم بێت،" "ماڵەکەم بێت" یاخود "باوکم بێت،" "وڵاتەکەم بێت" یانیش "خودای خۆم" بێت. تەنیا بەوە جارس نابین، کە کاتژمێرەکەمان هەڵە بێت یاخود ئۆتۆمبێلەکەمان شڕ و خراپ بێت، بەڵام چەمکی ئێمە دەربارەی هەسارەی مەریخ، لە دەربڕینی وشەی "ئێپکتیس"ی چاسەرەی بەهاداری سالیسن یاخود ئایا ڕێکەوتی سارجۆنی یەکەم شتێکە، بۆ ئەوەی پێداچوونەوەی بۆ بکرێت.

حەز دەکەین بەردەوام بین، بە باوەڕکردن بەو شتانەی، کە وەکوو ڕاستی لەلای خۆمان قبوڵمان کردوون، ئەو جارس بوونەیش، کە بە هۆی گومانکردن دەربارەی ڕاستییەکان لامان گەڵاڵە دەبێت، پاڵمان دەنێت بۆ ئەوەی بیانووگەلێک بدۆزینەوە، بۆ ئەوەی پێیانەوە پابەند بین. لە ئەنجامی ئەمەیشدا، زۆرێک لە هۆکار و پاساوەکانمان پێداگری لەسەر ئەو مشتومڕانە دەکەن، کە پێشتر باوەڕمان پێ بوون.

*کارل ڕۆجەرس*، پزیشکی دەروونی شکۆمەند، لە کتێبەکەیدا بە ناوی "مرۆڤبوون"دا دەڵێت:

بەهایەکی زۆر بۆ خۆم فەراهەم دەهێنم بەوەی، کە ڕێگە بە خۆم دەدەم، بۆ ئەوەی لە کەسی بەرانبەر تێبگەم، بەو شێوەیەی کە کارم لەسەر ئەم دەربڕینە کردووە، دەکرێت بە شێوەیەکی نامۆ دەربکەوێت، لە دیدگای تۆوە، ئایا شتێکی پێویستە، بۆ ئەوەی کەسێک ڕێگە بە خۆی بدات بۆ ئەوەی لە کەسی بەرانبەر تێبگات؟ من پێم وایە، کە پێویستە، یەکەمین کاردانەوەی ئێمە بۆ زۆرێک لە

دەربڕینەکان "کە لە کەسی بەرانبەرەوە گوێ بیستیان دەبین" ئەوا هەڵسەنگاندنێکن یاخود بڕیارن بەسەر ئێمەوە، وەکوو لەوەی تێگەیشتبین لێی.

کاتێک کەسێک هەستێک، تێڕوانینێک یاخود بیروباوەڕێک دەردەبڕێت، ئەوا دەستبەجێ مەیلی ئێمە بەم جۆرە دەبێت، "ئەوە ڕاستە" یاخود "ئەوە شتێکی گەمژانەیە،" "ئەوە شتێکی جوان نییە." زۆر بە دەگمەن ڕێگە بە خۆمان دەدەین، کە زۆر بە ورد و درشتی لە واتای ئەو دەربڕینە تێبگەین، کە کەسی بەرانبەر بە ڕووماندا بەیانی دەکات.

جارێکیان نەخشێنەرێکم ڕاسپارد، بۆ ئەوەی پەردەی ماڵەکەم بۆ دروست بکات. کاتێک وەسڵی پارەکە گەیشت، هەر تەواو ترسم لێ نیشت.

لەدوای چەند ڕۆژێک، هاوڕێیەکم سەردانی کردم و، سەیری پەردەکانی کرد، کاتێک زانی کە چەندێکم پارە پێیان داوە، گوتی: "چی؟ ئەمە جێگەی نیگەرانییە، دەترسم پارەکەی دوو ئەوەندە کردبێت."

ئایا قسەی هاوڕێکەم دروست بوو؟ بەڵێ، ئەو ڕاستی بەیان کردبوو، بەڵام تەنیا هەندێک کەس حەز دەکەن، گوێ بۆ ڕاستی شل بکەن، کە بەسەر بڕیار و دانایی تۆدا دەشکێتەوە. لەبەر ئەوە، منیش هەر مرۆڤم، هەوڵم دا بەرگیری لە خۆم بکەم، لە ڕاستیدا، باشترین پەردەیە و هەرزانترینیشە، هیچ کەسێک ناتوانێت شتێکی ئەوها جوان و کەشخە بە نرخێکی هەرزان بە دەست بهێنێت.

ڕۆژی دواتر، هاوڕێیەکی دیکە سەردانی کردم، پەردەکانی بەدڵبوون، بەجۆش‌وخرۆشەوە هەستی خۆی دەربڕیی و هیوای خواست، کە بتوانێت شتێکی لەم شێوەیە بۆ ماڵەکەی خۆی بکڕێت. کەچی کاردانەوەی من تەواو جیاواز بوو، گوتم: "باشە، ئەگەر ڕاستیت

دەویت، خۆم ناتوانم پارەی ئەوانە بدەم، هەر پارەیەکی زۆرم پێیان داوە، بە جۆرێک هەر لە کڕینیشیان بە پەشیمانم.“

کاتێک پێمان دەکەوێتە، چاڵی هەڵەوە، دەکرێت هەر خۆمان قبوڵی بکەین، کە هەڵەین، ئەگەر بە شێوەیەکی نەرمونیان و لێزانییەوە مامەڵەمان لەگەڵدا بکرێت، ئەوا دەکرێت لەبەردەم ئەوانی دیکەیشدا دان بە هەڵەکەماندا بنێین، شانازیش بە ڕاشکاوی و بیرفراوانی خۆمانەوە بکەین. بەڵام ئەم دۆخە پێچەوانە دەبێتەوە، ئەگەر کەسێک بییەوێت ناچارمان بکات و ڕاستیمان بە بەردا بکات.

*هۆراس گریلی*، لە ماوەی شەڕی ناوخۆی ئەمریکا، یەکێک بوو لە ڕۆژنامەنووسە بەناوبانگەکان، نەیارێکی سەرسەخت و توندوتیژ بوو، لەبەرانبەر سیاسەتەکانی *لینکۆڵن*، لەو باوەڕەدا بوو، کە دەتوانێت *لینکۆڵن* بهێنێتە سەر بیروباوەڕی خۆی، لە ڕێگەی هێرشی مشتومڕ و، گاڵتەپێکردن و لەکەدارکردنی. لەبەر ئەوە ساڵ بە ساڵ و، مانگ بە مانگ ئەم هێرشانەی بەردەوام بوو. لە ڕاستیدا، گوتارێکی تاڵ و بێبەزەیی و گاڵتەئامێزی نووسی بۆ ئەوەی هێرشێکی خودی بکاتە سەر سەرۆک *لینکۆڵن*، لەو شەوەی کە *بووس* تەقەی لێ کرد.

بەڵام ئایا هەموو ئەو هەڕەشە و، تاڵی و تفتییە، وای لە *لینکۆڵن* کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ *گریلی*دا هاوڕێ بێت؟ نەخێر، بە هیچ شێوەیەک، هیچ کاتێک گاڵتەپێکردن و لەکەدارکردن کاری خۆی ناکات.

ئەگەر هەندێک، پێشنیازی نایابت دەوێت، لەبەرانبەر مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا و بەڕێوەبردنی خودی خۆت و، بەرەوپێشبردنی کەسایەتی خۆت، ئەوا ژیاننامەی *بێنجامین فرانکلین* بخوێنەوە، یەکێک لە باشترین ئەو چیرۆکانەی کە تاوەکو ئێستا نووسرابێت، یەکێکە لە شاکارەکانی ئەدەبی ئەمریکی. *بێن فرانکلین* پێمان دەڵێت، کە چۆن بەسەر هەستی مشتومڕدا سەرکەوتووە و بووە بە کەسێکی چاک و دبلۆماسی لە مێژووی ئەمریکادا.

ڕۆژێکیان، کاتێک *بێن فرانکلین*، لاو بوو، کۆنە هاوڕێیەکی بردیە ئەو لاوە و، هەندێک ڕاستی تاڵوتفتی بە گوێدا چرپاندن، شتێکی لەم شێوەیە:

"*بێن*، تۆ کە سێکی مەعقول نیت، تێڕوانینەکانی تۆ، زللەیەکن و بەرگوێی هەموو ئەو کەسانە دەکەون کە لەگەڵ تۆدا هاوڕانین، بۆنی هێرشیان لێوە دێت، بە جۆرێک هەر کەس گرنگیان پێ نادات. هاوڕێکانت خۆشی و شادی دەبین، کاتێک دەبین تۆ لەلایان نیت، باش دەزانیت کە هیچ کەسێک شتێکی لەم شێوەیە ناڵێت. لە ڕاستیدا، هەر هیچ کەسێک هەوڵی ئەوە نادات، چونکە کردنی شتێکی لەم شێوەیە، دەبێتە مایەی نائاسوودەی و سەختی کار بۆ ئەم. بەم شێوەیەش، تۆ هەرگیز لە ئێستا زیاتر نازانیت لە کاتێکدا ئەوەی، کە تۆ دەیزانیت شتێکی زۆر کەمە."

یەکێک لەو شتە باشانەی، کە دەربارەی *بێن فرانکلین* دەیزانم ئەوەیە، کە ئەو هێرشە توندوتیژەی قبوڵ کرد، زۆر سنگفراوان و ژیر بوو، بۆ ئەوەی درک بکات کە ئەو قسانە ڕاست و دروستن، هەستیش بەوە بکات، کە بەرەو شکست و کارەساتی کۆمەلایەتی ملی ڕێگای گرتووتە بەر. لەبەر ئەوە باش بەخەبەر هاتەوە، دەست بەجێ، دەستی کرد بە ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی.

*فرانکلین* گوتی: "یاسایەکم دارشت، هەستام بە قبوڵکردنی هەموو ئەو قسە و ڕەخنانەی، کە ڕووبەڕووی خەڵکم دەکردنەوە، ئیدی چی دیکەیش ڕێگەم، بە خۆم نەدا کە ئەو وشە و دەربڕینانە بەکار بهێنم کە دەبوونە هەڵقوڵینی تێڕوانینێکی دیاریکراو، وەکوو 'بە دڵنیاییەوە،' 'بێگومان'... هەتادوای. لە جیاتی ئەمانە، ئەم دەربڕینانەم خستە گەڕ، 'وا بیر دەکەمەوە،' 'وا تێدەگەم،' یاخود 'وا خەیاڵ دەکەم' شتانی لەم شێویە. یانیش 'لەم کاتەدا باوەڕم وایە' هەر کاتێک کەسێک شتێکی گوتبایە، کە من بە هەڵەم زانیبایە، ئەوا خۆم لەو دۆخە بەدوور

دەگـرت ئەگەر دژایەتـی لەگەڵـدا بـکەم بە شـێوەیەکی ڕاشـکاوانە، دەستبەجێ هەڵە و کەموکورییەکانیانی بێنمە سەر بەرە."

بەڵکو بەم شێوەیە دەستم، بە وەڵامدانەوە دەکرد، دەکرێت لە هەندێک حاڵەت و باردا تێڕوانین و دیدگەی تۆ ڕاست بێت، بەڵام لە ئێستادا باردۆخەکە بە شێوەیەکی جیاواز بۆ من دەردەکەوێت... تادوای. هەر زوو سوودم لە گۆڕینی ئەم بیرۆکانەی خۆمدا بینی، ئەو گفتوگۆیانەی کە ڕووبەڕوویـان دەبـوومەوە زۆر بە خۆشـحاڵییەوە ڕێیـان دەکـرد، خـــاکیبوونم لە پێشـــنیازکردنی تێڕوانینەکـــانم، زیـــاتر لەلایەن بەرانبەرەکـانمەوە بەخێرهاتنیـان لـێ دەکـرا و کەمتـر دژیەکـی دەهـاتە سـەر ڕێگامـان، ئیدی کەمتـر دوچـاری گـانگرین بـوومەوە، بەوەی کە درکـم کـرد، ئیتـر منـیش مـرۆڤم و هەڵە دەکەم، ئاسـانتر دەمتـوانی وا لەبەرانبەرەکانم بکەم، کە دەستبەردای هەڵەکانیان بن و پەیوەنـدیی بە منەوە بکەن، کاتێک وا ڕێکەوت کە من لە سەر ڕێڕەوی دورست بم.

"ئەم شـــێوازە، کە ســـەرەتا بە هـــۆی تونـــدوتیژی و ئـــارەزووە سروشتییەکانەوە دوچاری بووم، لەدواییدا هەر زۆر ئاسان بوو، هەر خووم پێیەوە گرت، لەمـاوەی ئەم پەنجـا سـاڵەدا، هـیچ تـاکە کەسـێک نەبـووە، گوێبیسـتی یەک دەربڕینـی نەرێنـی بووبێـت لەمـنەوە و، لە دەستم ڕا بکات.

"ئەم خووەیش 'لەدوایی ئەوەی گۆڕنکاری بەسەر کەسـایەتیمدا هـات،' پـێم وایە کە سـەرکەوتنی مـن بـۆ ئەو یاسـایە دەگەڕێـتەوە، لەبەردەم هاوڵاتیانـدا دەچـوومە دڵـی خەڵـکەوە لە ئەنجـوومەنی گشـتی، کاتێـک بـووم بە ئەنـدام تێیـدا، وەلـێ مـن قسـەکرێکی بـاش نەبـووم، هەرگیـز زمانپـاراو نەبـووم، لە هەڵبژاردەکـانی وشـەکانمدا هەر زۆر دوودڵ بـووم، کەم جـار هەبـووە زمـانم ڕێکوپێک بووبێت. لەگەڵ ئەوەیشـدا، ئامانج و مەبەستەکانی خۆمم دەپێکا."

چۆن شێوازەکای *بێن فرانکلین* لە بواری کاکردندا کاریان دەکرد؟ با دوو نموونە ڕوون بکەینەوە.

*کاسرین ئەی. ئۆلرێد* شای ماونتەین، لە باکووری کارۆلینا، بە یەکێک لە پۆلەکانی ئێمەی گوت، کە چۆن لەگەڵ کێشەیەکی ئەوها هەستیاردا ڕێی کردووە، بەر لەوەی و دوای ئەوەی بەشداری لە خولەکەی ئێمەدا بکات.

دەڵێت: "بەشێک لە بەرپرسیاریەتی من، مامەڵکردن بوو لەگەڵ دانان و پاراستنی سیستەم و پێوانەی کاریگەر بوو بۆ وەگەڕخەرەکانمان، بۆ ئەوەی پارەی زیاتر پەیدا بکەن بە دروستکردنی دەزووی زیاتر. ئەو سیستەمەی کە ئێمە بەکارمان دەهێنا بە باشی کاری دەکرد، کاتێک دوو یا سێ جۆری دەزوومان هەبوو، بەڵام بەم دواییانە، ئامار و تواناکانمان فراوانترکردن، بۆ ئەوەی توانامان پێ ببخەشێت و بتوانین زیاتر لە دوازدە جۆری جیاواز بەکار بخەین. ئەوسیستەمەی بەردەستمان، چی دیکە لە توانایدا نەبوو، کە بە شێوەیەکی یەکسان دەرەقەتی ئەو کارە بێت، کە پێکەوەمان نابوو بۆ ئەوەی ئاستی بەرهەمەکە بەرز بکەینەوە. ئیدی کارم لەسەر سیستەمێکی نوێ دەکرد، کە لە تواناییدا هەبوو لەگەڵ ئەو کارە نوێیەدا ڕێ بکات، لە ڕێگەی پۆلێنکردنی دەزوویەکە کە هەریەکێکیان لە کاتێکی دیاریکراودا کاری دەکرد.

بەو سیستەمە نوێیەی کە لە بەردەستمدا بوو، ئیتر بەو نیازە چوومە کۆبوونەوە، کە ئەوە بسەلمێنم کە سیستەمەکەی من، شتێکی ڕاست و دروستە. بە ورد و درشتی پێم گوتن، کە چۆن ئەوان هەڵە بوون و نیشانمدان، کە لە کوێدا بە هەڵەدا چوون و، نادادپەروەر بوون، چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانەم لای خۆم گەڵاڵە کردبوو، کە ئەوان پێویستیان پێ بوو. بۆ ئەوەی بە کورتی بیبڕمەوە، من شکستم خوارد! بە جۆرێک سەرقاڵ بووم، کە بەرگری لە پێگەی خۆم بکەم لەسەر

سیستەمە نوێیەکە، کە هیچ شتێکی کراوەم بەجێ نەهێشتبوو، بۆ ئەوەی کێشەکانی ئەوان قبوڵ بکەم، لەسەر سیستەمە کۆنەکە، ئیتر بەمەیش ئەو دۆزەیە چوویە ژێر گڵ.

"لەدوای تێپەڕبوونی چەندین بەشی ئەم خولە، ئیدی درکم بەوە کرد، کە لە کوێدا بە هەڵەدا چووم، کۆبونەوەیەکی دیکەم بەست و، داوام لێ کردن، کە پێیان وا بوو کێشەکانی ئەوان چین و چۆن سەریان هەڵداوە. هەموو خاڵێکمان تاووتوێ دەکرد، داوای بیروبۆچوون و دیدگەی ئەوانم دەکرد و، ئەمەیش باشترین ڕێگە بوو، بۆ بەرەوپێش چوون، لەگەڵ هەبوونی هەندێک پشنیار و، ماوە، ئیدی لێیان گەڕام خۆیان سیستەمەکەی من بەرەو پێشەوە بەرن و پەرەی پێ بدەن، ئەوان بە هەستێکی گەرموگوڕەوە پەسەندیان کرد.

"ئێستا هاتوومە سەر ئەو قەناعەتەی، کە هیچ شتێکی باش بەدەست ناهێنرێت و بگرە زیانی زۆریشی لێ دەکەوێتەوە، ئەگەر ڕاستە و ڕاست بە کەسێک بڵێی، تۆ هەڵەی، تەنیا بەم شێوەیە دەتوانیت سەربکەویت، ئەگەر ڕێز لە شکۆی ئەو کەسە بگریی و خۆت بکەی بە بەشێکی بەخێرنەهاتوو لەهەر تاووتوێیەکدا."

با نموونەیەکی دیکە بەرجەستە بکەین، لەبیرت نەچێت ئەم حاڵەتانەی، کە من لێرەدا بەرجەستەیان دەکەم، ئەزموونی هەزاران خەڵکن. ***ئار ڤی کرۆالی***، فۆرشیار بوو، بۆ کۆمپانیاییەی تەختەی خاو لە نیو یۆرک. ***کراولی*** دەبووایە مامەڵە لەگەڵ بازرگانەکانی تەختە بکات و، هەردەم پێی گوتبوون هەڵەن بۆ ماوەی چەنین ساڵ. ئەمەیش هیچ دەرەنجامێکی نەبوو بەڵام هیچ کارێکی باشیشی بە دەست نەخست. ***کراولی*** گوتی: "ئەم پشکنەرانەی تەختەی خاو، وەکوو ناوبژیوانی یاری بەیسبۆڵ وان، هەر کە بڕیارێک دەردەکەن ئەوا هەرگیز نایگۆڕن."

بەڕێز *کراولی*، بینی کەوا کۆمپانیاکەی هەزارن دۆلار زیاد دەکات، لە ڕێـــگەی ئەو گفتوگۆیـــانەی کە دەیانبـــاتەوە، کاتێـــک بەشـــداری لە خولەکەی مندا کرد، هەوڵی دا بۆ ئەوەی تاکتیکەکانی بگۆڕێت و واز لە دەمەتەقـــێ بهێنێـــت. ئـــێ دەرنجـــامی ئەمە چـــی بـــوو؟ ئەمەیە چیرۆکەکەی کە خۆی بە هاوپۆلەکانی گێڕابوویەوە:

"بەیانییەکیـــان، لە نووســـینگەکەمدا زەنگـــی تەلەفـــۆن لێیـــدا، کەســـێکی سەرگەرم و بێزارکەر پەیوەندیی کردبوو، لەلاوە ویستی من ئاگادار بکاتەوە، بەوەی ئەو ئۆتۆمبێلەکەی کە ناردبوومـان بۆ تەختەکان هەر بە تەواوەتی گونجا و باش نەبووە. کۆمپانیاکەی لە داگرتنی بارەکە وەستابوو، دەستبەجێ داوای گفتوگۆیان کرد، بۆ ئەوەی ئەو قەوالەیە لە بارەکەیاندا نەهێڵن، لەدوای ئەوەی کە نزیکەی یەک لەســەر چواری بارەکە داگیرابوو، ئیدی پشکنەری بارەکە گوتی: 'کە لە سەدا پەنجا لە ئاست و پلەی خۆی دابەزییوە، لەژێر هەر بارودۆخێدا بێت ڕەتیان کردەوە، کە ئەوە قبوڵ بکەن.'

"دەســـتبەجێ ڕووم لە کـــارگە کـــردوو و، لە ڕێگـــادا بڕیـــارم دا، کە بە باشـــترین شـــێوە مـــامەڵە لەگەڵ ئەو دۆخەدا بـــکەم. بە ئاســـایی لە دۆخێکی لەم شێوەیەدا، دەبووایە دەربـارەی یاسـاکانی پلە دوابـام و هەوڵـــم دابـــا، لە ئەنجـــامی ئەزمـــوون و زانیـــاری خۆمـــدا، وەکـــوو پشـکنەرێکی تەختە، بۆ ئەوەی ئەوی دیـکە، قایل بکەم کە لە ڕاسـتیدا ئەو تەخـــتەیە لە ئاســـتی پێویســـتیدایە و، وەلـــێ ئەو خـــراپ پـــۆلێنی کردبوون، ئەویش بە هەڵە لە یاسـاکان تێدەگات لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو بنەمایانەی کە لە خولەکەدا فێریان بووم جێبەجێیان دەکەم.

"هەر کە گەیشتمە ئەوێ، دەستگێڕی کڕین و پکشکنەرم لەوێدا بینی، هەردووکیـان ئامـادەی دەمەتەقـێ و شـەڕ بـوون. ڕۆیشـم بـۆلای ئەو بـارهەڵگرەی کە خـاڵی کرابوو، داوام کـرد بـۆ ئەوەی هەر بە تەواوی بەتاڵی بکەن، بۆ ئەوەی ببینم کە چۆن شـتەکان ڕێ دەکەن. داوایشم

له پشكنەر كرد، ئەو تەختانەی كە دەیەویت و بەلایەوە باشن بیان خاتە لایەک و ئەوانەی كە خراپیشن بیان خاتە لایەكەی دیكەوە.

"لەدوای ئەوەی بۆ ماوەیەک سەیرم كرد، ئیدی ئەوەم بۆ دەركەوت، كە ئەو پشكنەرە لە ڕاستیدا زۆر توند بووە و بە هەڵە لە یاساكان تێگەشتووە. ئەم تەختە تایبەتە سنەوبەری سپی بووە، ئەوەیشم دەزانی، كە پشكنەر زۆر بە باشی دەربارەی دارەكانی خوێندووە. ئیدی سنەوبەری سپی بۆ من بوون، بە بەڵگەیەكی باش، بەڵام ئایا من هیچ بەرهەڵستییەكم كرد لەوەی كە ئەو چۆن تەختەكانی پلە بەند كردبووو؟ نەخێر، تەنیا بەردەوام بووم لە سەیركردنی و، دواجار دەستم بە پرسیاركردن كرد، كە بۆچی چەند پارچەیەكی دیاریكراو قایلكەر و باش نەبوون. وام هەژمار نەكرد، كە ئەو پشكنەرە هەڵە بێت، بەڵكو ئەوەم دووپات كردەوە، كە هۆكاری پرسینی من بە مەبەستی ئەوە بووە، كە ئەوە بەو كۆمپانیایە ببەخشین كە دەقاودەق چی دەوێت لە داهاتوودا.

"لە ڕێگەی پرسیاركردنی هاوڕێیانەو و، ڕۆحی هاوكارییەوە و، پێداگیریكردنی بەردەوام كە ئەوان ڕاستبوون لە دانانی تەختە، كە جێگەی ڕەزامەندی نەبوو لە مەبەستی ئەواندا، منیش ئەوم ئاگادار كردەوە و، پەیوەندییە تاڵەكانی نێوان ئێمە توانەوە و هەر بوونیان نەما. نواندنی ڕەفتارێكی وریا بیرۆكەیەكی خستە بیر و هزری ئەوەوە، كە هەندێک لەو پارچە ڕەتكراوانە ئەوا خۆیان لەنێو ئەو پلانەدا بوو، كە خۆیان كڕیبوویان و، پێداویستییەكانی ئەوانیش داوای پلەیەكی باشتریان دەكرد، من زۆر ئاگادار بووم. لەگەڵ ئەوەیشدا، لێی نەگەڕام وا بیر بكەنەوە كە من كێشەیەک دەنێمەوە."

"لە كۆتاییدا، بیركردنەوە و دیدگەی، ئەو هەر بە تەواوەتی گۆڕا، دواجار ئەوەی قبوڵ كرد، كە ئەوەندە ئەزموونەی نەبووە، لەسەر سنۆبەری سپی. دەستی بە پرسیاركردن كرد، دەربارەی هەر

پارچەیەک، هەر کە لە ئۆتۆمبێلەکە دەهاتە دەرەوە. منیش بۆم ڕوون دەکـردەوە، کە چـۆن هەر پـارچەیەک لەگەڵ ئەو ئاسـت و پـلەیەدا هـاتووە، بەڵام لەسـەر ئەوەیش سوور بووم، کە ئێمە نەماندەویست ئەو ئەمە لە گوێ بگرێت، ئەگەر بۆ مەبەست و مەرامی ئەوان شتێکی نەگونجـاو بووایە. دواجـار ئەویش گەیەشتە ئەو ئاسـتەیەی کە تێیدا هەسـتی بە هەڵە دەکـرد، کە هەمـوو جارێـک پـارچەیەکی باشـی خستووەتە نـاو کۆمەڵەی پارەچە ڕەتکراوەکـانەوە. هەر بەلایەنـی کەم درکی کرد، کە هەڵەکە لە خودی خۆی بووە، نەک لە ئاستی باشی و خراپی تەختەکە، کە ئەوان پێویستیان پێی بووە.

"دەرەنجـامی کۆتـایی ئەوە بـوو، کە لەدوای ئەوەی ڕۆیشـتم، ئەو دیسـان ڕۆیشـتەوە نـاو بـارهەڵگرەکە، تەواوی شـتەکانی قبـوڵ کـرد، ئێمەیش پشکنینێکی باش و تەواومان بەدەست خست."

"لەم تـاکە نمـوونەیەدا، تەنیـا کـارێکی بچـووک، بەردەوامبـوون لە پێکـوتنی کەسـی بەرانـبەر کە هەڵەیە، کۆمپانیـا کەمـی لە لەدەسـتدانی بڕێکـی پـارەی کـاش ڕزگـار کـرد، دژوار دەبێـت ئەگەر بەهـای پـارە بخرێتە شوێنی ئەو شتەیەی کە ڕزگارمان کرد."

***مارتین لوسەر کینگ***، ***جی. ئار***، وەکوو دژە شەڕێک، پرسیاری لێ کرا، دەکرێـت ڕێزدارتـر بێـت، لە ژەنەڕاڵـی هێـزی ئاسمانی دانیـاڵ "چـاپی" جەیمـز، پاشـان لە ئەفسـەری هەرە پـلە بـاڵای وڵات، دکتـۆر **کینـگ** وەڵامـی دایەوە: "مـن لە ڕێگەی بنەماکـان خەڵکەوە، بڕیاریـان لەسـەر دەدەم، نەک لە دیدگای بنەماکای خۆمەوە."

بە هەمـان شـێوە، ژەنەڕاڵ ***ڕۆبێرت ئـی لـی***، جارێکیـان قسـەی لەگەڵ سەرۆکی کۆنفیێدێتری، ***جێفرسۆن داڤیس***ـدا کرد، بە جوانترین شـێوە دەربارەی ئەفسەرێک کە لەژێر فەرمانی ئەودا بوو. ئەفسـەرێکی دیکە سەرسـام ببـوو. گـوتی: "ژەنەڕاڵ، نـازانی کە ئەو پیـاوەی ئەوەنـدە بە ئاسـت بەرزی قسـەی لەگەڵـدا دەکەیـت، یەکـێکە لە دوژمـنە هەرە

سەرسەختەکانت، کە هیچ دەرفەتێک، لە دەست نادات، بۆ ئەوەی ڕقت لێ هەڵگرێت و دژت بوەستێت؟"

ژەنەڕاڵ *لی* وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، بەڵام سەرۆک داوای لێ کردووم، کە تێڕوانینی ئەو کابرایە وەربگرم، ئەو داوای دیدگای منی نەکردووە."

بەهەر حاڵ، من لەم بەشەدا هیچ شتێکی تازە بەدەرناخەم، دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر، عیسا گوتوویەتی: "خێرا لەگەڵ ڕکابەرەکەتدا ئاشت بەرەوە، لەو کاتەی لەگەڵتە و بە ڕێگاوەن، نەوەک ڕکابەرەکەت بتداتە دەست دادوەر و، دادوەریش بتداتە دەست پۆلیس، ئەویش فڕێتبداتە بەندیخانە."

بە دووسەدوبیستودوو ساڵ بەر لە لەدایکبوونی مەسیح، ***ئاکتۆی*** فیرعەون لە میسر ئامۆژگارییەکی لەم شێوەیەی بە کوڕەکەی داوە، ئامۆژگارییەک کە لە ئەمڕۆدا تارادەیەکی زۆر پێویستە، فیرعەون گوتوویەتی: "ببە بە کەسێکی دبلۆماسی، ئەمە یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی ئامانجی خۆت بپێکیت."

بە شێوەیەکی دیکە، لەگەڵ کڕیارەکتدا دەمەتەقێ مەکە یاخود لەگەڵ هاوسەرەکەت یان ناحەز و نەیارەکەتدا، پێیان مەڵێ کە ئەوانە هەڵەن، چاویان تێ مەبڕە، بەڵکو کەمێک، ببە بە کەسێکی دبلۆماسی:

**"ڕێز لە ڕاوبۆچوونی کەسی بەرانبەر بگرە،**

**هەرگیز مەڵێ، تۆ هەڵەیەت."**

## ڕێگای دووەم

## ڕێگایەکی باش بەرەو بیرلێکردنەوە

ئەگەر پەستبووی و یەک دوو قسەی هیچت پێ گووتن، کاتێکی باشت هەیە بۆ خاڵیکردنەوەی هەستی تووڕەییت. ئەی دەربارەی کەسی بەرانبەر؟ ئایا ئەویش خۆشی و شادی لەگەڵ تۆدا هاوبەشی پێ دەکات؟ ئایا ئاوازی پڕ لە شەڕانیت و، ڕەفتار نواندنی نەیاریت، هیچ شتێک لە دۆخەکە ئاسان دەکات، بۆ ئەوەی لەگەڵ تۆدا هاوڕا بێت؟

*دروو ویلسن* دەڵێت: "ئەگەر بە مستەکۆڵەوە بەڕوومدا بدەیت، ئەوا پەیمانت پێ دەدەم، کە مستەکانی من لە هی تۆ قورستر و بە زەبرتر دەبن، بەڵام ئەگەر ڕووم تێ بکەی و بڵێیت، 'با دابنیشین و پێکەوە ڕاوێژ بکەین، خۆ ئەگەر تێڕوانینمان لە یەکتر جیاواز بوو، تێبگە ئاخۆ بۆچی لە یەکتر جیاوازین، ئەو خاڵانە دیاری بکەین، کە ئێمە لەسەریان جیاوازین،' لەدواییدا بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەوەندەیش لە یەکتر جیاوازنین، ئەو خاڵانەی کە لەسەریان کۆک نین چەند دانەیەکن و، ئەوانەی لەسەریشیان کۆکین، بێشوومارن، ئەگەر ئێمە تەنیا ئارامی و مەیلمان و ئارەزوومان هەبێت ئەوا ڕێک دەکەوین و پێکەوە ڕێ دەکەین."

هیچ کەسێک ئەو ڕاستییەی *دروو ویلسن*، بەرز نانرخێنێت زیاتر لە *جۆن دی ڕۆکفێلەر جیئار*، بگەڕێینەوە ساڵی ١٩١٥، *ڕۆکفێلەر* زیاتر لە هەموو کەسێک ڕووبەڕووی سووکایەتی دەبوویەوە، لە کۆلۆرادۆ، یەکێک لە خۆپیشاندانە پڕ لە خوێناوییەکانی پیشەسازی کە لە مێژووی ئەمریکادا ڕووی دا بێت، کە ئەو وڵاتەی بۆ ماوەی دوو ساڵی ڕەبەق تاساندبوو، دژی کۆمپانیاکەی ئەو بوو. کرێکارەکان داوای پارەی زیاتریان دەکرد، لە سووتەمەنی کۆلۆرادۆ و کۆمپانیای

ئاسن بوو، **رۆکفێلەر** ئەو کۆمپانیایەی کۆنترۆڵ کردبوو، کەلوپەلی کۆمپانیاکە تێکشکان و تیمی پارێزگاریکردنیش بانگکران، خوێن ڕژا، تەقە لە خۆپیشاندەران کراو، گولله جەستەی ئەوانی بڕی.

لە کاتێکی لەو شێوەیەدا، ئەو هەرایەیش لە ڕەقوتوڕەییدا دەکوڵی، **رۆکفێلەر** دەیویست خۆپیشاندەران بەرەو ئەدای بیرکردنەوەی خۆی پەلکێش بکات. هەروایشی کرد، بەڵام چۆن؟ ئا ئەمە چیرۆکەکەیە:

"لەدوای چەند هەفتەک، لە پەیداکردنی هاوڕێ، **رۆکفێلەر** دەستی بە وتاردان کرد بۆ خۆپشاندەران. ئەم وتارە بە تەواوی شاکاری جوانن، ئەنجامی زۆر سەرسوورهێنەری لێ کەوتەوە. بوویە هۆی کپکردنەوەی ئەو ناڕەزای و ڕقوتوڕەییە، کە وەکوو هەڕەشەیەک وا بوو، بەسەر **رۆکفێلەر**دا. بۆ خۆیشی بوویە هۆی سەرکەوتن و بە دەستخستنی ڕێز. بە شێوەیەکی دۆستانە ڕاستییەکانی دەخستەڕوو، بە جۆرێک کە خۆپیشاندەران بەبێ گوتنی یەک تاکە وشەی دیکە، دەربارەی بەرزکردنەوەی مووچە کە لەپێناویدا دەجەنگان گەڕانەوە سەر کارەکانیان.

ئەمە پێشەکی ئەو گوتارە ناوازەیە، سەرنجی بدە، چەندێک دۆستانەیە. **رۆکفێلەر**، لەبیرت بێت، قسەی بۆ کەسانێک دەکرد، کە بە چەند ڕۆژێک پلانیان دانابوو، بۆ ئەوەی بە دارسێوێکی ترشدا هەڵیبواسن، لەگەڵ ئەوەیشدا، گوتارەکەی لێوان لێوە لە دەستەواژەی میهرەبانی و هاوڕێیانە، وەکوو؛ شانازی بە خۆمەوە دەکەم کە لێرەم، لەدوای ئەوەی سەردانی ماڵی ئێوەم کردووە، چاوم بە زۆرێک لە خێزان و منداڵەکانتان کەوتووە، ئەمڕۆ لێرەدا، وەکوو کەسانی بێگانە چاومان بە یەکتر ناکەوێت، بەڵکو وەکوو هاوڕێ... هاوڕێی گیانی بە گیانی، بەرژەوەندییە هاوبەشەکانمان، تەنیا لەبەر نازکی و ڕەفتار بەرزی ئێوەیە، من لێرەم."

*ڕۆکفێلەر* دەستی پێ کرد: "ئەوڕۆ گەورەترین ڕۆژی ژیانی منە، یەکەم جارە هەلی ئەوەم بۆ دەڕەخسێت، کە لەگەڵ کارمەندەکانی ئەم کۆمپانیا مەزنەدا کۆ دەبمەوە، ئەفسەر و بەڕێوەبەرەکانی هەموویان پێکەوە، دڵنیاتان دەکەمەوە، کە شانازی بە بوونی خۆم دەکەم، کە لێرەم، ئەم کۆبوونەوەیشم هەتا دواساتەکانی ژیانم لەبیر دەمێنێت. ئەگەر ئەم کۆبوونەوەیە دوو هەفتە لەمەوبەر بەڕێوەچووبایە، ئەوا من لێرەدا، وەکوو کەسێکی بێگانە دەوەستام بۆ زۆربەتان، ناسینەوەی ڕووخساری نوێ، هەفتەی ڕابردوو، دەرفەتم بۆ ڕێکەوت بۆ ئەوەی سەردانی ئۆردووگاکانی کێڵگەی خەڵووزم بکەم و، قسە لەگەڵ یەکەبەیەکی بەڕێوەبەرەکان بکەم، جگە لەوانەی کە ئامادەنەبوون، سەردانی ماڵەکانتانم کرد و، زۆرێک لە خێزان و منداڵەکانی ئێوەم بینی، ئێمە لێرەدا وەکوو بێگانە چاومان بە یەکتر ناکەوێت، بەڵکو وەکوو هاوڕێ، ئەمەیش هەر لەبەر هاوڕێی گیانی بەگیانییە، کە من خۆشحاڵم بە هەبوونی ئەو دەرفەتەیە، کە بەرژەوەندییە هاوبەشەکانمان لەگەڵ ئێوەدا تاووتوێ بکەین.

"وەلێ ئەمە کۆبوونەوەی ئەفسەرانی کۆمپانیا و بەڕێوەبەرەکانی کارمەندەکانە، من تەنیا لەبەر ڕەفتار بەرزی ئێوە، وا لێرەم، ئەوەندە بەختەوەر نیم، بۆ ئەوەی ببم بە کەسێکی دیکە. لەگەڵ ئەوەیشدا، من وابەستەی ئێوە بووم، لە ڕوویەکەوە، من هەم ڕۆڵی خاوەن پشک و هەم ڕۆڵی بەڕێوەبەر دەبینم."

ئایا ئەمە نموونەیەکی نایاب نییە، لە هونەری پەیداکردنی هاوڕێ لە نەیارەوە؟

وا دابنێ ئەگەر *ڕۆکفێلەر*، ڕێگایەکی جیاوازی گرتبایە بەر، وا دابنێ ئەگەر لەگەڵ ئەو کرێکارانەدا دەمەتەقێی کردبا و، ڕاستییەکانی شێواندبا بەڕووی ئەواندا. وا دابنێ کە ئەو بە ئاوازێکی دەنگی و بە کورتە باسێک پێی گوتبان، کە ئەوانە هەڵەن، وا خەیاڵ بکە، بە

تەواوی یاسا لۆژیکەکانەوە، ئەگەر سەلماندبای، کە ئەوانە هەڵەن، ئەو کاتە چی ڕووی دەدا؟ بگرە ڕقوتوڕەیی زیاتر سەری هەڵدەدە، یاخیبوونی زیاتر دەهاتە کایەوە.

ئەگەر ناخی کەسێک، پڕ بێت لە ناکۆکی و ڕقوقینە، بەرانبەر بە تۆ، بە بەکارهێنانی تەواوی لۆژیکی جیهانی گاوریش، ناتوانی بەرەو ئەدای بیکردنەوەی خۆت پەلکێشی بکەیت. سەرزەنشتکردنی دایک و باوکان و، بەڕێوەبەرەکان و، مێردەکان و، خێزانە تورەکان دەبێت درک بەوە بکەن، کە خەڵک نایەوێت بیر و هزری خۆیان بگۆڕن. ناتوانرێت ناچار بکرێن یان وایان لێ بکرێت لەگەڵ تۆ یان من هاوڕا بن. بەڵام بە شێوەیەکی شیاو دەکرێت ئاڕاستە بکرێن، ئەگەر ئێمە میهرەبان و هاوڕێیانە بین، هەر زۆر نەرمونیان و دۆستانە دەبین.

***لینکۆلن***، زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر، هەندێک قسەی کاریگەری کردووە، کە ئەمانەن:

"قسەیەکی ڕاست و کۆن هەیە، دەڵێت: 'دڵۆپێک هەنگوین زیاتر لە گالۆنێک زراو مێش لە خۆی کۆ دەکاتەوە.' خەڵکیش هەروایە، ئەگەر تۆ دەتەوێت، خەڵک بەرەو ڕووی خۆتدا پەلکێش بکەیت، ئەوا سەرەتا قایلی بکە، کە تۆ هاوڕێیەکی دڵسۆزی ئەوەیت، ئەمەیش دڵۆپێک هەنگوینە کە دڵی ئەو دەگرێت، ئەوە بڵێ کە هیوای بۆ دەخوازی، ئینجا ئەویش بەرەو بیرکردنەوەی تۆ دێت.'"

بەڕێوەبەرە بازرگانەکان فێر بوون، کە دەبێت لەگەڵ خۆپیشاندەراندا کەسێکی هاوڕێیانە بێت. بۆ نموونە کاتێک دووهەزارووپێنجسەد کرێکار، لە کۆمپانیای مۆتۆر وایت، لەپێناو زیادبوونی کرێیەکانیاندا مانیان گرت و، یەک دەست و ڕیزبوون، ***ڕۆبێرت ئێف بلاک*** سەرۆکی کۆمپانیاکە، هیچ تورە نەبوو، ناڕەزایی دەرنەبڕی و نەترسا و بە شێوەیەکی ستەمکارانە و کۆمەنیستانە نەدوا، بەڵکو سوپاس و ستایشی خۆپیشاندەرانی کرد. لە ڕۆژنامەی کلێبەر لاند، ئاگادرییەکی

بڵاو کردەوە، تێیدا گوتبووی: "بە شێوەیەکی ئاشتیانە نارەزایی خۆیان دەبڕیوە،" ئیتر، دار و دەستکشێی یاری بەسیبۆڵی بۆ کڕین و بانگهێشتیانکردن، بۆ ئەوەی یاری بکەن، خۆ ئەوانەی حەزیان لە یاری بۆڵینگ بوو، بۆ ئەوانیش یاریگایەکی بە کرێ گرت.

ئەم کەشە هاوڕێیانەی بەڕێز **بلاک**، کە بەیانی کرد، سەری گرت: "بگرە هەستی هاوڕێیەتی هێنایە کایەوە، لەبەر ئەوە مانگرتووەکان، گسک و خاکەناز و زبڵدانیان هێنا و، دەستیان کرد بە هەڵگرتنەوەی کاغەز و جگەرە لە دەوروپشتی کارگەکە. خەیاڵ بکە! مانگرتووەکان وا دەوروبەری کارگە پاک دەکەنەوە، لە کاتێکدا بۆ بەرزبوونەوەی مووچەکانیان دەجەنگان.

ڕووداوی لەم شێوەیە، لە مێژووی جەنگی کرێکاراندا ڕووی نەداوە، کەچی لە ماوەی یەک هەفتەدا لە ڕێگەی سازانەوە کۆتایی پێ دێت، بەبێ هیچ هەر بریندارکردنێک و ڕقوقینێک.

***دانیال وێبستەر***، یەکێک بوو لە پارێزە هەرە سەرکەوتووەکان، کە پارێزگاری لە دۆزەکان دەکرت، کەچی لە دەمەتەقێی هەرە بەهێزەکانیدا، بە لێدوانێکی هاوڕێیانەوە دەهاتەگۆ: "ئەمە بۆ ناوبژیوانە، کە دەبێت تێی ڕابمێنێت،" "دەکرێت ئەمە شیاوی لێوردبوونە و بیرکردنەوە بێت،" "لێرەدا چەند ڕاستییەک بوونیان هەیە، کە متمانەم پێتە، بۆ ئەوەی لە دەستیان نەدەیت،" یاخود "تۆ و زانیاری سروشتی مرۆڤ، هەر بە ئاسانی، گرنگی ئەو ڕاستییانە دەزانن." هیچ داڕووخانێک لە گۆڕێ نییە، نە شێوە و شێوازی پەستانی زۆر، هیچ هەوڵ دانێک لە گۆڕێدا نییە، بۆ ئەوەی تێڕوانینی خۆت بەسەر ئەوانی دیکەدا بچەسپێنی. **وێبستەر** بە نەرمی، هێمنی و لەسەرخۆیی، شێوازێکی هاوڕێیانە دەهاتە گۆ، ئەمەیش وای لە ئەو کرد، کە بەناوبانگ بێت.

دەکرێـت تـۆ هەگیـز بـۆ دامرکانـدنەوەی خۆپیشـاندانێک، یـاخود چارەسـەکردنی دادگـایی بانـگ نەکرێیت بەڵام دەکرێت بتەوێت کرێی خـانووەکەت کەم بـکەیەوە، ئایـا پەیڕەوکردنـی شـێوازی هاوڕێیـانە یارمەتیدەر دەبێت؟ با ببینین.

*ئـێ. ئێل. سـترۆب*، ئەنـدازیارێکە، دەیوسـت کرێـی خـانووەکەی کەم ببێـتەوە، دەیزانـی کە خـاوەنی مـاڵەکە زۆر ڕەزاگـرانە، لەبەردەم قوتابیانی پۆلەکەدا بەڕێز *سترۆب* گوتی: "لە نامەیەکدا بۆم نووسی، هەر کە مـاوەی بەڵێننـامەکە کۆتـایی هـات، ئەوا ئەو خـانووە بەجـێ دەهـێڵم، ڕاسـتییەکە ئەوە بـوو، مـن نەمدەویسـت ئەو خـانووە بەجـێ بهێڵـم، دەمویسـت ئەوە بڵـێم، ئەگەر کـرێیەکەم کەم بکـاتەوە، بەڵام کەشـەکە بە جۆرێـک دیـار بـوو، کە یارمەتیـدەر نەبێت. کرێچییەکـانی دیکەیش هەمـان هەوڵیـان دابوو، شکتسـتیان خواردبوو. هەمـوو لایـک پێیـان ڕاگەیانـدم، کە خـاوەن خـانووەکە زۆر ڕەزاگـرنە، بـۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکرێت. بەڵام من بە خۆمم گوت: 'بەشـداری لە خولێکدا دەکەم، بۆ ئەوەی فێری چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن بم لەگەڵ خەڵکیـدا و، هەوڵ دەدەم لەگەڵ ئەویشدا تـاقی بکەمەوە، ببینم ئاخۆ چۆن کـار دەکات.'"

"هەر کە نامەکەی منـی پێگەیشـت، خـۆیی و سـکتێرەکەی هـاتنە لام، بە سـڵاوێکی هاوڕێیـانەوە ئەوم لە بەردەرگـا بینـی، بە هەسـتێکی گەرموگوڕەوە، مامەڵەم لەگەڵدا کرد. بەوە دەستم پـێ نەکرد، کە کرێـی خـانووەکە، چەنـدێک بەرزە، بەڵکـو دەربـارەی ئەوە قسـەم کـرد، کە چەنـدێک کەیفـم بە مـاڵەکەی دێـت. بـڕوام پـێ بـکە، لە 'وەسـفکردندا، کەسێکی دڵگەرم بووم و، لە ستایشدا، کەسێکی دەستبڵاو بـووم' بە خۆشڕوویەوە قسەم لەسەر ئەدای بەڕێوەبرنی ماڵەکەی دەکرد و پێم گـوت: 'کە حەز دەکەم، بـۆ مـاوەی سـاڵێکی دیکەیـش تێیـدا بمێـنمەوە، بەڵام ناتوانم کرێیەکەی بدەم.'"

"خاوەن ماڵ، ئەمەی لە هیچ کام لە کرێچییەکانیدا بەرچاو نەکەوتبوو، لەبەر ئەوە نەیدەزانی چۆن وەڵامم بداتەوە."

"پاشان دەستی بەوە کرد، کە کێشەکانی خۆیم بۆ باس بکات، گلەی و گازندەکانی کرێچییەکان، یەکێک لەوانە چواردە نامەی بۆ نووسیبوون، هەندێک لەو نامانە هەر بە شێوەیەکی روون سووکایەتییان تێدا بەدی کرابوو. دانەیەکی دیکە، هەڕەشەی ئەوەی کردبوو، کە بەڵێننامەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە ئەگەر خاوەن ماڵەکە ئەو کابرایەی نهۆمی سەرەوە، لە پرخە پرخ نەوەستێنێت."

گوتی: "چەندە ئاسوودەم، کە کرێچییەکی خاوەن قەناعەتی وەکوو تۆم هەیە" لەدواییدا هەر بێ ئەوەی داوای لێ بکەم، بۆ ئەوەی کرێی خانووەکە کەم بکاتەوە، خۆی بڕیاری کەمکردنەوەیدا، هەرچەندە من دەمویست زیاتر کەمی بکاتەوە، بۆ ئەو نرخەی کە لە ئەستۆم دابوو بیدەم، هەر بەبێ گوتنی یەک وشە، قبوڵی کرد.

"لەوکاتەی دەڕۆیشت، ڕووی تێ کردم و پرسی، چ جۆرە دیکۆرێکت دەوێت بۆ ئەوەی بۆت فەراهەم بهێنم؟"

"ئەگەر منیش بە هەمان شێوەی کرێچییەکانی دیکە، هەوڵی کەمکردنەوەی کرێیەکەم دابا، ئەوا دڵنیا بووم منیش ڕووبەڕووی ئەو شکستە دەبوومەوە وەکوو ئەوان، ئەمە شێوازێکی هاوڕێیانە، دڵسۆزنە و دەستخۆشییانەبوو، کە کایەکەی بردەوە."

***دین وەدکۆک***ی ۆیتسبێرگ، پێنسیلڤانیا، بەڕێوەبەری بەشێک لە کۆمپانیاکانی کارەبای ناوخۆیی، ستافەکەی بانگ کرا، بۆ ئەوەی هەندێک شتی پێویست چاک بکەنەوە لە دینگەیەک، ئەم جۆرە کارە پێشتر نمیاش کرابوو، لەلایەن بەشێکی دیکەوە و، ئێستا بەم دواییە، خرابوویە سەر بەشەکەی ***وەدکۆک***. هەرچەندە تیمەکەی دەربارەی ئەو کارە مەشقیان پێ کرابوو، بەڵام ئەمە یەکەم جاریش بوو، بۆ ئەوەی

هەستن بە کردنی کارێکی لەم شێوەیە. تەواوی ئەندامانی ڕێکخراوەکە حەزیان بەوە دەکرد، کە بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو دۆخەدا بکەن. بەڕێز **ودکۆک** لەگەڵ چەندین کەس، لە بەڕێوەبەرە یارمەتیدەرەکانی و ئەندامانی بەشەکانی دیکەی ڕۆیشتن بۆ بینی دۆخەکە. چەندین ئۆتۆمبێل و لۆری لەوێ بوون و ژمارەیەک خەڵکیش وەستابوون لەدەوروپشتی، سەیری دوو پیاوەکەیان دەکرد لە ترۆپکەی دینگەکەوە.

لەدەوروپشتی دەنواڕی، **ودکۆک** پیاوێکی لەسەر شەقامەکەوە بینی، وا لە ئۆتۆمبێل دادەبەزێت و کامێرایەکی لە دەستدایە و، دەستی کرد، بە وێنەگرتنی ئەم دیمەنە. دەستەی شارەوانی هەر زۆر بە ئەمەک و هۆشن، لەبەرانبەر پەیوەندییە گشتییەکاندا، کتوپڕ **ودکۆک** درکی کرد، کە چۆن ئەم دیمەنە لە دیدگای ئەو کابرایە بە دەردەکەوێت، چ کارێکی کوشندەیە خۆ هەزاران کەس کۆبوونەوە بۆ کردنی کارێکی دوو کەسی، ئیدی ئەویش بەدوای فۆتۆگرافەرەکەدا کەوت لەسەر شەقامەکە.

"دەبینم، کە حەزت لەو هاوکارییەکەی ئێمەیە."

"بەڵێ، دایکم هەر زۆر زیاتر حەزی لێ دەبێت، ئەو خاوەنی بەشە، لە کۆمپانیاکەی تۆدا، ئەمە چاوی ئەو دەکاتەوە، دەکرێت هەر بڕیار بدات، کە داهێنانەکەی ئەو، شتێکی ژیری نەبووە. بۆ ماوەی، چەند ساڵێکە پێی دەڵێم، کە جووڵەیەکی بێبەر لە کۆمپانیای هاوشێوەی ئێوەدا هەیە. ئەمەیش ئەو قسەیە دەسەلمێنێت، دەکرێت ڕۆژنامە نووسەکانیش کەیفیان بەو وێنانەت بێت."

"بەو شێوەیە دەردەکەوێت، وا نییە؟ بە هەمان شێوەیش، دەربارەی پێگەی تۆ بیر دەکەمەوە، بەڵام ئەمە دۆخێکی بێ هاوتایە..." **دین ودکۆک** بەردەوام بوو لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی، کە ئەم جۆرە کارەکە یەکەم کاریان بووە، لە بە شەکەی ئەواندا و، چەندێک خەڵک

خەزی لێی بووە. ئیدی پیاوەکەی دڵنیا کردەوە، کە لەژێر باری هەندێک، هەلومەرجی ئاساییدا ئەوا تەنیا دوو کەس دەیانتوانی مامەڵە لەگەڵ کارەکەدا بکەن. فۆتۆگرافەرەکەیش کامێراکەی لادا و، تۆقەی لەگەڵ **وودکۆک**دا کرد و، سپاسی کرد کاتی پێ بخەشی بۆ ڕوونکردنەوەی دۆخەکە.

شێوازی هاوڕێیانەی، **دین وودکۆک** کۆمپانیاکەی ڕزگار کرد، لە دەست شەرمەزاری و لەکەدارکردنی ناوبانگی.

ئەندامێکی دیکەی بەشداربوو لە خولەکەمدا، **جێرالد ئەیچ وینی** لتلێتۆن، نیو هامپشایەر، باسی ئەوەی کرد، کە چۆن لە ڕێگای پەیڕەوکردنی شێوازێکی هاوڕێیانە، چۆن دڵی **سێلمنت**ی قایلکەری بەدەست خستووە لەبەرانبەر گوتەیەکی خراپدا.

دەڵێت: "لەسەرەتای وەرزی بەهاردا، بەر لەوەی زەوی لە سەهۆڵبەنداندا پاک بێتەوە، بارانێکی قورس باری و ئاو کە بە شێوەیەکی ئاسایی دەڕژایە ناو جۆگەکانەوە و، ئاوەڕۆوە بە درێژایی ڕێگاکە، خولەکەی لەنێو بینایەکی نوێدا کردەوە، کە تازە ماڵێکی نوێم دروست کردبوو.

"ئاوەکە دەرنەدەچوو، پەستانی ئاوەکەیش لە دەوروپشتی ماڵەکە وەستابوو، ئاواکە پاڵی بە خۆیەوە دەنا، بۆ ئەوەی لەژێر کۆنکرێتەکەوە دەربچێت، بەرەو تەقینەوە پاڵی دەنا، ئیدی ژێرخانەکە، پڕ لە ئاو بوو. ئەمەیش بوویە هۆی وێرانبوونی کورەکە و، ئاوگەرمکەرەوەکە. نرخی چاک بوونەوەی ئەم زیان بەرکەوتنە، نزیکەی دوو هەزار دۆلار بوو. ئیدی هیچ بیمەیەکم نەبوو، بۆ ئەوەی ئەو زیانەی پێ چاک بکەمەوە.

"لەگەڵ ئەوەیشدا، کە خاوەنی دابەشکردنی مەنهۆڵەکان، ئەوەی فەرامۆش کردبوو، بۆ ئەوەی ئاوەڕۆیەک لە نزیک خانووەکە دروست

بكات، كە دەبوویە ڕێگر لەبەردەم سەرهەڵدانی کێشەیەکی لەم شێوەیە. وادەیەکم دیار کرد بۆ ئەوەی چاوم پێی بکەوێت، لە ماوەی گەشتێکی بیستوپێنج خولەکی بۆ نووسینگەکەی ئەو، بە وریاییەوە چاوێکم بە دۆخەکەدا خشاندەوە و، بنەماکانم بیر کەوتەوە، لە کەم خولەدا فێریان بووبووم. بڕیارم دا، کە نیشاندانی توڕەیی هیچ خزمەتێک بە دۆخەکە ناکات، کاتێک گەیشتم، هەر زۆر هێمن و لەسەر خۆم بووم، بەوە دەستم بە قسەکردن کرد، دەربارەی ئەوەی، کە بەو دواییانە گەشتێکی بەرەو ویست ئیندیس کردبوو، ئیتر کە هەستم کرد، کاتی باسەکە هاتووە، ئاماژەم بە کێشە بچووکەکەی ئاوەکە و زیانەکەی کرد. بەمەیش دەستبەجێ هاوڕابوو، بۆ ئەوەی پارمەتیدەر بێت لەپێناو ڕاستکردنەوەی کێشەکەدا.

"لەدوای چەند ڕۆژێکی کەم، بانگی کردم و گوتی: 'بڕی پارەی زیانەکە دەدات و ئاوەڕۆیەک دروست دەکات، بۆ ئەوەی ڕێگر بێت لە دووبارە بوونەوەی کێشەیەکی لەم شێوەیە لە داهاتوودا.'

"وەلێ ئەوە هەڵەی خاوەنی دابەشکردنی ئاوەڕۆکان بوو، بەڵام ئەگەر منیش بە شێوەیەکی هاوڕێیانە دەستم پێ نەکردبایە، ئەوا ڕووبەڕووی کەشێکی سەخت دەبوومەوە، بۆ ئەوەی وای لێ بکەم، لەگەڵ من هاوڕا بێت."

چەند ساڵێک لەمەوبەر، کاتێک کوڕێکی پێ پەتی بووم، بە دارستاندا ڕێم دەکرد، بۆ گەیشتنم بە قوتابخانەی لادێکە، لە باکووری ڕۆژئاوای میسۆری، چیرۆکێکی ئافسانەییم خوێندەوە دەربارەی خۆر و با.

ئەم دووانە دەمەتەقێیان بوو، ئاخۆ کامەیان بەهێزترە، با گوتی: "بۆت دەسەلمێنم، کە من بە هێزترم، ئەو پیرە پیاوە دەبینیت، کە چاکەتی بە دەستەوەیە؟ گرەو دەکەم کە خێراتر لە تۆ دەتوانم، ئە وچاکەتی لێ بسەنم."

خۆریش ڕۆیشتە پشت هەورەوە، بایش بەو بەڕی سەختییەوە هەڵی کرد تا خەریک بوو ببێت بە گەردەلوول، بەڵام تا بە هێزتر بووایە ئەوا زیاتر پیرە پیاوەکە چاکەتەکەی لە خۆی دەپێچا.

لە کۆتاییدا، با هیمن بوویەوە و وازی هێنا. لەدواییدا، خۆرەکە لە پشتی هەورەکەوە هاتەدەرەوە و بزەیەکی نەرمونیانی بەڕووی پیاوەکەدا کرد، ئەوەندەی نەخایەند، پیاوەکە بڕۆی سڕی و چاکەتەکەی دانا، پاشان خۆر بە بای گوت کە نەرمونیانی و هاوڕێیەتی هەردەم لە توندوتیژی و هێز، بە هێزترن.

بەکارهێنانی نەرمونیانی و گیانی هاوڕێیەتی، ڕۆژبەڕۆژ، لەلایەن خەڵکانی تێگەیشتووەوە بەدەرکەوێت، کە دڵۆپێک هەنگوین مێشی زیاتر کۆ دەکاتەوە وەکوو لە گالۆنێک زراو.

***ئیف گەیل کۆنەری*** لوسەریل، ماریلاند، ئەمەی سەلماند، کاتێک ئۆتۆمبیلە چوار مانگەکەی بردە بەشی خزمەتگوزری بۆ جاری سێیەم، بە قوتابییەکانی ئێمەی گوت: "وەکوو دایک و باوک وا بوو، بۆ ئەوەی قسەی بۆ بکەیت، یاخود هاوارکردن بەسەر بەڕێوەبەری خزمەتگەزاریەکە هیچ برینێکی زامەکانم تیمار ناکات."

"ئیدی ڕۆیشتم بۆ ژووری پێشەنگاکە و داوام کرد، کە چاوم بە بریکارەکە بکەوێت، بەڕێز ***وایت***، لەدوای چاوەڕێکردنی کەم، منیان بردە نووسنگەکەی بەڕێز ***وایت***، خۆم پێناساند و بۆم ڕوون کردەوە، کە لەژێر ڕابەری ئەودا، ئەو ئۆتۆمبێلەم کڕیووە، لەسەر داوای هاوڕێکانم کە پێشتر مامەڵەیان لەگەڵ ئەمدا هەبووە. پێیان گوتم کە نرخەکانیان زۆر لە کێبڕکێدا بوون و خزمەتەکانیان سەرسوورهێنەر بوون. لە میانەی گوێ گرتنی لە من بزەی قایلکەری بەڕوودا دەکردم، لەدواییدا ئەو کێشەیەم بۆی ڕوون کردەوە، کە لەگەڵ ئەو بەشەی خزمەتگوزاریەدا هەم بوو.

گوتم: "پێم وا بوو، که دەکرێت ئاگاداری هەر دۆخێک بیت، که دەبێته مایەی لێڵ بوونی ناوبانگی تۆ." ئەویش سوپاسی کردم، بەوەی که سەنرجی ئەوم پەلێکێشی دۆخەکه کرد و، منی دڵنیا کردەوە، که کار له سەر کێشەکەی من دەکرێت. نەک هەر ئەو خودی خۆی بەشداری کرد، بەڵکو بگرە ئۆتۆمبێلەکەی خۆشی پێدام، هەتا ئەوەی خۆم چاک دەبێتەوە.

***ئیسۆپ*** کۆیلەیەکی یۆنانی بوو، که له کۆشکی کرۆسس دەژیا و ئەفسانه نەمرەکانی هەڵچنیبوون، به شەشسەد ساڵ بەر له مەسیح. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو ڕاستییانەی که دەربارەی سروشتی مرۆڤەوە، فێریان ببوو ئەوەندە ڕاستییەکانی بۆستۆن و بیرمنیگهام دروست بوون، که ئەوانه به بیستوشەش سەدە لەمەوبەر بەر له ئەسینا بوون. خۆر دەتوانێت چاکەتەکەت لێ داکەنێت خێراتر له با، هەروەها میهرەبانی، شێوازی هاوڕێیانه، سوپاس و پێزانین وا له خەڵک دەکەن، که بریر و هزری خۆیان بگۆڕن زیاتر له هەموو توندوتیژیەک و زەبروزەنگێک.

لەبیرت نەچێت، که ***لینکۆلن*** چی گوتووە: "دڵۆپەیەک هەنگوین مێشی زۆر زیاتر کۆ دەکاتەوە وەکوو له گاڵۆنێک زراو."

**"به شێوەیەکی هاوڕێیانه،**

**دەست به قسەکردن بکه."**

## ڕێگای سێیەم:

## نهێنی سوکرات

لە کاتی قسەکردن لەگەڵ کەسێکدا، بەو بابەتە دەست پێمەکە کە خاڵی جیاوازی نێوانتانە، بەڵکو دەبێت زۆر سوور بیت و پێدا گیری بکەیت، لەسەر ئەو شتانەی، کە خاڵی هاوبەشن و لەسەری کۆکن، دەست بە گفتوگۆ بکەیت، کە ئێوە هەردووکتان یەک ئامانج و مەبەستان هەیە و، تاکە جیاوازییەکیش کە بوونی هەبێت، بریتییە لە هۆکار و شێوازی گەیشتن بەو ئامانجە نەک خودی ئامانج و مەبەستەکە.

وا لە کەسی بەرانبەر بکە، کە هەر لە سەرەتاوە بڵێت: "بەڵێ، بەڵێ،" ئەوەندەی دەتوانی ڕکابەرەکەت لە وشەی "نەخێر" دوور بخەوە.

بە تێڕوانینی پرۆفیسۆ ***هاری ئۆڤەرستریت*** وشەی "نەخێر،" سەختترین کێشەیە، کە بتوانێت بەسەریدا سەرکەوتووبێت. کاتێک مرۆڤ دەڵێت "نەخێر" تەواوی هێزی کەسایەتی لەسەر ئەوە کۆ دەبێتەوە، کە پێداگری لەسەر ئەو وشەیە بکات. دەکرێت دواجار درک بەوە بکەیت، کە وشەی "نەخێر" وەڵامێکی هەڵەیە و خراپە، گوێ مەدەرێ، ئەوە هەستی شانازیکردن بە خودی خۆتە، کە هەر شتێکت گوت، وات لێ دەکات پێداگری لێ بکەیت. لەبەر ئەوە زۆر گرنگە، کەسێک بە ڕوویێکی ئەرێنییەوە بێتەگۆ.

قسەکەری لێزان، ئەو کەسەیە، کە هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵێک وەڵامی "بەڵێ" لەبەرانبەرەکەیەوە دەبیستێت، چون لەم حاڵەتەدا، پرۆسەی باری دەروونی گوێگر بەرەو بارێکی ئەرێنییەوە کەمەندێش دەکات. ئەمەیش لە جووڵەی تۆپی بلیارد دەچێت. بەرەو هەر ئاڕاستەیەکی لێ دەدەیت، هێزی لادان و دوورکەوتنەوە دەگرێتە بەر، هێزێکی زیاتری دەوێت، بۆ ئەوەی بۆ ئاڕاستەی بەرانبەری بگەڕێنێتەوە.

دیدگا دەروونییەکان، لێرەدا تەواو ڕوون و ڕەوانن، کاتێک کەسێک دەڵێت: "نەخێر" و هەر بە جدی مەبەستییەتی، ئاوا شتێکی زیاتری گوتووە، تەنیا لە وشەیەکی چوار پیتی، چونکە تەواوی ئەندامەکانی – ئەندامی دەردەر، دەمار و ماسولکەکانی– کۆ دەبنەوە بە یەکەوە، بەرەو دۆخێکی بەرهەڵستیکردن. عادەتەن خولەکێک هەیە، هەندێک جار بە شێوەیەکی دیار، پەشیمانییەکی جەستەیی یاخود جۆرێک، لە ئامادەباشی بوونی هەیە بۆ پەشیمانبوونەوە. تەواوی دەمارە ماسولکەییەکان، لە ماوەیەکی کەمدا، ئامادە باشی دەکەن، بۆ قبوڵکردن.

بەڵام کاتێک مرۆڤ پێچەوانەی ئەمە دەکات، کاتێک کەسێک دەڵێت: "بەڵێ،" هیچ کام لەو چالاکییە جەستەییانە ناکەونە ئامادە باشییەوە، بەڵکو ئەندامەکان ئامادە کاری دەکەن، بۆ ڕۆیشتنە پێشەوە و، قبوڵکردن، کرانەوەی تێڕوانین و دیدگا. بەمەیش، هەتا چەندێک وشەی "بەڵێ" بەدەست بهێنین، لە سەرەتاوە، ئەوەندە زیاتر سەرکەوتن بەدەست دەهێنین و کەسی بەرانبەر بەڕووی خۆماندا پەلکێش دەکەین.

تەکنیکێکی هەر زۆر سادەیە، وەڵامی ئەرێنی بەڵێ، لە کاتێکدا هەر زۆر فەرامۆشکراوە! بە جۆرێک بەدەردەکەوێت، وەکوو بڵێی، کە خەڵک هەستی گرنگی فەراهەم دەهێنێت بە دوژمانەیەتیکردنی، لەگەڵ کەسی بەرانبەردا لە سەرەتاوە.

وا لە قوتابییەک بکە، کە هەر لە سەرەتاوە بڵێت "نەخێر" یاخود وا لە کڕیارێک، منداڵێک، مێردەکەت، خێزانەکەت بکە، حیکمەت و سەبری فریشتەکان دەوێت، بۆ ئەوەی دیدگای ئەو کەسە لە بارێکی نەرێنییەوە، بگۆڕیت بۆ کەشێکی ئەرێنی و بڵێت "بەڵێ".

سوودی تەکنیکی گوتنی؛ "بەڵێ، بەڵێ،" وای لە ***جەیمز ئیمبەرسۆن*** کرد، بەڕێوبەری بانکی گرینویچ سەیڤینگ، لە نیو یۆرک، توانی وا لە کڕیارێک بکات کە بمێنێتەوە.

بەڕێز ***ئیبێرسۆن*** دەڵێت: "ئەم کابرایە هاتە بانک، بۆ ئەوەی حسابی بانکی بکاتەوە، منیش فۆرمێکی ئاسایم خستە بەردەستی، بۆ ئەوەی پڕی بکاتەوە، بە حەزەوە هەندێک لە پرسیارەکانی وەڵامدایەوە، بەڵام بە شێوەیەکی ڕەها ڕەتی کردەوە، وەڵامی پرسیارەکانی دیکە بداتەوە.

"بەر لەوەی لێکۆڵینەوە و خوێندن بکەم، دەربارەی پەیوەندییە مرۆییەکان، هەر کەسێک ئامادەیی تێدا نەبێت، ئەو زانیاریانە پڕ بکاتەوە ئەوا مافی کردنەوەی حسابی بانکیشی نابێت، ئێستا هەست بە شەرم دەکەم، کە شتێکی لەم شێوەم لە ڕابردوودا کردووە. بە شێوەیەکی ئاسایی، ئامۆژگارییەکی لەم شێوەیە وای لێ کردم، هەست بە باشی بکەم. بەو کابرایەم نیشاندا، کە کێ بەڕێوەبەرە و، ڕێسا و یاساکان چین، کە ناکرێت هیچ کەسێک گاڵتەیان پێ بکات. بەڵام ئەم جۆرە بیرکردنەوەم، هیچ بۆنێکی قبوڵکردن و، گرنگی لێوە نەهات، بۆ ئەو پیاوەی کە هاتبوو پشتگیری خۆییمان پێشکەش بکات.

"ئیدی ئەم بەیانییە، بڕیارم دا، کە کەمێک لە ژیری ئەسپ بەکار بهێنم، بڕیارم دا، کە دەربارەی ئەوە قسە نەکەم، کە بانک چی دەوێت. سەرباری هەموو شتێکی دیکە، لەسەر ئەوە سوور بووم، کە وا لەو کابرایە بکەم بڵێت: 'بەڵێ،' هەر لە سەرەتاوە. بەمەیش لەگەڵ ئەو کۆک بووم، پێم گوت کە ئەو زانیارییەی کە ڕەتی کردووەتەوە پێمان بدات لە ڕاستیدا بە ئەندازەیەکی پێویست گرنگ نییە.

"لەگەڵ ئەوەیشدا، گوتم، با وا دابنێین کە لەدوای مەرگی تۆدا، تۆ پارەت لەم بانکەدا هەبێت، ئایا حەز ناکەیت ئەو پارەیە، لەدوای تۆ بدرێت بە یەکێک لە خزمەکانت، ئەو کەسە کێیە، کە دەبێت بە گوێرەی یاسا پارەکەی پێ بدرێت؟"

ئەویش وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، بێگومان."

بەردەوامبووم: "پێت وا نییە، کە ئەوە بیرۆکەیەکی باش دەبێت، ئەگەر تۆ ناوی خزمێکی خۆت بە ئێمە بدەیت، لە حاڵەتێکدا ئەگەر، تۆ مردیت بیدەین بەو کەسە، بەمەیش ئێمە دەتوانین هیواکان و ئارەزووەکانت بهێنینەدی بەبێ بوونی هیچ هەڵەیەک و دواکەوتنێک."

دووبارە گوتی: "بەڵێ."

"بەمەیش بیرکردنەوە کابرا لاوەکە، ڕووی لە نەرمی کرد و گۆڕدرا، کاتێک درکی کرد کە ئێمە لەبەرخاتری خۆمان داوای زانیاری ناکەین، بەڵکو ئەمە لەپێناو ئەودایە. بەر لەوەی بانکەکە بەجێ بهێڵێت، ئەو کابرایە نەک هەر زانیاری تەواوی پێدام دەربارەی خودی خۆی، بەڵکو بگرە لەسەر پێشنیازی من، حسابێکی متمانەپێکراوی بە ناوی دایکی کردەوە، بۆ ئەوەی لێی سوودمەند بێت، بەمەیش تەواوی وەڵامی ئەو پرسیارانەی دایەوە، کە وابەستەی دایکی بوون."

"درکم کرد کە وام لە ئەو کرد، بڵێت 'بەڵێ، بەڵێ' هەر لە سەرەتاوە، ئیدی هەموو هەستەکانی لەبیر چوویەوە و، دڵخۆش و شادمان بوو، بە کردنی ئەو شتانەی کە من داوام لێی کردبوو."

***جۆسێف ئەلیسۆن*** لە کۆمپانیای ویستین هاوس ئەلیتریک، کاری فرۆشیاری دەکرد، ئەم چیرۆکەکەی هەیە، بۆ ئەوەی بۆمان بگێڕێتەوە: "لە ناوچەی ئێمەدا کابرایە هەبوو، کە کۆمپانیاکەمان حەز دەکات، شتی پێ بفرۆشێت، بەر لە من بە ماوەی دە ساڵ، هەوڵیان لەگەڵدا دابوو، بەڵام نەیاتوانی بوو، هیچی پێ بفرۆشن، لەدوای ئەوەی من ئەرکی ئەو ناوچەیەم وەرگرت، بۆ ماوەی سێ ساڵ سەردانی ئەویم دەکرد، بێ ئەوەی یەک داوای لێ بکەم. لە کۆتاییدا لەدوای تێپەڕبوونی سیانزە ساڵ، لە پەیوەندیکردن و قسەکردن لەگەڵی دەربارەی کڕین و فرۆشتن، توانیمان چەند بزوێنەرێکی پێ بفرۆشین.

ئەگەر ئەمانەی بە دڵ بوایە و پێی باش بوونایە، بە تێڕوانینی خۆم، دڵنیابووم چەندانەیەکی دیکەشی داوا دەکرد.

"دروستە؟ من دەمزانی، کە ئەوانەی بە دڵ دەبن، کاتێک لەدوای سێ هەفتەی دیکەدا پەیوەندییم پێوە کرد، هەستم دەکرد، بەرەو لووتکەی سەرکەوتن ملی ڕێگام گرتووەتەبەر."

"ئەندازیارەکە بە هەستێکی شۆکەوە بەرەو ڕووی من، هات و گوتی: 'ئەلیسۆن، چی دیکە ناتوانم ئەو بزوێنەرانەت لێ بکڕم.'"

بە هەستێکی سەرسووڕمانەوە لێم پرسی: "بۆچی؟ بۆچی؟"

"لەبەر ئەوەی بزوێنەرەکانی تۆ، زۆر گەرمن، بە جۆرێک هەر ناتوانم دەستیان لێ بدەم."

"گوتم، زۆر باشە، بەڕێز سمس، سەد لە سەد لەگەڵ تۆدا هاوڕام، ئەگەر ئەو بزوێنەرانە زوو گەرمدادێن، ئەوا پێویست ناکات، یەک دانەی دیکەش بکڕیت، تۆ دەبێت بزوێنەری ئەوتۆ بکڕیت، کە پلەی گەرمییەکەی بەرزتر نەبێت، لە پلەی گەرمی بزوێنەرەکانی یەکێتی نیشتیمانی بۆ پیشەسازییە ئەلتۆرنییەکان، مەگەر وانییە؟"

"ئەویش هاوڕابوو، منیش بەمە، یەکەم وەڵامی ئەرێنی 'بەڵێ'م بەدەست خست."

"تێکڕای پلەی گەرمی لای یەکێتی نیشتیمانی بۆ پیشەسازییە ئەلتۆرنییەکان، پێویستە ٧٢ پلەی فەهرنهایت بێت، لە سەرووی پلەی گەرمی ژوورەکە، درووستە؟"

هاوڕابوو: "بەڵێ، ئەوە زۆر دروستە، بەڵام بزوێنەرەکانی تۆ، هەر زۆر گەرمترن."

"دەمەتەقێم لەگەڵی نەکرد، تەنیا پرسیم، 'پلەی گەرمی ژووری کارگەکە چەندە؟'

گوتی؛ "ئەها، نزیکەی ٧٥ پلەی فەهرنهایتە"

وەڵامم دایەوە: "باشە، ئەگەر پلەی گەرمی ئەو ژوورە ٧٥ پلەی فەهرنهایت بێت، ئەوا ٧٢ پلەی بزوێنەرەکەیشی بخەسەر، بەمەش تێکڕای گەرمی دەکاتە ١٤٧ پلەی فەهرنهایت. دەستت داناپڵۆخێت ئەگەر بە گیرەیەک بیگریت."

دووبارە گوتی: "بەڵێ."

پێشنیازم کرد؛ "باشە، ئایا بیرۆکەیەکی باش نابێت، بۆ ئەوەی دەستت لەو بزوێنەرانە دووربخەیەوە؟"

ئەویش قبوڵی کرد: "زۆر باشە، پێم وایە ڕاست دەکەیت."

بۆ ماوەیەک لە قسەکردن بەردەوام بووین، لەدواییدا بانگی سکتێرەکەی کرد و بڕی سی‌وپێنج هەزار دۆلاری پێدام، بۆ ئەوەی بای ئەو پارەیە شتی بۆ بهێنم لەو مانگەکەدا.

"چەندان ساڵ، هەزاران دۆلار، لە کیس چوو بەر لەوەی تێبگەم کە دەمەتەقێ هیچی لێ شین نابێت، بەڵگو بگرە شتەکان زۆر سوودبەخشتر و خۆشتر دەبن، ئەگەر لە دیدگا و تیڕوانینی کەسی بەرانبەرەوە، لە کەشەکە بنواڕیی و وا لە کەسی بەرانبەر بکەیت، کە بڵێت :بەڵێ بەڵێ."

***ئێدی سنۆو***، کە سپۆنسەری خولی ئێمە بوو، لە ئۆکلاند، کالیفۆڕنیا، ئەوەمان بۆ باس دەکات کە چۆن بوو، بە کڕیارێکی باشی دوکانێک، ئەمەیش لەبەر ئەوەی کە خاوەنکارەکە بەرەو وشەی "بەڵێ"ـی پەلکێش کردووە.

***ئێدی*** حەزی بەمە دەکرد و، بڕەپارەیەکی زۆری لە پێداویستییەکانیدا سەرف دەکرد لەو دوکانەدا، کاتێک براکەی سەردانی دەکرد، دەیوست لەو دوکانەدا، تیر و کەوان بۆ براکەی بەکرێ بگرێت، فرۆشیاری

دوکانەکە پێی گوت، ئەوان تیر و کەوان بە کرێ نادەن، بەمەیش ئێدی پەیوەندیی بە دوکانێکی دیکەوە کردوو، بەم شێوەیە وەسفی دەکات کە چی ڕووی داوە:

"کەسێکی هەر زۆر ڕووخۆش، وەڵامی پەیوەندییەکەمی دایەوە، وەڵامی ئەو لەبەرانبەر پرسیارەکەی مندا هەر زۆر جیاواز بوو، بە بەراورده بە وەڵامی پیاوەکەی دیکە. گوتی: 'بەداخەوەم، بەڵام ئێمە چی دیکە، کەوان بە کرێ نادەین، چونکە ئەمە لە توانای ئێمەدا نییە.' لەدواییدا، لێی پرسیم، کە ئەگەر پێشتر داوام لێ بکردنایە. ئێدی منیش وەڵامم دایەوە، 'بەڵێ، چەندین ساڵ لەمەوبەر.' بیری خستمەوە، کە دەشێت من بڕی ٢٥ بۆ ٣٠ دۆلارم بەو کرێیە دابێت تا ئێستا. دووبارە گوتم: 'بەڵێ.' پاشان لێی پرسیم، ئەی ئەگەر ئەو جۆرە کەسە بوویتایە و پارەت پاشەکەوت بکردایە. هەر بە شێوەیەکی سروشتی وەڵامم دایەوە: 'بەڵێ.'

"بەردەوام بوو لە ڕوونکردنەوە و گوتی کە تاقمی کەوانەیان هەیە بە تەواوی پێداویستییەکاندەوە بۆ فرۆشتن بە بڕی ٣٤.٩٥ دۆلار. منیش دەمتوانی دانەیەکی کامل بکڕم بە بڕی ٤.٩٥ دۆلار زیاتر لە بڕی کرێ. ئەوەشی ڕوونکردنەوە، کە هەر لەبەر ئەمە ئەوان چی دیکە کەوان بە کرێ نادەن. ئایا ئەوە لە دیدگای منەوە شتێکی مەعقول بوو؟ ئێدی وەڵامەکانی من بە دەم 'بەڵێ'ـوە بەرەو کڕینی تاقمێک کەوان ڕێی کرد، کاتێک هەڵم گرت، شتگەلێکی دیکەشم هەر لەو دوکانە کڕی، بگرە هەر لەو کاتەوە بووم بە کڕیارێکی هەمیشەیی.""

سوکرات، بە ئاگاخەرەوەی ئەسینابییەکان، یەکێک بوو لە مەزنترین فەیلەسووفەکان، کە جیهان بە خۆیەوە بینیبوو، شتێکی ئەوتۆی کرد، کە کەم کەس لە مێژوودا دەیانتوانی ئەوە بکەن، تەواوی دیگا و بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی گۆڕی، ئێستا لەدوای تێپەڕبوونی بیستوچوار سەدە بەسەر مەرگی ئەودا، ڕێز و شکۆی لێ دەگیرێت،

بەوەی کە ژیرترین مرۆڤ بووە، بەوەی کە توانیویەتی قەناعەت بە کەسی بەرانبەری بکات و، کاریگەری لەسەر ئەم جیهانە ئاڵۆزە دابنێت.

شێوە و شێوازی ئەو چۆن بوو؟ ئایا بە خەڵکی گوتبوو کە ئەوان هەڵەن؟ ئەها، نەخێر، سوکرات ئەو کارەی نەکردووە. بەڵکو هەر زۆر لەمە دروور بووە، کە شتێکی لەم شێوەیە بڵێت. تەواوی تەکنیکی ئەو، کە ئێستا بە "شێوازی سوکرات" ناسراوە، لەسەر بنەمای "بەڵێ، بەڵێ" سەرچاوەی گرتووە. پرسیارگەلێکی ئەوتۆی دەکرد، کە ڕکابەرەکانی لەگەڵیدا هاوڕا بن. بەرانبەرەکانی ئەوەندە لەگەڵیدا هاوڕابوون، کە دنیایەک "بەڵێ"ی کۆ کردبوویەوە. بەردەوام پرسیارگەلێکی دەکرد، کە ڕکابەرەکانی لەگەڵیدا هاوڕا بن، بەبێ ئەوەی هەر درک بکەن، کە بە چەند خولەکێک لەمەو بەر نکۆڵی لێی کردووە.

جارێکی دیکە، ئەگەر ویستمان بە کەسێک بڵێین هەڵەیە، با سوکراتمان لەبیر بێت و پرسیاری نەرم نیان بکەین، جۆرە پرسیارێک کە وەڵامەکەی "بەڵێ" بێت.

چینییەکان پەندێکیان هەیە، کە پڕە لە دانایی ڕۆژهەڵاتییەکان: "هەر کەسێک بە نەرمونیانی بیرکردنەوە و ڕەفتار بنوێنێت، ئەوا ڕێگایەکی دوورودرێژتر دەبڕێت."

ئەوانە، پێنج هەزار ساڵ، لێکۆڵنەوەیان لەسەر سروشتی مرۆڤ کردووە، ئینجا پێیان خستووەتە ئەم قۆناغەی ژیرییەوە: "هەر کەسێک بە نەرمونیانی بیرکردنەوە و ڕەفتار بنوێنێت، ئەوا ڕێگایەکی دورودرێژتر دەبڕێت."

**"وا لە کەسی بەرانبەر بکە،**

**دەستبەجێ بڵێت: "بەڵێ."**

## ڕێگای چوارەم

## چۆن گیانی هاوکاری بەدەست دەخەیت

ئایا زیاتر بڕوات بەو بیرۆکانە نییە، کە لەلایەن خۆتەوە سەرچاوە دەگرن، وەکوو لەو بیرۆکانەی کە لەسەر سینییەکی زیو پێشکەشت دەکرێن؟ ئەگەر وایە، ئایا بڕیارێکی نەشیاو نییە، ئەگەر تێڕوانینی خۆت بەسەر هی خەڵکیدا بسەپێنیت؟ باشتر نییە، ئەگەر تەنیا پێشنیار بکەی، لێی گەڕێی کەسی بەرانبەر خۆی بیر لە دەرەنجامەکان بکاتەوە؟

***ئەدۆلف سێلتزی*** فیلادێلفیا، بەڕێوەبەری فرۆشتنە لە پێشەنگادا، لە یەکێک لە خولەکانم قوتابییم بوو، کتوپڕ درکی کرد، کە وا ڕووبەڕووی کەشێک بووەتەوە، کە دەبێت هەستێکی پڕ لە گەرموگوڕی بخاتەوە نێوان فرۆشیارانی ئۆتۆمبێل، کە ڕووی لە بێورەیی و نارێکی کردبوو. بەمەیش داوای ڕێک خستنی کۆبوونەوەیەکی کرد، هانی خەڵکەکەی خۆیدا، بۆ ئەوەی کتومت پێی بڵێن، ئاخۆ چییان لە ئەم چاوەڕێ کردووە. هەر کە ئەوان قسەیان دەکرد، ئەویش تێبینی و تێڕوانینەکانی ئەوانی لەسەر تەختە دەنووسی.

لەدواییدا گوتی: "تەواوی ئەو شتانەتان بۆ دەستەبەر دەکەم، کە لە منی داوا دەکەن، ئێستا بفەرموون، کە من دەبێت چی لە ئێوە چاوەڕێ بکەم." ئیدی وەڵامەکانی بە خێرایی درانەوە: "دڵسۆزی، ڕاستگۆیی، گەشبینی، گیانی هاوکاری، ڕۆژانە هەشت کاتژمێر کارکردن بە جۆشوخرۆشەوە." کۆبوونەوەکە کۆتایی پێهات بە دڵێرییەکی نوێوە، ئیلهامێکی تازەوە، خۆبەخشێک لەنێویاندا پەیدابوو، کە دەویست چوارده کاتژمێر لە ڕۆژێکدا کار بکات، بەڕێز ***سێلتز*** پێی گوتم، کە

بڕی فرۆشتن لەدوای ئەو کۆبوونەوەیە بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە.

بەڕێز *سیلتز* گوتی: "ئەو پیاوانە پەیمانێکی ئەخلاقیان بە منداوبوو، ئەوەندەی خۆم لەسەر ئەو پەیمانە بەردەوام بوون، ئەوان پێداگریان لەسەری دەکرد و، دەستیان پێوە دەگرت. ڕاوێژکردنیش دەربارەی هیوا و حەزەکانیان، شتێک بوو کە بە ڕاستی پێویستیان پێی بوو."

هیچ کەسێک بوونی نییە، کە حەز بکات کە شتێکی پێ فرۆشراوە، یاخود پێی بگوترێت ئەو کارە بکە، بەڵکو زیاتر ئێمە حەز بە ئەوە دەکەین، کەوا خۆمان ئەو شتە دەکڕین و لەسەر ڕێڕەوی بیرۆکەکانی خۆمان ڕێ دەکەین. حەز دەکەین ڕاوێژمان پێ بکرێت لەبەرانبەر هیواکانمان، ویستەکانمان و، تێڕوانین و بیروبۆچوونەکانمان.

سەیری حاڵەتی *ئیجن ویسۆن* بکە، ئەم پیاوە هەزاران دۆلاری لە دەستدا، بەر لەوەی فێری ئەم ڕاستییە بێت. بەڕێز *ویسۆن*، لە ستۆدیۆ کاری دەکرد، کە دیزانی پۆشاکی بۆ بازرگانەکان دەکرد، بۆ ماوەی سێ ساڵ هەفتەی جارێک سەردانی دیزایینە بەناوبانگەکانی نیو یۆرکی دەکرد.

بەڕێز *ویسۆن* گوتی: "هەرگیز دیدەنی منی ڕەت نەکردووەتەوە، وەلێ هەرگیز هیچی لێ نەکڕیووم، هەردەم بە وریاییەوە سەیری دیزایینەکەی منی دەکرد و لەدواییدا دەیگوت: 'نا، ویسۆن، وا هەست ناکەم، ئەمڕۆ لەسەر هیچ شتێک ڕێک بکەوین.'"

لەدوای سەدوپەنجا جار شکستخواردن، ئەوجا *ویسۆن* درکی بەوە کرد، کە دەکرێت لە کەشێکی تێکچوونی بیروبۆچوونیدا بێت، لەبەر ئەوەی بڕیاردا هەفتانە ئێوارەیەک تەرخان بکات، بۆ ئەوەی لەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤ و، پەرە بە تێڕوانینی نوێ و، فەراهەمهێنانی جۆشوخرۆش بدات.

بڕیاری لەسەر پەیڕوکردنی شێوازێکی نوێدا، لە کاتێکدا نیوەی دیزاینی تەواونەکرا هێشتا هەر لەبەردەستیدا بوو، خۆی کرد بە نووسینگەکەدا و گوتی: "دەمەوێت کەمێک یارمەتیم بدەیت، ئەگەر دەتوانیت، هەندێک دیزاینی تەواونەکراوم لایە، دەتوانی پێم بڵێی، کە چۆن تەواویان بکەم بە جۆرێک لەگەڵ ویستی تۆدا و ئەدای بەکارهێنانی تۆدا بگونجێن؟"

کاکی کڕیار ماوەیەکی زۆر، سەیری دیزاینەکانی کرد هەر بەبێ ئەوەی یەک وشە بڵێت. لە کۆتاییدا گوتی: "ویسۆن، ئەمانە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لەلای من بەجێ بهێڵە، پاشان سەردانم بکەرەوە."

*ویسۆن* لەدوای سێ ڕۆژ گەڕایەوە، تەواوی پێشنیارەکان و دیزاینەکانی لەگەڵ خۆی برد بۆ ستۆدیۆ، بەگوێری دیدگای کڕیارەکان دیزاینەکانی تەواو کرد. بەڕێز *ویسۆن* گوتی: "ئێستا دەزانم، کە بۆچی بۆ ماوەی چەند ساڵێکە شکستم لە فرۆشتنی ئەوانە خواردووە، هۆکارەکەی ئەوە بووە، کە من خۆم بە تێڕوانینی خۆم، داوام لێی کردووە کە چی بکڕێت نەکوو بە گوێرەی بیروبۆچوونی کڕیار. لەدوای ئەمە هەر بە تەواوی شێوازی خۆم گۆڕیی و هانمدا، بۆ ئەوەی بیروبۆچوونەکانی خۆییم بە ڕوودا واڵا بکات. ئیدی ئەمەیش وای لێ کرد کە بە جۆرێک هەست بکات، کە خۆی دیزاینەکان دەنەخشێنێت و، هەروایشی کرد، هەر پێویست نەبوو ئەوانەی پێ بفرۆشم بەڵکو ئەو خۆی دەیکڕین."

ڕێگەدان بە کەسی بەرانبەر، کە بیروبۆچوونەکە هی خۆیەتی، تەنیا هەر لە بازرگانی و سیاسەتدا کار ناکات، بەڵکو بگرە لە ژیانی خێزانیشدا کاریگەری خۆی دەبێت. *پۆل ئێم. داڤیس*ی تولسا، ئۆکلاهۆما، بە قوتابیەکانی گوت، کە چۆن ئەم پەیرەوی ئەم بنەمایە دەکات:

"من و خێزانەکەم چێژمان لە یەکێک لە پشووەکانمان بینی، کە تا ئێستا گەشتێکی لەم شێوەیەمان کردبێت، خەونێکی لە مێژینەم بووە، کە بە شوێنە مێژووییەکان و کێڵگەکانی شەڕی ناوخۆدا گەشت بکەم لە گێتسبێرگ. هۆڵی سەربەخۆ لە فیلادێلفیا و، پایتەختی وڵات، دۆڵی فۆرج، جەیمزتاون، هەروەها دۆڵی ڕزگارکراوی ولیەمسبێرگ لە ڕیزی پێشەوەی لیستی ئەو شوێنانەوە بوو، کە دەمویست بیان بینیم.

"لە مانگی ئازاردا، خێزانەکەم، *نانسی*، ئاماژەی بەوە کرد، کە ئەویش تێڕوانینی خۆی هەیە بۆ پشووی هاوینەمان، کە گەشتێک بوو بەرەو ویلایەتەکانی خۆرئاوا. سەردانکردنی شوێنەکانی نێو مەکسیکۆ، ئەرزۆنا، کالیفۆرنیا و نیڤادا. چەند ساڵێک بوو خولیای ڕەخساندی ئەم گەشتەبوو، بەڵام بە ڕوونی بدوێم، ئێمە نەمان دەتوانی هەردوو گەشتەکە بکەین."

"کچەکەشمان، *ئانی*، تازە خولێکی لە مێژووی ئەمریکا لە ئامادەیی تەواو کردبوو و، زۆر بە خۆشحاڵی و تامەرزرۆە گەڕابووویەوە ماڵەوە بەدیار ڕووداوەکانی بەرەو پێشەوە چوونی وڵاتەکەمان. لێم پرسی ئاخۆ حەز دەکات سەردانی ئەو شوێنانە بکات، کە دەربارەیان فێربووە لە پشووی داهاتوومان‌دا. ئەویش لە وەڵامدا گوتی، کە حەزی پێ دەکات."

"لەدوای تێپەڕبوونی دوو ئێوارە، هەر کە لە دەوری مێزی نانخواردن دانیشتبووین، *نانسی* گوتی: 'ئەگەر ئێمە هەموومان کۆک و هاوڕا بین و، پشووی هاوینەمان بەرەو ویلایەتەکانی خۆرئاو بێت، ئەوا گەشتێکی زۆر ناوازە دەبێت، بۆ *ئانی* و، بگرە بۆ هەموومان خۆشی و شادی دەبێت،' ئیدی ئێمەیش هەموومان لەگەڵی هاوڕا بووین."

ئەم سایکۆلۆژیە لەلایەن دروستکەری تیشکی ئێکس بەکار هاتووە، بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی خۆی بە یەکێک لە نەخۆشخانە گەورەکانی بڕۆکلین بفرۆشێت.

نەخۆشخانەیەک بەشێکی تازەی کردبوویەوە و، دەیوست باشترین پێداویستییەکانی ئەمریکا لەو بەشەدا بوونیان هەبێت. دکتۆر *ئێل* کە بەرپرسی بەشی تیشکی نەخۆشخانەکە بوو، هەر تەواو بێزار ببوو، لەدەست هەموو ئەو فرۆشیارانەی کە سەردانیان دەکرد، هەر یەکێک لە ئەوان بەرهەمەکانی کۆمپانیاکەی خۆی دەخستە بەردەمی.

یەکێک لەو فرۆشیارانە، زۆر کارامە و لێزان بوو، زیاتر لە ئەوانی دیکە، دەیزانی کە چۆن مامەڵە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ بکات، نامەیەکی لەم شێوەیەی نووسی:

بەم دواییانە کارگەکەمان کەلوپەلێکی نوێی تیشکی دروست کردووە، بڕی یەکەمی ئەو ئامێرانە تازە گەیشتوون بە نووسینگەکەمان، ئەوانە کامڵ و بێخەوش نین، ئێمەیش ئەوە دەزانین و، دەمانەوێت بەرەو پێشەوەیان بەرین. زۆر سوپاستان دەکەین ئەگەر سەردانمان بکەن و تێڕوانینی خۆتانمان پێ بگەیەنن، دەربارەی ئەوەی، کە چۆن دەکرێت بە شێوەیەکی باشتر و ناوازەتر دروست بکرێن، دەزانم، کە چەندێک ئێوە سەرقاڵن بەڵام من خۆشحاڵ دەبم، کە ئۆتۆمبێلەکەم بەدواتدا بنێرم لە هەر کاتێکدا ئێوە حەز بکەن.

دکتۆر *ئێل* هەر کە ئەو ڕووداوەی لەبەردەم قوتابییەکان دەگێڕایەوە، گوتی: "هەر سەرسام بووم، کە ئەم نامەیەم پێ گەیشت، من هەم سەرسام بووم، هەمیش سوپاسگوزار بووم، چونکە هەرگیز پێشتر نەم بینیبوو، کە دروستکەرێکی تیشک، ویلّ بێت بەدوای ئامۆژگاریدا. وای لێ کردم هەست بە گرنگی بکەم، ئەو هەفتەیە تەواوی شەوەکان سەرقاڵ بووم، بەڵام وادەیەکی خوانی ئێوارەم ڕەت کردەوە، بۆ ئەوەی سەرێک لەو کەلوپەلانە بدەم. هەتا زیاتر لێی وردە دەبوومەوە، زیاتر هەستم دەکرد، کە حەزم لەو ئامێرانە بێت."
"هیچ کەسێک هەوڵی نەدەدا پێم بفرۆشێت، بە جۆرێک هەستم دەکرد، کە خۆم ئەو پێداویستییانە بۆ نەخۆشخانەکەی خۆم دەکڕم، ئیدی

ئەوەندە باش بوون و منیش لێم کڕین و داوام لێ کردن، بۆ ئەوەی بۆم بگوازنەوە."

***ڕالف والدۆ ئیمێرسن***، لە گوتارەکەیدا، بەناوی "پشت بە خود بەستن" دەڵێت: "لە بوونی هەر کارێکی بلیمەتانەدا، درک بە بیرۆکەی ڕەتکراوەمان دەکەین، ئەو بیرۆکانە بە هەستێکی پڕ لە ڕەنجانەوە دێنەوە لامان."

کۆلۆنێل ***ئێدوارد ئێم هاوس***، کاریگەرییەکی باشی بە کارامەیی بەرجەستە کردووە لە کاروبارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان لە کاتێکدا ***ودرۆو ویلسن***، لە کۆشتی سپیدا سەرقاڵ بوو. ***ویلسن*** بە شێوەیەکی نهێنی ڕاوێژی بە کۆلۆنێل ***هاوس*** دەکرد و، داوای ئامۆژگاری دەکرد زیاتر لەوەی کە پەیڕەوی دەکرد، بەسەر ئەندامانی کابینەکەی خۆیدا.

ئێ ئەوە چ شێوازێک بوو، کە کۆلۆنێل پەیڕەوی دەکرد، بە جۆرێک کاریگەری لەسەر سەرۆک هەبوو؟ خۆشبەختانە، ئێمە دەزانین، ***هاوس*** خۆی ئەمە بۆ ***ئاسەر دی هاودین سمیس*** درکاندبوو، ***سمیس*** ئەمەی لە گوتارێکدا بەیان کردبوو بەناوی "بڵاوکراوەی ئێوارانی یەکشەممە."

***هاوس*** دەڵێت: "لەدوای ئەوەی ئاشنانی سەرۆک بووم، فێری ئەوە بووم، کە بیرۆکەیەک لە بیروهزری ئەودا بە شێوەیەکی ئاسایی بڕوێنم، بەڵام بە جۆرێک کە ئەویش حەزی لێی بێت، بە جۆرێک کە وای لێ بکەم، ئەو خۆی بیری لێی بکاتەوە. یەکەم جاریش کە ئەمە کاری خۆی کرد، لە ڕووداوێکدا بوو، کە لە کۆشکی سپی سەردانی ئەوم کردبوو، بەرەو سیاسەتێک هانمدا، کە وا دیار بوو بەلایەوە پەسند نەبێت. بەڵام چەندین ڕۆژ لەدوای ئەو کاتە، لە دەوری مێزی خوانی ئێوارە دانیشتبووین، بەوە سەرسام بووم، کە وا ئەو پشنیارەکەی من بە بیرۆکەیەکی خۆی بەیان دەکات."

ئایا ***هاوس*** قسەکانی بە سەرۆک بڕی و پێی گوت: "ئەوە بیرۆکەی خۆت نییە و، هی منە؟ ئاهـ نەخێر، ***هاوس*** ئەوەی نەکرد، بەڵکو هەر زۆر پێی خۆشحاڵ بوو. هیچ گرنگی بە متمانە نەدەدا، بەڵکو ئەنجامەکانی دەویست، بۆیە ڕێگەی بە ***ویلسن***دا، بۆ ئەوەی لەسەر ئەوە بەردەوام بێت، کە ئەو بیرۆکەیە هی خۆیەتی. ***هاوس*** بگرە زۆر زیاتر لەوەی کرد، ئیدی متمانەیەکی گشتی بە ***ویلسن***دا، لەبەرانبەر ئەو بیرۆکانە.

با ئەوەمان لەبیر نەچێت، کە هەر کەسێک ئێمە لە ڕوویەوە دێین، ئەوا وەکوو ***ودرۆو ویلسن*** مرۆڤە، کەوایە با تەکنیکی کۆلۆنێل بەکار بهێنین.

پیاوێک لە هەرێمێکی جوانی کەنەدا، نیو برەنسویک، پەیڕەوی ئەم تەکنیکەی کرد، لەسەر من و پشتگری منی بۆ خۆی مسۆگەر کرد. لەو کاتەدا پلانم دانا، بۆ ئەوەی ڕاوەماسی بکەم و، بە بەلەمە کانۆکەم بچم بۆ نیو برەنسویک، ئیدی نامەیەکم بۆ نووسینگەی گەشتکردن نووسی، بۆ ئەوەی زانیاریم پێ بدەن، بەمەتەش ناوی خۆم و ناونیشانم خرایە سەر لیستەکە. ئەوەندەی پێ نەچوو، کە نامە و نامیلکەگەلێکی زۆرم، لەلایەن خێوەتگە و، ڕێبەرانی گەشتوگوزارەوە پێگەیشت. هەر بە جارێک شۆک بووم و نەمدەزانی کامەیان هەڵبژێرم، پاشان خاوەنی خێوەتگەیەک شتێکی زیرەکانەی کرد، ناو و ژمارەی چەند کەسی نیو یۆرکی بۆ ناردم، لە لەلای ئەو مابوونەوە و پێی ڕاگەیاندم، ئەگەر پەیوەندیی بە ئەوانەوە بکەم، بۆ ئەوەی داوایان لێ بکەم، کە ئاخۆ خاوەنی ئەم خوێوەتگەیە تا چەندێک خزمەت بە گەشتیارەکانی دەکات.

سەرسام بووم، چونکە ناوی یەکێک لەو پیاوانەم دەناسی، کە لە لیستەکەیدا ناو و ژمارەکەی پێ دابووم، لەبەر ئەوە پەیوەندەم پێوە کرد و داوام لێ کرد، کە ئەزموونی خۆییم بۆ بەیان بکات، لە ماوەی

مـانەوەی لەو شـوێنەدا، هەر کە گەیشـتمە ئەوێ، یەکسـەر پەیوەنـدیم بەو شـوێنەوە کـرد. هەمـوو خـاوەن خوێوەتگەکـان هەوڵیـان دەدا، شتەکانیان لـێ بکڕم کەچی دانەیەک نەبێت کە ڕێگەی دام خۆم لێی بکڕم.

بیستوپێنج سەدە لەمەوبەر، *لیۆتسی*، دانایەکی چینی گوتوویەتی:

کە دەکرێت خوێنەرانی ئەمڕۆ پەیڕەوی بکەن...

"هۆکـــاری ئەوەی، کە ڕووبارەکـــان و زەریاکـــان پێـــک دەگەن، دەرەنجامی سـەدان جـۆگەی چیاکـانە کە، دەڕژێنە ناویـانەوە، بەمەیـش دەتوانی فرمان بەسەر هەموو جۆگەلە شاخاویەکاندا بکەیت. بەمەیش، ئەگەر دانایەک بیەوێت لە سـەرووی خەڵکەوە بێت، ئەوا دەبێت خـۆی بخاتە خوار ئەوانەوە، ئەگەر خوازیار بێت خۆی بخاتە پێش ئەوانەوە، ئەوا دەبێـــت لە دوایـــانەوە بوەســـتێت، بەم شـــێوەیە، هەرچەنـــدە شـوێنەکەی لە سـەرووی ئەوانەیشـەوە بێـت، بەڵام ئەوان هەسـت بە قورسـایی نـاکەن، هەرچەنـدە پـێگەی لەپـێش ئەوانەوە بێـت، ئەوا وا نازانن کە هیچ ئازارێکیان بەر کەوتبێت."

**"ڕێگە بە کەسی بەرانبەر بدە،**

**کە**

**ئەو هەست و بیرۆکەیە هی ئەوە."**

## ڕێگای پێنجەم

### داوایەک، کە هەموو لایەک حەزی لێیەتی

من لە شاری **جێیسی جەیمز**، لەدایک بووم لە میسۆری، سەردانی کێڵگەی **جەیمزم** لە کیرنی، میسۆری دەکرد، لەو کاتەدا هێشتا کوڕەکەی **جەیمز** لە ژیاندا مابوو.

خێزانەکەی هەندێک لەو چیرۆکانەی بۆ دەگێڕامەوە، کە چۆن بانک و شەمەندەفەرەکانی تالان دەکرد، لەدوای ئەوە ئەو پارەیەی بەسەر جووتیارەکانی دراوسێدا دابەش دەکرد.

دەشێت **جێیسی جەیمز**، بە کردنی ئەم کارە خۆی بە کەسێکی نموونەیی، هەژمار کردبێت، هەر وەکوو **جەچ شولتز**، ***کراولی*** "جووتە دەمانچە،" ***ئەل کاپۆنی*** ئەو کارەیان دەکرد. ڕاستییەکە ئەوەیە هەموو ئەو کەسانەی کە دەیان بینی، خۆیان بە کەسێکی ڕەفتار باش لە قەڵەم دەدەن و، وەکوو بڵێی لە قاوغی خۆیاندا کەسانێکی دوور لە ئەمانی و باش بن.

***جەی. پیرپۆنت مۆرگان***، لە یەکێک لە شیکردنەوەکانیدا ئەوەمان بۆ بەیان دەکات، ئەو کەسەی کە دوو هۆکاری باشی هەیە، بۆ کردنی شتێک: دانەیەکیان وا دەردەکەوێت، کە هۆکارێکی باش و ڕاستەقینە بێت.

کەسەکە خۆی بیر لە هۆکارە ڕاستەقینەکە دەکاتە، تۆ پێویست ناکات، تەئکید لەسەر ئەوە بکەیەوە، بەڵام هەمووومان لە ناخمانەوە خۆمان پێ پەسندە، حەز دەکەین بیر و سەرنجمان لەسەر ئەو هۆکار و پاڵنەرانە، چڕ بکەینەوە کە پێمان باشن. بۆ ئەوەی تێڕوانینی خەڵک بگۆڕین ئەوا دەبێت ڕووی داواکانمان بەرەو پاڵنەرێکی باشتر ئاڕاستە بکەین.

ئایا ئەوانە ئەوەندە نموونەن، تا لە کارەکاندا سوودی لێ وەربگرین؟ با ببینین. با ڕوو لە حاڵەتی *هاملتۆن جەی فارێل* سەرۆکی کۆمپانیای فارێل مشێلی گلێنۆڵدن، پێنسلڤانیا بکەین. بەڕێز *فارێل* کرێچییەکی هەبوو، کە هەموو جارێک هەڕەشەی ڕۆیشتنی لێ دەکرد لە کاتێکدا چوار مانگ بەسەر گرێبەستەکەدا مابوو. ئیدی تێبینییەکی نووسی، کە گوایە دەستبەجێ بەجێی دەهێڵێت و پەیوەندی بە گرێبەستەوە نییە.

بەڕێز *فارێل* ئەمەی لە بەردەم قوتابییەکاندا گێڕایەوە: "ئەوانە بە درێژایی زستان لەماڵەکەی مندا ژیاون، لەم وەرزەی ساڵدا نرخەکان، لە هەموو وەرزەکانی دیکە گرانترن، دەمزانی کە سەخت دەبێت، کە بەر لە هاتنی پایز خانوو بەکرێ بدرێت. دەیشمزانی کە داهاتی ئەو کرێیەم لەو ماوەیەدا دەست ناکەوێت، ئیدی هەر تەواو نیگەران بووم.

"ئێستا، لە کاتە ئاساییەکاندا، خۆم سەردانی کرێ چییەکەم دەکرد، بۆ ئەوەی بەڵێننامەکە بە باشی بخوێنێتەوە، لەبەر ئەوە ئاماژەم بەوە کرد، ئەگەر بێت و ماڵەکە چۆل بکات ئەوا دەبێت بە گوێرەیی ئەو بەڵێننامەیە، کرێی خانووەکەم دەسبەجێ بداتێ."

"لەگەڵ ئەوەیشدا، لە جیاتی ئەوەی توڕە ببم و، شتێک بکەم، هەوڵم دا تاکتیکێک تاقی بکەمەوە، لەبەر ئەوە بەم شێوەیە، دەستم پێ کرد، گوتم: 'بەڕێز *دیو*، گوێم بۆ چیرۆکەکەت شل کردووە، بەڵام هێشتا لەو باوەڕەدا نیم، کە دەتەوێت ماڵەکەم چۆل بکەیت، ساڵانی کارکردنم لە بەکرێدانی خانوودا، شتێکی دەربارەی سروشتی مرۆڤ فێر کردووم، لەبەر ئەوە من دەزانم کە تۆ کەسێکی خاوەن قسەی خۆتیت. لە ڕاستیدا، بە جۆرێک دڵنیام، کە ئامادەییم تێدایە قوماری لەسەر بکەم.'"

"ئێستا، ئەوە پێشنیاری منە، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک بڕیارەکەت بەلاوە بنێ و بیری لێ بکەوە. هەر لە ئێستاوە هەتا سەرەتای مانگی داهاتوو و کاتی کرێ هەر بڕیارێکتدا پێم بڵێ، ئاخۆ هێشتا هەر

دەتەوێت بڕۆییت، لە ئێستا پێت دەڵێم، کە ئەو کاتە هەر بڕیارێک بدەیت ئەوا لێت قبوڵ دەکەم، وەکوو دوا بڕیار، و مافی ڕۆیشتنیشت پێ دەدەم و ئیدی ئەوەیش قبوڵ دەکەم، کە من لە بڕیارەکەی خۆمدا هەڵە بووم. بەڵام سەربارى ئەوەیش هێشتا من باوەڕم بە تۆ هەیە کە هەر خاوەن قسەی خۆتی و بەپێی گرێبەستەکە ڕێ دەکەیت. بەر لە هەرشتێک، ئایا ئێمە مرۆڤین یان مەیموون، بڕاردەی ئەمەیش دەکەوێتە سەر دیدگای خۆمان!"

"باشە، کاتێک سەرى مانگ هات، ئەو پیاوە بەڕێزە خۆی هات و کرێی خانووەکەی پێدام، خۆی و خێزانەکەی بیریان لێی کردبوویەوە، بڕیاریان دابوو، کە تێیدا بمێننەوە و شتێکی ئەخلاقییە، ئەگەر پابەندی گرێبەستەکە بن."

کاتێک *لۆرد نۆرسکلیس*، بینی وا ڕۆژنامەیەک وێنەی ئەوی بڵاو کردووەتەوە، لە کاتێک خۆی ڕەزامەندی لەسەر بڵاوبوونەوەی نەبوو. نامەیەکی بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەکە نووسی، ئایا لە نامەکەدا ئەوەی نووسی: "تکایە چی دیکە ئەو وێنەیەی من بڵاو مەکەنەوە، من حەزم لێی نییە؟" نەخێر، بەڵکو ئاراستەی داواکەی بەهادارتر بوو، بە ڕێز و عەشقێک کە هەمووومان بەرامبەر بە دایکمان هەیە بەم شێوەیە نووسی: "تکایە چی دیکە، ئەو وێنەیەی من بڵاو مەکەنەوە، دایکم حەزی لێی نییە."

کاتێک *جۆن دی ڕۆکفێلەر، جەی ئار*، هیوای دەخواست، بۆ ئەوەی فۆتۆگرافەرەکان بوەستێنێت، لەوەی کە وێنەی منداڵەکانی نەگرن، ئەویش پەنای بردە بەر داوایەکی شکۆمەند، نەیگوت: "نامەوێت ئەو جۆرە وێنانە بڵاو ببنەوە." نەخێر شتێکی لەم شێوەیەی نەگوت، بەڵکو بە حەز و تامەزرۆییەکەوە، کە لە ناخی هەمووماندا هەیە، گوتی: "خۆتان دەزانن دۆخەکە چۆنە، هاوڕێیان، ئێوەیش خۆتان منداڵتان

هەیە، هەر نەبێ هەندێک لە ئێوە. دەیشزانن کە ئەوە خزمەت بە منداڵ ناکات بۆ ئەوەی بەناوبانگ بێت."

کاتێک ***سایروس ئەیچ کەی کێرتس***، کوڕە هەژارێکی مەین، دەستی بە پیشـەیەکی زۆر خێـرا کـردوو، ڕێـڕەوی ژیـانی گـۆڕیی و، بـوو بە خاوەنی ڕۆژنامەکانی "بڵاوکراوەی ئێوارانی یەکشـەممە،" لەیدیز هۆم جۆرنـال، نەیدەتوانی هاوشـێوەی گۆڤارەکانی دیکە ئەو نرخەیە بدات یاخود ئەو نووسەرانەی کە تەنیا بۆ پارە دەنووسـن لە دەوری خۆیی کۆیـان بکـاتەوە. بـۆ ئەم مەبەسـتەیش پەنـای بـردە بەر داوایەکـی شـکۆمەند، بـۆ نمـوونە، تەنـانەت ***لـوئیزا مـای ئەلکـۆتی*** ڕازی کـرد، نووسـەری نەمـری، "ئـافرەتی بچـووک" بـۆ ئەوەی بـۆی بنووسـێت لە کاتێکدا ئەو خانمە لە قیمەی ناوبانگیدا بوو، ئیدی ئەمەیشی کرد، بۆ ئەوەی چەکێکـی سـەدان دۆلاری بـۆ بنێرێـت، نەک بـۆ ئەو خـاتوونە، بەڵکو بۆ کارە خێرخوازییە دڵخوازەکەی.

دەکرێـت کەسـێک بە گومـانەوە بڵێـت: "ئاهــ ئەمە دەکرێـت بـۆ ***سۆرسـکلیف، ڕۆکفـێلەر*** و ئـافرەتێکی عـاتیفی دروسـت بێـت، بەڵام هیـوادارم لەگەڵ ئەو منـداڵە زەبروزەنگـانەیش کـار بکـات کە دەکرێـت پارەیان لێ کۆ بکرێتەوە!"

دەکرێت ڕاست بکەیت، هیچ شتێک لە هەموو بارێکدا کار ناکات، هیچ شتێکیش لەگەڵ هەموو کەسێکدا کاریگەر نابێت. ئەگەر تۆ دڵخۆشـیت بەو ئەنجامـانەی، کە بەدەسـتیان دەهێنیـت، ئەی بـۆ گۆڕانکـاری دەکەیـت؟ خۆ ئەگەر باوەڕیشـت پێـی نییە و، دڵخۆشـنیت پێـی بـۆچی تاقی ناکەیەوە؟

لە هەر حاڵەتێکدا بێت، پێم وایە، کە چێژ لە خوێندنەوەی، ئەم چیرۆکە ڕاسـتەقینەیە دەبینـی، کە ***جەیمـز ئێل تۆمـاس***، بۆمـان دەگێـڕێتەوە، قوتابییەکی پێشووی خۆم:

شەش کەس لە کڕیارەکانی کۆمپانیایەکی فرۆشتنی ئۆتۆمبێل، ئامادە نەبوون کرێی خزمەتگوزارییەکانیان بدەن، هەر یەکێک لە ئەوانە ئاماژەی بە هەڵەیەک کرد، لە هەر حاڵەتێکدا، دەیانگووت، کە شتێکی زیادە بوونی هەیە، کۆمپانیاکەیش درکی کرد کە ئەوە ڕاستە گوتی: ئەوەشیان هەڵەی یەکەمە.

بەشەکانی سەنەد، کۆمەڵە هەنگاوێکیان گرتبوویە بەر بۆ کۆکردنەوەی بڕی پارەی زیادە، ئایا وا خەیاڵ دەکەیت کە ئەوانە سەرکەتوو بوون.

بانگی هەموو کڕیارەکانیان کردبوو و، پێیان گوتبوون، کە دەبێت بڕی پارەی ماوە کۆ بکەنەوە و بیدەنەوە بە کۆمپانیا.

ئەوەیان بۆ ڕوون کردبوونەوە، کە کۆمپانیاکە ڕاست و دروستە، بەمەیش کڕیارەکان تەواو هەڵە بوون.

سوور بوون لەسەر ئەوەی کە کۆمپانیا زیاتر لە ئەوان دەربارەی ئۆتۆمبێل دەزانێت. ئەنجامی ئەوەیش، ئەوە بوو کە کەوتنە دەمەتەقێ.

ئایا هیچ کام لە شێوازانە، توانیان کڕیارەکان ئاشت بکەنەوە و، کێشەکە تیمار بکەن؟ خۆت دەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەیەوە.

لەم قۆناغەدا، بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە، هەر خەریک بوو جەنگێکی یاسایی لەگەڵ کڕیارەکاندا هەڵگیرسێنێت، بەڵام کاتێک کێشەکە هاتە بەردەست بەڕێوەبەری گشتی، لەوە ورد بوویەوە، کە ئەمانە باشترین کڕیارەکانی کۆمپانیان، ئیدی گەیشتە ئەو بڕواییەی، کە هەر دەبێت لێرەدا هەڵەیەک هەر هەبێت، هەڵەیەکی قووڵ لە کۆکردنەوەی پارەدا هەیە، لەبەرئەوە بانگی ***جەیمز ئێل تۆماس***ی کرد و، داوای لێ کرد، کە حسابە نەکراوەکان کۆ بکاتەوە.

ئەمانە ئەو هەنگاوانەن، کە بەڕێز جەیمز گرتنییە بەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە:

"سەردانکردنی هەر کڕیارێک، بە مەبەستی کۆکردنەوەی پارەبوو، کە ماوەیەکی زۆر بوو لایان بوو، تەواو لەوەیش دڵنیا بوون کە حسابەکەی کۆمپانیا دروستە. بەڵام من هیچ وشەیەکم دەربارەی ئەوە نەگوت. بەڵکو بۆم ڕوونکردنەوە، کە بۆ دۆزینەوەی ئەو هەڵەیە هاتووم، کە کۆمپانیا کردوویەتی یاخود ئەو شکستەی کە خواردوویەتی.

"ئەوەم بە ڕوونی بەرجەستە کرد، هەتا گوێم لە چیرۆکی کڕیارەکە شل نەکردبا، من هیچ پێشنیازێکم بەیان نەدەکرد، ئەوەیشم پێ گوتن، کە کۆمپانیا هیچ هەڵەیەک ناکات لەپێناو ئەوەی کە حسابەکەی خۆی پێ دروست بێت.

"پێیم دەگوتن، کە من حەزم بە ئۆتۆمبێلەکەی ئێوە دێت و، خۆتان دەربارەی ئۆتۆمبێلەکەی خۆتان زیاتر لە هەموو کەسێک شارەزاترن لە جیهاندا، بەمەیش ئێوە دەسەڵاتتان بەسەر مەسەلەکەدا هەیە.

"ڕێگەم پێدان، کە قسە بکەن، بە تامەزرۆییەوە گوێم بۆ شل کردبوون، بە جۆرێک کە خۆیان دەیانویست و چاوەڕێیان دەکرد.

"لە کۆتاییدا، لەدوای ئەوەی کە کڕیارەکان، دەکەونە جەوێکی هێمنەوە، منیش دەکەوتمە جوڵاندنی تەواوی هەستەکانیان، ئیدی بە ناوی خەسڵەتە باشەکانەوە کەوتمە گۆ، گوتم: 'سەرەتا، دەمەوێت بزانن، کە منیش وەکوو ئێوە، دەزانم کە ئەمە مەسەلەیە و، بە باشی ڕێی نەکردووە، داوای لێبووردەن دەکەم، دەکرێت لەلایەن یەکێک لە نوێنەرەکانی کۆمپانیاکەمان بێزار و، بێتاقەت و شەکەت بووبن، ئەمە هەرگیز دووبارە نابێتەوە، من وەکوو نوێنەری کۆمپانیا داوای لێبوردن دەکەم، سازش دەکەم، بەوەی کەوا من دانیشتووم و گوێ لە چیرۆکی ئێوە دەگرم، ناتوانم نەکەومە ژێر کاریگەری هێمنی و دادوەری ئێوە. ئێستاش لەبەر ئەوەی ئێوە هێمن بوونەوە و، لە بابەتەکە تێگەیشتوون، من داواتان لێ دەکەم، شتێکم بۆ بکەن، شتێک،

کە ئێوە باشتر لە هەر کەسێکی دیکە دەیکەن، شتێک کە زیاتر لە هەموو کەسێکی لێی شارەزاترن. ئەمە چەکەکەی تۆیە، دەزانم باش دەتوانن پڕی بکەنەوە، هەر وەکوو ئەوەی ئێوە سەرۆکی کۆمپانیاکە بین، من بۆ ئێوەی بەجێ دەهێڵم، هەر داوایەکتان هەیە جێبەجێی دەکەین.'"

"ئایا ئەو کڕیارانە پارەکەیاندا؟ بەڵێ بە دڵنییایەوە، بڕی پارەکە لە نێوان ۱۵۰ بۆ ٤۰۰ دۆلار بوو، ئایا ئەمانە ناڕەزاییان دەربڕی، بۆ ئەوەی پارەکە نەدەن؟ بەڵێ، یەکێکیان قایل نەبوو، یەکێک لە ئەوانە ڕەتی کردەوە، بۆ ئەوەی ئەو بڕە پارەیە بدات، بەڵام هەر پێنج کڕیارەکەی دیکە پارەکەیاندا! ئەمەیش کلیلی تەواوی شتەکەیە: لەماوەی دوو ساڵی داهاتوودا کۆمپانیا شەش ئۆتۆمبێلی دایە دەست هەر شەش کڕیارەکە!"

بەڕێز ***تۆماس*** دەڵێت: "ئەزموون فێری کردووم، کاتێک هیچ زانیاریەکت نەبوو لەسەر کڕیارەکەت، تاکە بنەمایەک، کە بە هۆیەوە بتوانی مامەڵەی پێ لەگەڵ کڕیارەکەدا بکەیت، ئەوەیە کە وا دابنێیت ئەو کەسێکی دڵسۆز، ڕاستگۆ، ڕاستبێژ، ئارزوومەندە و هیوای وایە کە پارەکە بدات. کە هەر بڕوای بەوە کرد، کە حسابەکان ڕاست و دروستن. بە شێوەیەکی ڕوونتر و جیاوازتر دەتوانین بڵێین، مرۆڤەکان ڕاستگۆن و ئارزوومەندی ئەوەن کە بەڵێنەکانیان بەرنەسەر، کەسانێکی کەم بوونیان هەیە، کە پێچەوانەی ئەم بنەمایە بن. قەناعەتیشم وایە ئەو کەسانەی کە بەدوای فروفێڵدا وێڵن، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا کاردانەوەیان بە شێوەیەکی میهرەبانانە دەبێت، ئەگەر تۆ وایان لێ بکەیت کە وا هەست بکەن تۆ بە کەسێکی ڕاستگۆ، ڕاست و دروست و دادوەرت هەژمارت کردوون."

**"بە ناوی خەسڵەتە باشەکانەوە**

**لەگەڵ خەڵکی بدوێ."**

# بەشی چوارەم

## ڕێگاکانی گۆڕینی خەڵک، بەبێ ئەوەی سووکایەتیان پێ بکەی یاخود بەبێ ئەوەی هەستی بێزاریان لەلا گەلاڵە بێت.

ئەگەر ئێمە بمانەوێت، "خەڵک بگۆڕین، بەبێ ئەوەی سووکایەتیان پێ بکەین یاخود بەبێ ئەوەی هەستی بێزاریان لەلا گەلاڵە بێت،" ئەوا دەبێت بە شێوەیەک دەست بەو کارە بکەین، کە جێگەی قبوڵکردن و ڕێز بێت، کاردانەوە و وەڵامدانەوەی، ئەو دەکەوێتە سەر بیرکردنەوە و ئەدای قسەکردنی ئێمە."

## ڕێگای یەکەم

### چۆن ڕەخنە دەگریت، بەبێ ئەوەی بەرانبەرەکەت هەست بە ڕقوقین بکات.

***چارلز شواب*** بەلای یەکێک لە کارگە پۆلایینەکانیدا تێدەپەڕی، ڕۆژێکیان لە دەمەو نیوەڕۆدا، کاتێک بینی وا هەندێک لە کارمەندەکانی جگەرەیان دەکێشا. لە سەرووی خۆشیانەوە تابلۆیەک هەڵواسرابوو، کە لەنێویدا نووسرابوو: "جگەرەکێشان قەدەغەیە."

ئایا ***شواب*** ئاماژەی بەو هێمایە کردوو و گوتی: "ناتوانن بیخوێننەوە؟" نا، نەخێر، ***شواب*** شتێکی لەم شێوەیەی نەکرد، بەڵکو ڕۆیشتە لای پیاوەکان، هەر یەکەیان جگەرەیەکی پێدان و، گوتی: "زۆر سوپاستان دەکەم، ئەگەر لەدەرەوە ئەم جگەرەیە بکێشن." ئیدی تێگەیشت کە پێشێلی یاسان کردووە و ***شواب***یش پێی زانیووە، ئەوانیش دەستخۆشیان لە ***شواب*** کرد، لەبەر ئەوەی هیچ شتێکی دەربارەی ئەمە نەگوت و، دیارییەکی بچکۆلانەی پێدان و وای لێکردن هەست بە گرنگی بکەن. ئایا خۆشەویستی ئەو پیاوەت ناکەوێتە دڵەوە، وا نییە؟

***جۆن وانامەیکەر***، پەیڕەوی هەمان تەکنیکی کرد، ڕاهاتبوو ڕۆژانە گەشتێک بەرەو کۆگاکەی بکات، هەموو ڕۆژێک بۆ فیلادێلفیا. جارێکیان بینی کە یەکێک لە کڕیارەکانی وا لەبەردەم ژمێریار وەستاوە، بە جۆرێک هەر کەس گرنگی پێ نادات، ئەدی فرۆشیارەکانی کۆگاکە؟ ئەوانە لەو سەری کڕیارەکە پێ دەکەنین و لەنێو خۆیاندا قسەیان دەکرد.

***وانامەیکەر*** تەنانەت یەک وشەی دەرنەبڕی، بەڵکو بە لەسەرەخۆیی ڕۆیشت بۆ پشتەوەی ئامێری ژماردنەکە و خۆی مامەڵەکانی ئەو کڕیارەی جێبەجێ کرد. لەدوای ئەوە بەڕێگەی خۆیدا گوزەری کرد.

هەردەم دەستەی کارگێڕی گشتی دەکەونە ژێر لێشاوی ڕەخنەوە، بەوەی کە ئاسانکاری ناکەن لە بنیاتناندا، ئەوانە خەڵکانێکی سەرقاڵن، هەڵەکەیش لەوەدا سەرچاوە دەگرێت، کە پارێزگاریکارە پارمەتیدەرەکان نایانەوێت بارێکی ئەوتۆ بخەنە سەر بەڕێوەبەرەکانیان بەوەی کە میوانگەلێکی زۆر سەردانیان بکات. *کارل لانگفۆرد*، کە لە ئۆرلاندۆ، فلۆریدا سەرۆکی شارەوانی بوو، ماڵی دیسنی وێلد، بۆ ماوەی چەندین ساڵ، زوو زوو هۆشداری دەدا، بە ستافەکەی بۆ ئەوەی ڕێگە بە خەڵک بدەن و، چاویان بە ئەو بکەوێت، هەر بانگەشەی ئەوەی کرد کە سیاسەتی دەرگای کراوەی هەیە، لە کاتێکدا هاولاتیانی کۆمەڵگاکەی ئەو، لەلایەن بەڕێوەبەر و سکتێرەکانەوە ڕێگریان لێ دەکرا چاویان پێ بکەوێت، کاتێک بانگیان دەکرد.

لە کۆتاییدا، سەرۆکی شارەوانی ڕێگە چارەیەکی دۆزیەوە، دەرگای ئۆفیسەکەی لابرد! بەمەیش پارمەتیدەرەکانی لە پەیامەکەی تێگەیشتن، بەمەیش بەڕێوەبەرایەتییەکی ڕاستەقینەی بەرپاکرد، لەو کاتەی کە ئەو دەرگایەی لا بردبوو.

هەر بە سادەیی، گۆڕینی تەنیا سێ پیت لە وشەیەکدا دەبێتە مایەی نانەوەی جیاوازی، لەنێوان شکست و سەرکەوتن، لە گۆڕنی خەڵک هەر بەبێ ئەوەی هەستی بێزاری و سووکایەتی پێکردن لەدایک بێت.

زۆرێک لە خەڵک بە هەستێکی پڕ لە سوپاس و ستایشەوە، دەست بە ڕەخنەگرتن دەکەن و لەدواییدا وشەی "بەڵام"یش دێتە ناو باسەکەوە و، قسە بە لێدوانێکی ڕەخنەیی کۆتایی پێ دێت. بۆ نموونە، بۆ ئەوەی هەوڵ بدەیت کە تێڕوانینی ڕەفتارێکی کەمتەرخەمانەی منداڵەکەت بگۆڕی، بۆ ئەوەی بخوێنێت، دەکرێت بڵێین: "لە ڕاستیدا شانازیت پێوە دەکەین، *جۆنی*، بەوەی کە نمرەکانت لەم وەرزەدا بەرز کردوونەتەوە،

بەڵام ئەگەر زیـــاتر لە زانســـــتی بیرکــــاری ورد ببووبـــــایەوە ئەوا ئەنجامەکان باشتر دەبوون."

لەم حاڵەتەدا، دەکرێت بەم قسەیە **جۆنی** هان بدرێت هەتا دەگاتە ســەر وشـــەی "بەڵام" دەکرێـــت لەدوای ئەوە پرســـیاری ئەو دڵســـۆزیی و ستاییشە بنەڕەتییە بکات، بۆ ئەو، دەشێت ئەو ستایشکردنە دەستپێکی چاوسورکردنەوە و ڕەخنەگرتنێکی شکستەکەی بێت. بەمەیش هەستی بـاوەڕکردن دەکەوێتە کانیاوی فشـارەوە و، دەکرێت ئەو ئامانجەمـان نەپێکـین لەپێنـاو گـۆڕینی بیرکـردنەوە و دیـدگەی **جـۆنی** بەرانـبەر بە خوێندنەکەی.

دەکرێت بە گـۆڕینی وشـەی "بەڵام" بە ئاسـانی ئەو ئامـانجە پێکرابـایە بۆ پیتی "و،" ئێمە لە ڕاستیدا شانازی بە تۆ دەکەین **جۆنی**، بەوەی کە لەم وەرزەدا پلەکانــت بەرز کـــردووەتەوە و، ئەگەر هەمـــان هەوڵ و مانـــدووبوونت دابـــایە، ئەوا نمـــرەی زانســـــتی بیرکارییشـــــت بەرز دەبوویەوە لەگەڵ تەواوی نمرەکانی دیکەت."

ئێستا **جۆنی**، ئەو ستایشکردنە قبوڵ دەکات، چونکە هیچ هەستێک لە قســـەکاندا بەدی ناکرێـــت وەکـــوو بڵێـــی ئەو شکســـتی خواردبێـــت و، کەوتبێـت. بەمەیـش سـەرنجی ئەومـان بەرەو ئەو ئامـانجەی خۆمـان پەلکێش کردووە، کە خوازیاری ئەو بیرکردنەوەیە بگۆڕێت.

پەلکێشکردنی کەسێک، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەر بە شـێوەیەکی باوەڕپێنەکراو کـاریگەری دەبێت، لەگەڵ کەسـانی هەسـتیاردا، دەکرێت زوو بێزار و تورە بن بەوەی هەر ڕەخنەیەکی ڕاستەوخۆیان ئاڕاسـتە بکرێت.

***مـارج جـاکوب***ـــی ون سـۆکەر، ڕۆد ئایلەنـد، بـۆ قوتابییەکـانی منـی گێڕایەوە، کە چۆن هەندێک کرێکاری دەستوپێ‌سپی قایل کردووە، بۆ

ئەوەی لەدوای خۆیان شوێنەکە پاک بکەنەوە کاتێک لە ماڵەکەی ئەودا کار دەکەن.

بۆ چەند ڕۆژێکی سەرەتای کارەکە، کاتێک خاتوو ***جاکوب*** لەسەر کارەکەی گەڕایەوە، تێبینی ئەوەی کرد، کە حەوشەکەی پڕ بووە لە پارچە تەختە. ئەم خانمە نەیدەویست دوژمنایەتی لەگەڵ ئەو کرێکارانەدا بکات، چون کارێکی نایاب و ناوازەیان کردبوو. لەبەر ئەوە لەدوای ئەوەی کرێکارەکان ڕۆیشتنە ماڵەوە. خاتوون خۆیی و منداڵەکانی، ئەو وردە تەختانەیان لە سوچێکدا کۆ کردەوە. بۆ ڕۆژی دواتر، بانگی سەرکارەکەی کرد و، بردییە لایەکەوە و، پێی گوت: "زۆر خۆشحاڵ و شادمانم کە شەوی ڕابردوو ئێرەتان بەم شێوەیە بەجێ هێشتبوو، دەبینی زۆر جوان و پاکوخاوێنە و، نابێتە مایەی ئازاردانی دراوسێکانمان." ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە کرێکارەکان خاشاک و وردە دارەکانیان دەختە سوچێکەوە، سەرکارەکەیش هەموو ڕۆژێک لە کۆتایی ڕۆژ و لەدوای کارکردن دەهات، بۆ ئەوەی بزانێت ئاخۆ ئەو ناوەیان پاکردووەتەوە.

یەکێک لە جیاوازییە سەرەکییەکانی مشتومڕ، لەنێوان ئەندامانی سوپای یەدەگ و سوپاسی مەشقپێکەری ئاسایی، بریتییە لە سەرچاککردن. سوپای یەدەگ خۆیان بە کەسانێکی شارستانی هەژمار دەکەن "کە زۆربەی کات بەو شێوەیەن" و بێزار و نیگەران دەبن ئەگەر قژیان کورت بکەنەوە.

ماستەر ***سێرجنت هارلی کەیسەری*** قوتابخانەی ٥٤٢ یو.ئێس.ئەی.ئاڕ، هەستا بە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، کاتێک کاری لەگەڵ پیڕێک لە ئەفسەرەکانی سوپای یەدەگ دەکرد، دەبووایە بەسەر هێزەکانیدا هاوار بکات و هەڕەشەیان لێ بکات، بەڵام لە جیاتی ئەمە هەستا بە کردنی ئەم کارەیە:

دەستی پێ کرد: "بەڕێزان، ئێوە ڕابەرن، زۆر کاریگەر دەبن، وەکوو کەسانێکی نموونەیی ڕێ دەکەن، دەبێت بشبن بە نموونە بۆ ئەو پیاوانەی کە شوێنی ئێوە دەکەون. ئایا دەزانن، کە سوپای یاسایی چی دەربارەی قژچاکردن دەڵێن، من ئەمڕۆ خۆم سەرم چاک دەکەم. وەلێ قژی من کورترە لە هی زۆرێک لە ئێوە. سەیری خۆتان بکەن لە ئاوێنەدا، ئەگەر وا هەست دەکەیت، کە تۆ پێویستت بە بڕینی قژە، بۆ ئەوەی ببی بە نموونەیەک، ئێمە کاتتان بۆ ڕێک دەخەیەن، بۆ ئەوەی سەردانی سەرتاشخانە بکەن."

ئەنجامی ئەمە، هەر زۆر سەرسووڕهێنەر بوو، زۆرێک لە پاڵێوراوەکان، لە ئاوێنەدا سەیری خۆیان دەکرد، ئەو دوای نیوەڕۆیە چوون بۆ سەرتاشخانە و سەریان چاک کرد. بۆ بەیانی داهاتوو، ***سێرجنت کەیسەر*** قسەی کرد، کە پێشتر پێشبینی بەرەوپێشچوونی سیفەتەکانی کەسی ڕابەری کردبوو لەنێو هەندێک لە ئەندامانی گرووپەکەیدا.

لە ٨ی ئازاری ١٨٨٧دا، ***هێنری وارد بیچەری*** زمانپاراو کۆچی دوایی کرد، لە ڕۆژی یەکشەممەدا، ***لایمان ئەبۆت*** بانگهێشت کرابوو، بۆ ئەوەی قسە لەسەر دوانگەی خوالێخۆشبوو ***بیچەر*** بکات. ئەویش بە پەرۆش بوو، بۆ ئەوەی باشترین هەوڵی خۆی بدات، وەکوو ***فلابێر*** گوتارەکەی دەنووسی و دووبارە دەینووسییەوە. لەدواییدا بۆ خێزانەکەی خوێندەوە، گوتارەکە هاوشێوەی هەر گوتارێکی ئاسایی زۆر لاواز بوو. ئەگەر ژنەکەی دانایی نەبووایە لەوانەبوو بڵێت: "***لایمان***، ئەوە هەر زۆر بێکەڵکە، هەرگیز جێگەی خۆی ناگرێت، بگرە وا لە خەڵک دەکات، خەو بیانباتەوە، چونکە ئەمە لە ئینسایکلۆپیدیا دەچێت. تۆ پێویستە بزانیت کە، بۆ چەندین ساڵ ئامۆژگاریت کردووە، بۆ خاتری خودا، بۆچی وەکوو مرۆڤێک نادوێیت؟ بۆچی بە

شێوەیەکی سروشتی ڕفتار نانوێنیت؟ خۆت لەکەدار دەکەیت ئەگەر ئەمە بۆ خەڵک بخوێنییەوە."

ئەمە ئەوەیە، کە ژنەکەی دەکرا بیگوتایە، خۆ ئەگەر ئەمەی بکرادایە، ئەوا خۆت دەزانی چی ڕووی دەدا، ئەویش دەزانیت لەبەر ئەوە تەنیا گوتی؛ "ئەمە گوتارێکی نایابە، بۆ ئەوەی لە 'نۆرس ئەمێریکان ڕیڤیو' بڵاو بکرێتەوە." بە شێوەیەکی دیکە، ستایشی کرد و پێشناری ئەوەیشی کرد، کە ئەمە وەکوو گوتار بخوێنرێتەوە بۆ خەڵک، شتێکی ئەوتۆ باش نابێت. *لایمان ئەبۆت*ـیش، لە مەبەستەکە تێگەیشتوو، دەستنووسەکەی دڕاند و گوتاریدا هەربەبێ ئەوەی کاغەزیشی لە بەردەستیدا بێت.

ڕێگایەکی کاریگەر، بۆ ئەوەی هەڵەکانی خەڵکی ڕاست بکەیەوە...

**"بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ**

**ئاماژە بە هەڵەکانی خەڵکی بکە."**

## ڕێگای دووەم

### سەرەتا، دەربارەی هەڵەکانی خۆت بدوێت

خوشکەزاکەم، ***جۆسفین کارنگی***، هاتە نیو یۆرک بۆ ئەوەی ببێت بە سکتێری من، تەمەنی نۆزدە ساڵ بوو، سێ ساڵ لەومەبەر بەر، دەرچووی قۆناغی ئامادەیی بوو، ئەزموونی کارکردنیشی لەژێر سفردا بوو، کەچی بوو بە یەکێک، لە کارامەترین سکتێرەکان لە ڕۆژئاوایی سویز، بەڵام لە سەرەتادا ئەو باش بوو، لە ئاستێکی بەرەو پێشچووندا بوو. ڕۆژێکیان ویستم، ڕەخنەی لێ بگرم، بە خۆمم گوت: "تەنیا خولەکێک ***دەیل کارنگی***، تەنیا خولەکێک بوەستە، تەمەنی تۆ دوو ئەوەندەی تەمەنی ***جۆسفین***ـە، دە ئەوەندەی ئەو ئەزموونت لە کارکردندا هەیە. چۆن دەکرێت ئەوەی لێ چاوەڕێ بکەیت، کە هەمان تێڕوانین و دیدگای تۆی هەبێت، بڕیاری تۆی هەبێت، تەنیا پەلە مەکە، ***دەیل***، چیت دەکرد، کە لە تەمەنی نۆزدا ساڵیدا بوویت؟ ئەو هەڵە و پەلانەی خۆت لەبیر کردووە؟ ئەوەت لەبیرنایە کە ئەمە ... و ئەوەت ... دەکرد؟"

لەدوای ئەوەی بیرم لەم مەسەلەیە کردەوە، بە شێوەیەکی ڕاستگۆ و بێ لایەنانە. ئیدی گەیشتمە ئەو بڕوایەی، کە لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا ***جۆسیف***، لە من باشترە، داوای لێبوردن دەکەم کە دان بەو ڕاستییەدا دەنێم.

لەبەر ئەوە لەدوای ئەوە، هەر کاتێک بم ویستایە، کە دیدگای ***جۆسیفن*** بەڕووی هەڵەیەکدا پەلکێش بکەم، تەنیا بەمە دەستم پێ دەکرد، "تۆ هەڵەیەکت کردووە، ***جۆسیفن***، بەڵام خودا دەزانێت، لەو هەڵانەی کە کردوو من خراپتر نییە. تۆ بە داناییەوە لەدایک نەبوویت، ئەمەیش تەنیا لە ئەزموونەوە سەرچاوە دەگرێت، تۆ لە من باشتریت، لەوەی

که من منداڵ بووم. من لەو کاتەدا زۆر کاری گەمژانەم دەکرد، بە جۆرێک هەڵەکانی ئەو کاتەم وای لێ کردووم، کە ڕەخنە نە لە تۆ نە لە کەسی دیکە، بگرم. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا پێت باشنییە کە ئەمە و ئەوە بکەیت."

شتێکی زۆر سەخت نییە کە گوێ بۆ هەڵەکانی خۆت شل بکەیت، بە مەرجێک ئەو کەسەی کە ڕەخنە دەگرێت بە شێوەیەکی سادە و خاکی دان بە هەڵەکانیدا بلێت و بێخەوش نییە.

*ئی. جی. دیلیستۆن*، ئەندازیارێک لە براندۆن، مانیتۆبا، کەنەدا، لەگەڵ سکتێرە تازەکەیدا کێشە و گرفتی هەبوو. ئەو نامانەی کە دەهاتنە سەر مێزەکە، بۆ ئەوەی ئیمزایان بکات یەک دوو هەڵی ئیملاییان تێدا بوو، بەڕێز *دیلیستۆن* بۆمان دەگێڕێتەوە، کە چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەمەدا کردووە: "هاوشێوەی چەندین ئەندازیار، منیش خاوەن ئینگلیزی و نووسینێکی کامڵ نیم. بۆ ماوەی چەند ساڵێک، کتێبم دەخوێندەوە دەربارەی ئەو وشانەی کە بە هەڵە دەمنووسین. کاتێک وا دەرکەوت، کە بەدەرخستنی هەڵەکان نابێتە پاڵنەرێک، بۆ ئەوەی سکتێرەکەم پاکنووسیان بکات و کار لەسەر فەرهەنگ ناکات. ئیدی پەنام بردە بەر ڕێگایەکی دیکە. کاتێک نامەیەکی دیکەم هاتە بەردەست و هەڵەی تێدا بوون، لەگەڵ نووسەرەکەیدا دانیشتم و گوتم:

"تاڕادەیەک ئەم وشەیە دروست دەرناکەوێت، ئەمە یەکێکە لەو وشانەی، کە هەردەم خۆم کێشەم لەگەڵیدا هەبووە. هەر لەبەر ئەوەیشە دەستم بە خوێندنەوەی ئەم کتێبەی ڕێنووسە کرد. 'کتێبەکەم هێناو پەڕی گونجاوم کردەوە،' بەڵێ، ئەوەتا لێرەیە، ئێستا زۆر بە ئاگام لە ڕێنووسکردن، چونکە خەڵک لە ڕێگەی پیتەکانەوە بڕیار لەسەر ئێمە دەدات، هەڵەکردنیش لە ڕێنووسدا وامان لێ دەکات، بە کەسانێکی کارامە بەدەرنەکەوین."

"نازانم ئاخۆ ئەو سیستەمەکەی منی پەیڕەو کرد یان نا، بەڵام لە ساتە وەختی ئەو گفتوگۆیەوە، هەڵە نووسینییە زۆر و زەوەندەکانی، کەمبوونەوەیەکی بەرچاویان بە خۆیانەوە بینی."

بگەڕێینەوە سالّی ۱۹۰۹، شازادە *بێرنارد ڤۆن بولۆ*، هەستی کرد دەبێت بەم شێوازە هەڵسوکەوت بنوێنێت، *ڤۆن بولۆ* لە ئەڵمانیا ڕاوێژکاری سەرۆکایەتی بوو، لەسەر تەختی شاهانەی *ویلهێلم*ـی دووەم دانیشتبوو، *ویلهێلم*ی لووتبەرز، گەمژە و نەزان، دواقەیسەری ئەڵمانیا بوو، سپاس و هێزی دەریایی دروست دەکرد و، لاف و گەزافی پێیەوە لێ دەدا.

لەدوای ئەمە شتێکی سەرسووڕهێنەر ڕووی دا، ئیمپراتۆر هەندێک شتی گوت. هەندێک شتی باوەڕپێنەکراو، هەندێک شت کە تەواوی کیشوەری ئەورووپای هێنایە جۆش و بە جیهاندا بڵاو بوویەوە. بۆ ئەوەی کەشەکە خراپتر بکات، ئیمپراتۆر شتی گەمژە و لەخۆڕازیبوون و پووچی بڵاو دەکردەوە. کاتێک بە میوانی سەردانی ئینگلتەڕای کردبوو، فەرمانێکی شاهانەیشی دەرکرد، بۆ ئەوەی نووسینەکانی لە ڕۆژنامەی "دەیلی تەلەگراف" بڵاو ببنەوە. بۆ نموونە لە لێدوانەکانیدا گوتبووی، من تاکە ئەڵمانییەکم کە هەست بە دۆستایەتی ئینگلتەڕا دەکەم، وەکوو هەڕەشەیەک لە دژی ژاپۆن، هێزی دەریایی پێک دەهێنم، خۆی تەنیا هەر خۆی بووە، کە ئینگلتەڕای ڕزگار کردووە، لە کاتێدا نوقمی تەپوتۆزی فەڕەنسا و ڕووسیا ببوو، هەر بە یاوەری ئەو بووە، کە هێز و توانای بە لۆرد *ڕۆبێرت*ـی ئینگلتەڕا بەخشیووە، بۆ ئەوەی لە باشووری ئەفریقا بەرگری لە بۆرز بکات... هەتادوایی.

لەماوەی ئاشتی سەد سالّی ئەورووپادا، هیچ پاشایەکی ئەورووپی قسەی لەم شێوەیەی لەدەم هەڵنەوەریووە. بەمەیش تەواوی ئەو کیشوەرە شڵەژا و بگرە تووڕەبوون. ئینگلتەڕا لە تووڕەییدا هەر گڕی گرت، بەمەیش پیاوانی ئەڵمانی هەر تۆقین و سەرسام ببوون. لە

ناوەندی ئەم شپرزەبوونەدا، ئیمپراتۆر هەر زندەقی چوو و، داوای لە شازادە *ڤۆن بولۆ* کرد، بۆ ئەوەی بەرپرسیاریەتی ئەو لێدوانانە بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەوە بڵێت کە ئەو بووە، ئامۆژگاری ئیمپراتۆری کردووە، بۆ ئەوەی شتێکی لەم شێوەیە بڵێت.

کاتێک *ڤۆن بولۆ* نارەزایی لەبەرانبەر ئەم پێشنیارەدا دەربڕی، "بەڵام ئەی خاوەنشکۆ، بە جۆرێک بۆ من دەردەکەوێت، کە مەحاڵە هەر کەسێکی ئەڵمان و ئینگلتەرا، وا درک بکەن، کە من توانای ئەوەم هەبوو بێت شتانێکی لەم شێوەیەدا بە گوێی تۆدا بچرپێنم."

هەر لەو ساتەی، ئەم وشانە لە دەمی *ڤۆن* هاتنەدەرەوە، درکی کرد کە هەڵەیەکی گەورەی کردووە، بەمەیش ئیمپراتۆر زۆر تورە بوو.

هاواری کرد: "تۆ من بە کەر دەزانیت، پێت وایە من هەڵەی وام کردووە، کە تۆ ناتوانیت ئەو هەڵانە بکەیت."

*ڤۆن بولۆ* دەیزانی کە دەبووایە سەرەتا بەسەریدا هەڵدابایە وستایشی بکردایە، پاشان نارەزایی دەربڕیبایە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر درەنگ بوو بۆ ئەمە، شتێکی باشتری لەمە کرد. لەدوای ئەمە دەستی کرد بە سوپاسکردن و پیاهەڵدان، ئەمەیش بە شێوەیەکی نائاسایی کاری خۆی کرد.

بەرێزەوە وەڵامی دایەوە: "من هەرگیز مەبەستم، شتێکی لەم شێوەیە نەبوو، لە چەندین دیدگاوە تۆ لە من سەرکەوتووتر و لێزانتریت، بە دڵنیاییەوە نەک هەر لە هێزی دەریایی و سەربازیدا، بەڵکو زیاتر لەمەیش. لە زانستی سروشتیدا، زۆر بە تامەزرۆییەوە گوێم بۆ شل کردبووی، کاتێک دەربارەی پەستانپێو روونکردنەوەت دەدا یاخود تەلەگرافی بێسیم یان دەربارەی تیشکی رۆنتگەن، قسەت دەکرد. بەداخەوەم، کە من هیچ شارەزاییەکم لەو بوارە سروشتیانەدا نییە، یاخود هیچ دەربارەی زانستی کیمیا و فیزیا نازانم، هەر بە هیچ

جۆرێـک نـاتوانم ڕوونکردنەوەیەکی سـادە بـدەم دەربـارەی دیـاردە سروشـتییەکان. *فـۆن* بەردەوام بـوو، بەڵام لەبەرانبەریـدا، کەمێـک زانیـاری مێـژوویم هەیە، دەکرێـت زانیـاری سوودبەخشـم دەربـارەی سیاسەت هەبێت، بە تایبەتی لەبواری دبلۆماسیدا."

بەم قسـانە ڕووخسـاری ئیمۆڕاتـۆر گەشـایەوە، بەوەی کە *فـۆن* ستایشی کرد، *فۆن* ئەوی گەورە کردوو خۆشی بچووکردەوە، لەدوای ئەمە ئیمپراتۆر لە هەمـوو شـتێک خـۆش بـوو، بە هەسـتێکی خـۆش و خرۆشـاوەوە گـوتی: "ئەدی هەردەم پێـت نـاڵێم، کە مـن و تـۆ تەواوکەری یەکدین؟ دەبێت هەمیشە هەروا بین و هەروایش دەبین؟"

تۆقەی لەگەڵ *فۆن*دا کردوو، نەک هەر جارێک بگرە چەندین جار. ئەو ڕۆژە تەواو گەرموگوڕ بوو، پاشان مستی بەرزکردەوە و گوتی: "هەر کەسـێک شـتێکم پـێ بڵێـت لە دژی شـازادە *فـۆن بولـۆ*، ئەوا لـووتی دەشکێنم."

*فـۆن* لە کـاتی دیـاریکراودا، خـۆی ڕزگـار کـرد، بەڵام سـەرباری ئەو دبلۆماسـییەی هەڵەیەکیشـی کـرد، دەبـووایە سـەرەتا دەربـارەی کەموکوڕیەکانی خۆی دوابا و ستایشی ئیمپراتۆر دەست پێ کردبایە، نەک بەو شـێوەیەی، کە ئیمپراتـۆر کەسـێکی نەزان و پێویسـتی بە ڕێنموونیکارێک هەیە.

جـا ئەگەر چەنـد ڕسـتەیەکی خـاکیبوون و پیاهەڵـدان، کەسـێکی لـووتبەرزی وەکـوو ئیمپراتـۆر بگۆڕێـت، بـۆ ئەوەی ببێـت بە هاوڕێیەکی دڵسۆز، ئەوا خەیاڵی ئەوە بکە، کە خاکیبوون و ستایش چ شتێک بۆ ئێمە دەستەبەر دەکەن، لە پەیوەندییەکانی ڕۆژانەماندا، ئەگەر بە شـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت پەیـڕەوی بکرێـت، ئەوا کارێکی نائاسایی ئامێز لە پەیوەندییە مرۆییەکان دەخولقێنێت.

قبـوڵكردنی هەڵەكـانی خـۆت –تەنـانەت ئەگەر كەسـێک ڕاستیشـی نەكردبنەوە– ئەوا دەكرێت یارمەتیدەر بن، بۆ ئەوەی قەنـاعەت بە كەسێک بكەن بیركردنەوە و ڕەفتاری خـۆی بگۆڕێت. بەم دواییـانە، ئەمە پوختەكراوە، لەلایەن ***كلارینس زێرموسن***ی تیمۆنییەم، مـاری لانـدا، كاتێـک دركـی كـرد، كە كـوڕە پـازدە سـاڵانەكەی فێـری جگەرەكێشان بووە.

بەڕێـز ***زێرموسـن*** بـۆی گێڕاییەنەوە: "بەسروشـتی، نەم دەویسـت ***دەیـڤـ***ـی كـوڕم جـگەرە بكێشـێت، بەڵام مـن و دایكـی خۆمـان جگەرەكێش بووین، ئێمە هەمـوو كاتێـک نمـوونەیەكی خراپمـان بۆ ئەو بەرجەستە كردووە. بۆ ***دەیڤ***ـم ڕوون كردەوە، كە چـۆن فێری جگەرەكێشـان بـووم، چـۆن ئـاڵوودەی نیكـۆتین بـووم و، ئێسـتایش دەستبەرداربوون لە جگەرە شتێكی مەحاڵە. ئەوەیشـم بیرخسـتەوە، كە چۆن كۆكەكەم بێزارم دەكات.

"كوڕەكەم هـاننەدا، بۆ ئەوەی واز لە جگەرەكێشـان بهێنێت یـاخود هەڕەشـەی لـێ بـكەم یـان لە مەترسـییەكانی جـگەرە ئاگـاداری بـكەمەوە، بەڵكـو ئەوەی بەیـانم كـرد ئەوە بـوو، كە چـۆن مـن ئاڵوودەی جگەرەكێشان بووم و چ مانایەک لای من دەگەیێنێت."

"ئیـدی كـوڕەكەم، بۆ مـاوەیەک بیـری لێـی كـردەوە و بڕیاریـدا، كە جـگەرە نەكێشـێت هەتـا قۆنـاغی ئامـادەیی تەواو نەكـات. بە تێپەڕبـوونی سـاڵەكان ***دەیڤـد*** هەرگیـز دەسـتی بە جگەرەكێشـان نەكردەوە و هەر حەز و مەیلی لێی نەبوو."

"لە ئەنجـامی ئەو گفتوگـۆیەدا، خۆشـم بڕیارمـدا، كە دەسـتبەردای جگەرەكێشـان بم، بە هێز و پشتگیری خێزانەكەمەوە توانیم، تێیدا سەركەوتوو بم."

ڕابەری باش پەیڕەوی ئەم بنەمایە دەکات:

**"بەر لەوەی ڕەخنە لە کەسی بەرانبەر بگریت،**

**دەربارەی هەڵەکانی خۆت بدوێ."**

## ڕێگای سێیەم

## هیچ کەسێک، حەز ناکات فەرمانی بەسەردا بکرێت.

ئێوارەیەکیان، شەرەفی ئەوەم پێ درا، بۆ ئەوەی لەگەڵ خاتوو ***ئیدا تاربێل*** ڕێبەری ژیاننامەنووسی نووسەر ئەمریکییەکاندا ئێوارە خوانێک بخۆم. کاتێک پێم گوت، کە وا من ئەم کتێبە دەنووسم، دەستی بە قسەکردن کرد، دەربارەی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، پێی گوتم، کاتێک سەرقاڵی نووسینی ژیاننامەی ***ئۆوێن دی یەنگ*** بوو، چاوپێکەوتنی لەگەڵ پیاوێکدا کرد، کە بۆ ماوەی سێ ساڵ لەگەڵ بەڕێز ***یەنگ***دا لە هەمان نووسینگەدا بەیەکەوە بوون. پیاوەکە ئەوەی گوت، لەماوەی تەواوی ئەو کاتەی کە لەگەڵ ***ئۆوێن دی یەنگ***دا بووە، هیچ کاتێک فرمانێکی ڕاستەخۆی بەسەردا نەکراوە. هەمیشە پێشنیاری کردووە و، فرمانی دەرنەکردووە. بۆ نموونە ***ئۆوێن دی یەنگ*** هەرگیز نەیگوتووە: "ئەمە و ئەوە بکە،" یان "ئەمە و ئەوە مەکە،" بەڵکو دەیگوت: "دەتوانیت ئەمە بکەیت،" یاخود "ئایا پێت وایە ئەمە کار دەکات و باش دەبێت؟"

هەردەم لەدوای نووسینی نامە، دەیگوت: "ئەمەت پێ چۆنە؟" کاتێک بەسەر نامەی یەکێک لە هاوکارەکانیدا دەچوویەوە، دەیگووت: "دەشێت ئەگەر بەم شێوەیە دایبڕێژینەوە، باشتر بێت" هەمیشە ئەو دەرفەتەی بە خەڵک داوە، بۆ ئەوەی خۆیان شتەکان ڕابپەڕێنن، ڕێگەی پێ دەدان خۆیان کارەکان بکەن، لێیان دەگەڕا خۆیان لە هەڵەکانی خۆیانەوە فێر بن.

پەیڕەوکردنی تەکنیکێکی لەم شێوەیە، بۆ ئەوەی کەسەکان هەڵەکانی خۆیان ڕاست بکەنەوە، شتێکی لەم شێویە، شکۆی کەسێک دەپارێزێت

و وای لێ دەکات هەست بە گرنگی بکات، گیانی هاوکاری فەراهەم دەهێنێت، وەکوو لە دروستکردنی هەستی یاخیبوون.

ئەو بێـزارییەی، کە لە ئەمرێکـی نەگریسـەوە سـەرچاوە دەگرێـت، زەمەنێـک دەخایەنیـت تەنـانەت ئەگەر ئەو فرمـانە لەپێنـاو ڕاستکردنەوەی، دۆخێکی زۆر خراپ و نالەباریشدا بێت.

*دان سـانتارێلی* مامۆسـتا لە قوتابخـانەی پیشـەیی، لە ویۆمینـگ، پێنسـیلڤانیان، بـۆ قوتابییەکـانی منـی گێـڕایەوە، کە چـۆن یەکێـک لە قوتابییەکانی ڕێگای یەکێک، لە چوونەژوورەوەی قوتابخـانەی گرتبوو، بەوەی کە بە شێوەیەکی نایاسایی ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرتبوو. یەکێک لە مامۆسـتاکانی دیـکە، خـۆی بە پـۆلەکەدا کـردوو و، بە ئـاوازێکی لـووتبەرزییەوە پرسـی: "ئەوە ئۆتـۆمبێلی کێـیە، ڕێگـاکەی گرتـووە؟" کاتێـک خـاوەنی ئۆتـۆمبێلەکە وەڵامـی دایەوە، مامۆسـتاکە هـاواری بەسەردا کرد: "ئەو ئۆتۆمبێلە لا بە، هەر ئێستا برۆ لای بە، ئەگەر نا، زنجیری تێ دەکەم و لەوێ لای دەدەم."

بەڵـێ ئەو قوتـابییە هەڵەی کردبـوو، نەدەبـووایە ئۆتـۆمبێلەکەی لەوێ ڕاگرتبـا، بەڵام لەو ڕۆژەوە، نەک هەر ئەو قوتـابییە قینـی لە دڵ گـرت، بەرانـبەر بە ڕفتـاری ئەو مامۆسـتایە، بەڵکـو تەواوی قوتابییەکـانی پۆلەکە وا بوون و ئەو پەڕی هەوڵی خۆیان دەدا، بۆ ئەوەی کۆسـپ و تەگەرە بـخەنە سـەر ڕێـڕەی ئەو مامۆسـتایە و کـارەکەی نـاخۆش و بێلەزەت بکەن.

ئەی دەبـووایە، چـۆن و بە چ شـێوەیەکی جیـاوازتر، ڕێـی لەگەڵ ئەو کەشـەدا کردبـایە؟ ئەگەر بە شێوەیەکی دۆستانە داوای کردبـایە، "کێ ئۆتـۆمبێلەکەی لەوێ ڕاگرتـووە؟" پاشـان پێشـنیاری ئەوەی بکـردایە، ئـاخۆ دەتوانێت لەوێـی لای دات، چـونکە ئۆتۆمبێلەکـانی دیـکە دێـن و دەڕۆن، ئەوا ئەو قوتـــابییە بە خۆشـــحاڵییەوە دەڕۆیشـــت و

ئۆتـــۆمبێلەکەی لەوێ لا دەبـــرد، نە خـــۆی و نە هاوپۆلەکانیشـــی لە مامۆستاکە بێزار و نیگەران و قین لە دڵ نەدەبوون.

پرسیارکردن، نەک هەر فرمانەکان خۆشتر و ئاسانتر دەکات، بەڵکو کار دەکاتە سەر کاردانەوەی وەڵامی ئەو کەسەی کە تۆ پرسیارەکەی ئاراستە دەکەیت، خەڵک زیاتر حەز دەکەن فرمانێک قبوڵ بکەن، ئەگەر بەشێک بن لە بڕیارەکە کە فرمان دەکرێت بۆ تیمار کردنی کێشەیەک.

کاتێک *ئان ماکدۆناڵدی* جۆهانسبێرگ، باشووری ئەفریقا، بەڕێوەبەری گشـتی کـارگەیەکی بچـووک لە دروسـتکردنی بەشـەکانی ئـامێردا، دەرفەتـی بـۆ ڕێـک کەوت، بـۆ ئەوەی فەرمـانێکی گەورە قبـوڵ بکـات، هـاتە ئەو قەنـاعەتەی کە نایەوێـت چـاوەڕێی ئەو ڕێـکەوتە بکـات، کە شتەکانی تێیدا دەکەن. خۆی پێشتر کارەکە لە دوکانەکەدا نەخشەی بۆ دانرابـوو و، تەنیـا کـاتێکی کەمـی مـابوو بەڵام ئەم فرمـانە شـتەکانی مەحاڵ کرد، بۆ ئەوەی قبوڵی بکات.

لە جیاتی ئەوەی خەڵکەکەی ناچار بکات، بـۆ ئەوەی پەلەپەل بکەن لە کارەکەیانـدا و، فرمـانەکە جـێبەجـێ بـکەن، هەمـوو خەڵـکەکەی کـۆ کـردەوە و دۆخەکەی بـۆ ئەوان ڕوون کـردەوە، کە ئەمە مانـای چـی دەگەیەنێت، ئەگەر بتوانن شتێک بکەن ئەو فرمـانە ڕێـی تـێ بچێت، بۆ ئەوەی لە کـــاتی خۆیـــدا دەربکرێـــت، لەدوای ئەمە دەســـتی بە پرسـیارکردن کـرد: "ئایـا هـیچ شـتێک بـوونی هەیە، بۆ ئەوەی بتوانین لەگەڵ ئەم فرمانەدا ڕێ بکەین؟"

"ئایا هیچ کەسێک دەتوانێت بیر لە ڕێگای جیـاواز بکـاتەوە، بـۆ ئەوەی شتێک بکەین کە ئەگەری جێبەجێکردنی ئەو فرمانە، بوونی هەبێت؟"

"ئایا کەسێک بوونی هەیە، کاتەکان ڕێک بخات یاخود دەکرێت ئەرکی خودی کاریگەری هەبێت و یارمەتیدەر بێت؟"

کارمەندەکان، بە چەندین بیرۆکەی جیاوازەوە هاتن و پێداگریان کرد کە ئەو فرمانە بگرێتە ئەستۆ، و گوتیان کە "ئێمە دەتوانین ئەوە بکەین." بەمەیش فرمانەکە قبوڵ کرا و شتەکە دروستکرا و لە کاتی خۆیدا گەیشت.

ڕابەری کارامە پەیڕەوی ئەمە دەکات...

**"لە جیاتی دەکردنی فرمانی ڕاستەوخۆ،**

**پرسیارێک بکە."**

## ڕێگای چوارەم

## لێی گەڕێ، شکۆی خۆی بپارێزێت

چەند ساڵێک لەمەوبەر، لە کۆمپانیای گشتی کارەبا، بڕیارێک دەرچوو، بۆ ئەوەی ***چارلز ستینمێتز***، وەکوو بەڕێوەبەری کۆمپانیا لا بدرێت. **ستینمێتز**، کەسێکی بلیمەت بوو لە کارەبادا، بەڵام لە بەڕێوەبەرایەتی ئەو بەشەدا کەسێکی کەوتوو بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا، کۆمپانیا خیرەتی نەبوو بیخاتە ژێرباری فشارەوە، چونکە کەسێکی زۆر پێویست و هەستیار بوو. لەبەر ئەوە نازناوێکی دیکەیان پێدا، کردیان بە ئەندازیاری ڕاوێژکاری کۆمپانیای گشتی کارەبا –نازناوێک بۆ کارێک کە پێشتر دەیکرد– لە کاتێکدا پۆستە ئیدارییەکەیان لێ سەندەوە و دایان بە کەسێکی دیکە.

**ستینمێتز** دڵخۆش بوو.

بەرپرسەکانی دیکەی کۆمپانیاکەیش، بەمە زۆر دڵخۆش و شادمان بوون، چونکە پێشتر دەربارەی ئەم کەسە هەستیار دوابوون –بەبێ ئەوەی هیچ زریانێک بکەن، توانیان ئەو ئامانجەی خۆیان بپێکن– لەبەر ئەوەی ڕێگەیان بە **ستینمێتز**دا، بۆ ئەوەی شکۆی خۆی بپارێزێت.

ڕێگەدان، بە کەسێک بۆ ئەوەی شکۆی خۆی بپارێزێت! ئەم ڕستەیە چەندێک گرنگە، هەر زۆر گرنگە! کەسانێکی زۆر کەم لە ئێمە، لەم ڕستەیەدا ڕا دەمێنن و بیری لێ دەکەنەوە! ئێمە زۆر بە توندی هەستی بەرانبەرەکانمان بریندار دەکەین، بەڕێرەوی خۆماندا ڕێ دەکەین، بۆ ئەوەی هەڵەکانی خەڵکی دیکە بدۆزینەوە، هەڕەشە بکەین و ڕەخنە لە منداڵێک یاخود کارمەندێک دەگرین، لەبەردەم ئەوانی دیکە. هەر بەبێ ئەوەی سەیری ئەو ئازارە بکەین، کە بەر دڵ و

هەستی کەسی بەرانبەر دەکەوێت. لە کاتێکدا خولەکێک بیرکردنەوە، وشەیەک یا دوو وشەی جوان، تێگەیشتنێکی بلیمەتانە لە بیرکردنەوە و دیدگەی کەسی بەرانبەر، دەکرێت ببێتە مایەی کەمکردنەوەی ئازار و ناڕەحەتییەکانیان!

با ئەمەمان لەبیر بێت، لە کاتی لابردنی کارمەندێک یاخود خزمەتگوزارێک، "لابردنی کارمەندێک، ئەوەندە جێگەی خۆشحاڵی و شادی نییە، ئەگەر تۆش وا بیت، هەر جێگەی خۆشحاڵی نییە." "ئەمەی خوارەوە وتەیەکە لە نامەیەکدا، کە لە لایەن مارشاڵ ***ئەی. گرانجەر*** نووسراوە کە ژمێریارێکی بەناوبانگە،" "زۆربەی کات کاری ئێمە وەرزانەیە، بەمەیش دەبێت زۆربەی کرێکارەکانمان دەربکەین، کاتێ ڕێژەی باج بەرز دەبێتەوە."

"بەم شێوەیە خەڵکمان لە کارەکە دوور دەخستەوە، بەڕێز ***سمس***، دانیشە، ئەم وەرزەیش کۆتایی پێهات، پێ ناچێت هیچ کارێکمان مابێت، بۆ ئەوەی بۆمان ڕاپەڕێنیت، بە دڵنیاییەوە، خۆشت دەزانی کە تەنیا لە وەرزی کارکرندا، کار لێرە دەکەیت، بەهەرحاڵ..."

"ئەو کاریگەرییەی، کە کار دەکاتە سەر ئەو کەسانە، جۆرێک لە نائومێدیی و هەست بریندا‌ربوون و ئاست دابەزاندنی لێ دەکەوێتەوە، زۆرێک لە ئەوانە هەوڵی بژێوی ژیان خۆیان دەدەن، لەبەر ئەوە هیچ جۆرە خۆشەویستییەکیان نامێنێت، بۆ ئەو کۆمپانیاییەی کە لێی دەردەکرێن."

"بەم دواییانە، بڕیارمدا کە بە جۆرێکی دیکە و تاکتیکی دیکە مامەڵە لەگەڵ ئەو کارمەندانەدا بکەم، کە هێشتا لەلای ئێمە کاریان دەکرد، لەبەر ئەوە لەدوای بیرکردنەوەیەکی ورده و درشت بانگی هەر یەکێکیانم دەکرد لەدوای ئەوەی سەرنجی ئەوکارەم دابوو، لە کە وەرزی زستاندا کردبووی. شتێکی لەم شێوەیەم دەگوت: "بەڕێز ***سمس***، تۆ کارێکی ناوازەت کردووە، ئەمجارەیان ئێمە، تۆمان ناردە

نیو یۆرک، ئەرکێکی سەختترت خرایە سەر ئەستۆ، کە چی تۆ بە جوانی کارەکانی خۆت ڕاپەڕاند، دەمانەوێت بزانیت، کە ئەم کۆمپانیایە شانازی بە تۆوە دەکات، خۆت تێدەگەیت تۆ دوور دەکەویەوە و لە هەر کوێیەک کار دەکەیت، ئەوا ئەم کۆمپانیایە، باوەڕی بە تۆ هەیە و ناشمانەوێت تۆ ئەمە لەبیر بکەیت!"

"ئێ کاریگەری ئەمە چی بوو؟ ئەو فەرمانبەرانەی کە کۆمپانیایان بەجێ دەهێشت، زیاتر هەستیان بە باشی دەکرد، وەکوو لەوەی کە دەرکرابن، هەستیان بەوە نەدەکرد کە لەکەدار کرابن، دەیانزانی ئەگەر ئێمە کارمان بۆ ئەوان هەبووایە، ئەوا لێیان نەدەگەڕاین، کە بڕۆن و بەجێمان بهێڵن. کاتێک دووبارە پێویستمان، بە ئەوان بووایە، ئەوا بە هەستێکی پڕ لە دڵسۆزیی و گەرم گوڕییەوە دەهاتن."

لە بەشێکی خولەکەی ئێمەدا، دوو قوتابی پۆلەکەمان بابەتەکانی کاریگەری دۆزینەوەی هەڵە و خاڵە ئەرێنییەکانی ڕێگەدان، با شکۆی بپارێزێت تاووتوێ دەکرد.

***فرێد کلارک***ی هاریسبێرگ، پێنسیلڤانیان، ڕووداوێکی گێڕایەوە، کە لە کۆمپانیاکەی ئەواندا ڕووی دابوو: "لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانماندا دەربارەی بەرهەم، سەرۆک پرسیارێکی ئاڕاستەی سەرپەرشتیاری بەرهەم کرد، دەربارەی پرۆسەی بەرهەمهێنان. لە ئاوازی دەنگییدا هەستیکی تورەیی هەبوو و ئاماژەی بە نواندنێکی هەڵە دەکرد، لە بەشێکی کارەکانی سەرپەرشتیارەکە. نەی دەویست لەبەردەم هاوپیشەکانی هەست بەشەرمەزاری بکات، لەبەر ئەوە جۆرێک لە بەهانە لە وەڵامەکەیدا بەدی دەکرا، ئەمەیش هەر وای لە سەرۆک کرد، کە بە تەواوەتی کۆنترۆڵی تورەیی لەدەست بدات، سەرپەرشتیارەکەی شکاند، سەرزەنشتی کرد و بە کەسێکی درۆزنی هەژمار کرد.

"هەر پەیوەندییەکی کارکردن، کە بەر لە ڕوودانی ئەمەدا هەبووبێت، ئیدی تێکشا لە چەند چرکەیەکی کەمدا، ئەم سەرپەرشتیارە، کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی کرێکارێکی باش بوو، لەو کاتەوە هیچ کەڵک و سوودێکی بۆ کۆمپانیاکەی ئێمە نەما، لەدوای چەند مانگێکی کەم لای ئێمەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت، بۆ ئەوەی کار بۆ ڕکابەرەکەی ئێمە بکات، کە دڵنیام لە وێ کارێکی ناوازە و باش دەکات.""

قوتابییەکی دیکەی پۆلەکە، *ئانا مازۆنی*، باسی ئەوەی کرد، کە چۆن ڕووداوێکـــی لەو شـــێوەی لە کـــارەکەی ئەودا ڕووی داوە، بەڵام جیاوازی و ئەنجامەکەی چی بوو! خاتوو *مازۆنی*، کە لە بازارکردندا تایبەت بوو، بە پێچانەوەی خواردن، یەکەمین ئەرکی سەرەکی پێدرا، پشکنینی هەندێک بەرهەم، بە قوتابییەکانی گوت: "کاتێک ئەنجامی پشکینەکانم بۆ دەرکەوت، هەر وێران بووم. لە پلانەکەی خۆمدا، هەڵەیەکی گەورەم کردبوو. دەبووایە تەواوی پشکنینەکە دووبارە بکرێتەوە، بۆ ئەوەی ئەمەیش خراپتر بێت، هیچ کاتێکم نەبوو بۆ ئەوەی لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەم تاووتوێی بکەم، بەر لە کۆبوونەوە کە دەبووایە ڕاپۆرتێک لەسەر ئەو پرۆژەیە بنووسم.

"کاتێک بانگیان کردم، بۆ ئەوەی ڕاپۆرتەکەیان پێ بدەم، لە ترساندا دەلەرزیم، هەر خەریک بوو تێک بچم، بەڵام هەوڵم دا نەگریم، هەموو ئەو پیاوانە قسە لەسەر من دەکەن کە ئافرەتێک نەیتوانییوە ئەرکێک جێبەجێ بکات، چونکە ئافرەتان زۆر عاتیفین. بە کورتی، ڕاپۆرتەکەم ئامادە کردوو و، گوتم بە هۆی هەڵەیەکەوە توێژینەوەکە تەواو دەکەم بەر لە کۆبونەوەی داهاتوو، ئیدی دانیشتم و چاوەڕێی توڕەبوونی بەڕێوەبەرەکەمم دەکرد.

"لە جیـــاتی توڕەبـــوون، سوپاســـی کـــردم، بەوەی کە کـــارەکەم ڕاپەڕاندووە و پێی گوتم کە ئەوە کارێکی نا ئاسایی نییە بۆ کەسێک، بـۆ ئەوەی هەڵەیەکـی لەم شـێوەیە بکـات، لە پرۆژەیەکـی نوێـدا و،

باوەڕی بە خۆیی هەبوو، کە توێژینەوەی داهاتوو شتێکی باش و مانادار دەبێت، بۆ کۆمپانیاکە. دڵنیای کردمەوە، لەبەردەم هاوپیشەکانمدا، کە بڕوای بە توانای من هەیە و زانی کە من باشترین هەوڵی خۆمم داوە. ئەو هەڵەیە لەبەر هۆی نەبوونی ئەزموونی تەواو بووە نەک لەبەر توانای کارکردنم.""

"بەسەر بەرزی کۆبوونەوەکەم بەجێ هێشت و، بەو بڕوایەی کە هەرگیز دووبارە ڕێگە بەوە نادەمەوە، سەری بەڕێوەبەرەکەم شۆڕ بکەم."

تەنانەت ئەگەر ئێمە ڕاست و دروست بین، لەسەر ڕێڕەوی دروست گوزەر بکەین و تەواوی خەڵکی دیکە هەڵە بکەن، ئەوا تەنیا خۆپەسندی خۆمان تێک دەشکێنن، بەوەی کە خەڵکی دیکە شەرمەزار بکەین. ڕابەری فڕۆکەی سەربازی فەرەنسی ئەفسانەیی و نووسەر ***ئانتۆنی دی سەینت ئێزوپێری*** دەڵێت: "هیچ مافێکم نییە، بۆ ئەوەی شتێک بڵێم و بیکەم، کە ببێتە هۆی لەکەداربوونی مرۆڤ، ئەوەی گرنگە ئەوە نییە، کە من چۆن بیری لێ دەکەمەوە، بەڵکو ئەوە گرنگە، کە ئەو چۆن بیر لە خۆی دەکاتەوە. ئازاردانی مرۆڤ بەوەی، کە لە شکۆ و شان و باڵی بدەی خۆی لە خۆیدا تاوانە."

ڕابەری ڕاستەقینە هەردەم دەڵێت...

**"لێی گەڕێ،**

**با شکۆی خۆی بپارێزێت."**

ئایا هەرگیز تا ئێستا بیرت لەوە کردووەتەوە کە ئێمە زۆربەی کاتمان لە کارکردندا بەسەر دەبەین، جا ئەو کارە هەر چییەک بێت؟ ئەمەیش بە مانای ئەوە دێت کە دید و تێڕوانینی ئێمە بۆ کارەکەمان ئەوەمان بۆ دیاری دەکات کە ئاخۆ ڕۆژەکانی کارکردنمان پڕ بوون لە خۆشی و شادی، یان بە پێچەوانەوە هەست بە بێئومێدی، بێزاری و هیلاکی دەکەین.

ڕاهێنانەکانی دەیل کارنگی بە جۆرێک بەرنامەڕێژ کراون کە یارمەتیت دەدەن بۆ ئەوەی زۆرترین سوود لە ڕۆژانی کارکردنت ببینیت، بەوەی کە بە درێژاییی ڕۆژ تۆی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە.

ئەم کتێبە لەبەر گرنگیی بابەتەکانی بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان وەرگێڕدراوە. بۆ یەکەم جارە بە زمانی شیرینی کوردی بڵاو دەبێتەوە. بێگومانم کە سودی بۆتان دەبێت.

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

1 571818 180004